گۆڤارێکی فکری سەربەخۆیە

## دەستەی نووسەران

سەروەر ئەحمەد

ڕامیار مەحمود

شوان ئەحمەد

× هەر نووسینەو گوزارشت لە بیروڕای خاوەنەکەی دەکات...

× ئەو مادانەی بڵاو ناکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

(گوتار)

ژمارە (٢) / ساڵی یەکەم / هاوینی ١٩٩٧

## بابەتەکانی ئەم ژمارەیە:-

هەڵوێستێک — گوتار

## تەوەرەی یەکەم/ قەیرانی ناسنامە



## تەوەرەی دووەم/ ئیسلام لە فکری هاوچەرخدا



## تەوەرەی سێیەم/ لاپەڕە فەلسەفیەکان

# هەڵوێستێک

لە کاتێکا ئێمە دەمانەوێت کێشەیەکی وەک (ناسنامە) بەهەموو رەهەندە جیاوازەکانیەوە بکەینە بابەتی قسە کردن.. کەچی شەڕ لەوپەڕی ناشرینیدا دێتو دەچێ.. شەڕێک لەنێوان هێزە تەقلیدیو سەلەفییەکاندا، شەڕێک تەنها جوانیو خەونو گۆرانییەکانی ئێمەی تیادا ئەدۆڕێ، شەڕێک کە لە ئێستادا خەریکە بەرەو فەنابوونێکی جەسەدی تەواومان دەبات شەڕێک کە هێندەی تر هێز دەکاتەوە بەر سەلەفییەت، چونکە لەناو گەمەی ئەو تراژیدیایەدا تەنها عەقڵ دەبێت بەژێر لاشەی خوێنەوەو پێی دەڵێن دۆڕاو! بێگومان کەشەڕیش تۆخ بۆوە.. ئیدی سەری کۆڵانەکان بەمردن ئەگیرێو دەرگاش لەسەر غەریزەکان قوفڵ دەدرێ. ئەوکات عەرافەکان بەئەندێشەی تازەوە دێنەوەو سیاسەت مەدارەکانیش پڕوپاگەندەی نیازەکانیان بۆ دەکەن، چەندێکمان ڕێ ماوە بۆ خەون؟ ئێمە نامانەوێت هاوارەکانمان کپو بێدەنگ بکرێت لەژێر ناوی دنیایەک دەمامکی جیاوازدا.. چونکە لەمێژە دەزانین هەموو وێستگەکانی ئامانو دڵنیایی زادەی نیگەرانیو قەهرەکانی خۆمانن. بێمانایی ئەم شەڕەش دەمانگێڕێنێتەوە بۆ پووچی بونیادێک.. کاری ئێمەش جارێک گێڕانەوەی ئەم شەڕەیە بەهەموو لایەنەکانیەوە بۆناو بونیادو لەوێشەوە مەحکەمەی ئەو بونیادە دەکەین.. جارێکیش ئەو بونیادە پەلکێش ئەکەین بۆ ناو قەیرانەکانی ئێستامانو لەژێر ئەشتەرگەری تیۆرو رافەو ئەتروحە نوێکاندا دای ئەنێین. بۆیە گوتار هەوڵ دەدات بەهاوجووتکردنی نووسینو وەرگێڕان، لانی کەم کۆمەڵێک برین بەربدا، ئەو برینانەی بەتێکە سەلەفیو ئاکارە تەقلیدییەکان ماکیاج کراوە. مەبەستی گوتار لە وەرگێڕان لانی کەم ملکەچ پێکردنی زمانی کوردییە بۆ لۆژیکو زمانی فکر.. سەرباری نییەتی دامەزراندنی هۆشیاری لای وەرگر (متلقی). ئێمە گەر خاوەنی هەر خەونێک بین ئەوا بێگومان لەناو ڕووبەری گوتاردا پیادەی دەکەین، گرنگیش نییە کێ پێی بریندار دەبێت، وەچەندێکیش نائارامی لەشەڕەوە دروست بێت، ئەوەندەش خەون لە ئێمەدا زیاد دەکات، هاواری گوتار ئامانجێکی دیاریکراوو دروشمی ئەفسانەیی نییە بەڵکە گوتار هەڵگری پەیامی خۆیەتیو دنیایەک خەونی گەورەی لەخۆیدا هەڵگرتووە، بۆیە کۆمەکی ئێوەش برەو بەو خەونە دەدات بەڵام ئێمە تەنها سوپاسێکمان هەیەو بەس. لە کۆتاییدا ئەڵێین: پێویستە بەچاوی سۆزەوە سەیری دنیا نەکەین. پێویستە دڵی شتە حەرام کراوەکان ئاشت کەینەوەو ماڵێک لەو دیو ترسەوە بۆ خۆمان دروست بکەین. چونکە هیچ کاتێک ناتوانین وەختی مردن دواخەین بۆ ڕۆژێکی تر. لەکاتێکا کێشمەکێشو ململانێکان ئێستا زۆر گەورەترن لەدوێنێ، کەچی هێشتا ئێمە بەئازادی دەڵێین فەسادی.. دواجار دەڵێین: گوتار- ئامانجێکی نییە بەیانی کاتو لە توانایدا دەبێت گوتار- وەک خەونێک بەدوای ئاسۆیەکی قوڵو شاراوەدا دەگەڕێت، بۆیە بەهیوایین هیچ نەبێت چەند پرسیارێک لەناو گوتارەوە بەرەڵا بکەین..

**کوردستان- سلێمانی**
**١٩٩٧-٩-٥**
**گەتا،**

# جیهانگیری و شوناس

رامیار مه‌حمود

چاپه‌ری دووه‌م (کۆتایی)

[ئه‌م کۆلانه ماڵه‌که‌مانی خۆش ناوی]

ئاراس عبد الکریم

(تا له‌م نووسینه ئه‌بمه‌وه بریارم داوه ئه‌م دێره شیعره له یادکه‌م.. چونکه ناچاره‌م ئه‌کات به قه‌ناعه‌تێکی زاتیه‌وه بنووسم.. چونکه من ئه‌م شیعره‌م خۆشتر ئه‌وێت له قه‌ناعه‌تی نووسین.. چونکه قه‌ناعه‌تی نووسین ملکه‌چی مه‌نتق و روانینی بابه‌تیانه‌یه.. ئه‌م شیعره‌ش به‌رده‌وام ئه‌مباته‌وه سه‌ر ئه‌و حه‌قیقه‌ته‌ی ئێمه کوڕی میلله‌تێکین به‌رده‌وام نه‌فره‌ت له شوناسمان کراوه. حه‌ق وایه تاراده‌ی ره‌گه‌ز په‌رستی باوه‌ش به شوناس دا بکه‌ین مادام شوناسێک له‌ شه‌ڕی دانپیانان دا (اعتراف)، به‌رده‌وام خوێنی لێ ئه‌تکێ... ئاخر ئه‌م کۆلانه ماڵه‌که‌مانی خۆش ناوێ و من ئه‌م دڵره‌قییه له کوێ بێنم بۆ نووسینێکی بابه‌تییانه].

سه‌ره‌تا

سه‌ره‌تا به گرنگی ئه‌زانم بۆ ئه‌وه‌ی پایه‌گایه‌کی ره‌خنه‌یی بوی نووسینه‌که‌م دابڕێژم به پێچه‌وانه یان راستتر بڵێین دژی گوتاری رۆشنبیری گه‌رایی کار بکه‌م که جه‌خت له‌سه‌ر جه‌نگی شوناس ده‌کات وه‌ک جه‌وهه‌ری ناسین. وه‌ک ئه‌وه‌ی سروشتی رۆشنبیری جه‌وهه‌ری کۆمه‌ڵگاییک پێک بێنێت.. ره‌نگه ئه‌گه‌ر به شێوه‌یه‌کی ساده تر بمانه‌وێت قسه بکه‌ین مه‌به‌ستمان له‌وه‌یه به گوێره‌ی مه‌نتقی گوتاری رۆشنبیری گه‌رایی ئه‌بێت ژیاری خۆرئاوا ژیارییه‌کی مه‌سیحی بێت و ژیاری کوردی ژیارییه‌کی ئیسلامی بێت... له‌سه‌ر ئه‌م بنه‌مایه‌ش سروشتی رۆشنبیری ئه‌بێته جه‌وهه‌ری پێکهاته‌ی کۆمه‌ڵایه‌تی نه‌ک وه‌ک ره‌هه‌ندێک له ره‌هه‌نده‌کانی واقعی کۆمه‌ڵگا... دواتر سروشتی رۆشنبیری ده‌ستنیشانی سیسته‌می کۆمه‌ڵایه‌تیش ئه‌کات.. یان به مانایه‌کی تیکه دیاریکردنی (ژیاری) به‌کسان بکرێت به دیاریکردنی رۆشنبیری.ئه‌و دروشمه‌ی که ئه‌مڕۆ رۆژهه‌ڵاتی ئیسلامی گرتۆته‌وه به‌ناوی (چاره‌سه‌ری ئیسلامی)ییه‌وه شێوه‌یه‌کی به‌رچاوی گه‌رانه به‌دوای شوناس دا و به‌ڵگه‌شه بۆ تێکشکانی ئه‌م کۆمه‌ڵگایانه له‌به‌رده‌م به‌دیهێنانی خه‌ونی مۆدێرنیزه‌کردن له‌سه‌ر ئاستی سیاسی و کۆمه‌ڵایه‌تی رۆشنبیری واته ئه‌م کارد

شکستی خەونی تێپەڕاندنی واقعی تەقلیدییە.. چونکە هەموو ئەو ئایدۆلۆژیا هاوچەرخە مەحەلییانەی جیهان- سێ بە هەموو ڕەوتەکانییەوە بەڵێنی ڕزگارکەریان هەڵگرتبوو بەخەسلەتێکی ڕەهایی بە سەر کۆمەڵگا دا پیادەکران.. ئەوەی جێگای سەرنجە کۆی ئەم ئایدۆلۆژیانەیە لەژێر کاریگەری بەرکەوتنی ئەوروپادا بەرهەمهات و بۆیە ئێستا ناچارین پیاچوونەوەیەکی ڕەخنەیی بگرینە بەر بە مێژووی هاوچەرخ دا.. چونکە ئەبێت بەناچاریی بەشدارییەکی زیندوو و چالاکمان هەبێت لەو جیهانیگیرییەدا کە ئاستی ڕۆشنبیری و سیاسی و مێژووی گرتۆتەوە کە پشت تێکردنی پشتێکردنە لە جیهان و هەڵبژاردنی بەربەرییەتە.

## -قەیرانی شوناس-

لەسەر ئەو بنەمایەیی خەون لیبیدۆیەکی فەردی بێت و ئەفسانە لیبیدۆیەکی جەماعی بێت [بڕوانە ڕۆجیە باستید- السوسیولوجیا و التحلیل النفسي- ترجمة: وجیه البعیني- دار الحداثة- الطبعة الاولى- ١٩٨٨] ئەوا ڕاستەوخۆ ئەو پێناسەیە ئەبەینەسەر بارێکی سوسیۆلۆژی لە ڕێگای ئەم تێکستەوە کە ئەڵێت: [کەینوونەی کۆمەڵایەتی بەناچاری ئەبێت پشت بە ئەفسانە ببەستێت] (بڕوانە- تكوین الدولة- روبرت ا. ماكیڤر- ترجمة: الدكتور حسن صعب- دار العلم للملایین- بیروت) بۆ ئەوەی نوخێکی دروست برەخسێنین بۆ ئاراستەکردنی پرسیارێک لە کەینونەی کۆمەڵایەتی کوردی.. کە ئایا بوونی کۆمەڵایەتی کوردی هەڵگری چ جۆرە خەون و ئەفسانەیەکە و سروشتی خەون و ئەفسانەی کوردی تاچەند پشت ئەستوورە بە ڕەگ و ریشەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی لێرەدا لەهێڵی نووسینەکەم لائەدەم بۆ زیاتر تێگەیشتن ئاماژە بەخەون و ئەفسانەی ڕزگاربوونی نەتەوەیی کورد و ڕەتکردنەوەی داگیرکەر ئەدەم کە خەونێکە ئەنتلجنسیایی کورد لە حاجی قادری کۆییەوە تاشێرکۆ بێکەس بەشداری لە داڕشتنی دا ئەکەن و بۆتە پرۆژەی سیاسی باو لەناو ڕۆحی کۆمەڵایەتی کوردیدا و بەشێوەیەک دەسەڵاتی مەعنای (نەتەوە)، سەرچاوەیەکی ڕەمزیی و سەرعیەتی ئامادەبوونی حزبی کوردیشە، کە بەداخەوە (شەڕی ناوخۆ و ئەو خیانەتە هەرێمایەتییانەی ڕوویان دا [تورکیا- ئێران] بەتایبەتیش خیانەتی ٣١ی ئاب) سەرەتای گومانکردنی ئێمەیە لە ئامادە بوونی جدیانەی ئەو سەرمایە مەعنەیەی ناومان لێنا (ڕزگابوونی نەتەوە- ڕەتکردنەوەی داگیرکەر) چونکە ٣١ی ئاب کە ترۆپکی ئەتک کردنی ئەو سەرمایە مەعنەوییەیە ئەوە دەسەلمێنێت کە هیچ مەعنایەک نیە لەدەرەوەی دەسەڵاتی حزب کە بەرگر بێت لە

کوردیدا تێپەڕ ئەبێت.. ئەمە جگە لەوەی وەک لە چاپتەری یەکەم دا ئاماژەمان پێدا ئەوەش ئەسەلمێنێت کە بەڵگەی ئیلغاکردنەوەی دانپیانانە بە کۆمەڵگای مەدەنی کوردی لەلایەن کۆمەڵگای سیاسییەوە بە شێوەیەک حزبی کوردی لەو پێکهاتەیەی دەوڵەت ئەچێت کە (مارکس) ناوی نا (دەوڵەتی پۆناپارتی) کە ئەکرێت ئێمە بڵێین (حزبی پۆناپارتی) سەرباری ئەوەی دوو هۆکاری دیکەی ترسناکیش ئەسەلمێنێت کە دەسەڵاتی کوردی دەسەڵاتێکی ناعەقلانییە و لەسەر بنچینەی هێز دامەزراوە و سەرچاوەی مەشروعییەتی خۆشی لەسەر (هێز) بیناکردووە [ بوی زیاتر تێگەیشتن بۆ جیاکاری نێوان دەسەڵاتی عەقلانی و نا عەقلانی بگەڕێردوە سەر لێکدانەوەی ماکس ڤیبر بۆ شێوەکانی دەسەڵات.. یان سەرچاوەیەکی (فرۆم) بەناوی- الانسان بين المظهر و الجوهر- تأليف إريك فروم- ترجمة: سعد زهران- مراجعة وتقديم: لطفي عظيم- ": ١٩٨٩- الكويت- سلسلة عالم المعرفة- ص٥٧].

جگە لەوەش هۆکاری دووەم وەک فاکتەرێکی خەتەری تایبەت بە دەسەڵاتی کوردی وبنوونی بڕیارێکی جەماعییە لە کۆمەڵگای کوردیدا، لەژێر سایەی غیابی کۆمەڵگای مونەسەسات. بەهەر حاڵ ئەوەی رووی دا لە ٣١ی ئابدا ڕەنگە دواجار لێکدانەوەیەکی (ئەڵتۆسێر)مان بیر بهێنێتەوە لەسەر چەمکی ئیستبدادیەت... بەکورتی ئەو چەمکە روون ئەکەینەوە بۆ ئەوەی بە دروستی بمانەوێت لێکچوونی سروشتی ئیستبدادییەت و پێکهاتەی پارتی بسەلمێنین.. ئیستبدادییەت ئەو سیستەمە سیاسییەیە (ئەگەر وەک ئەڵتوسێر خۆی ئەڵێت دروست بێت وا دەری ببڕین) سیستەمێکی بێ بونیادە و مەرجێکی حقوقی و یاسایی نیە لەگەڵ ئەوەدا لە سیستەمی ئیستبدادییەت دا (ئایین) ئەڵتەرناتیڤی مەرجەعیەتی یاساییە بەڵام بەزمانی مۆنتسکیۆ (ئایین ترسێکی سەربارکراوە بۆ سەر ترس) واتە ئەگەر ئیستبدادییەت سەرچاوەیەکی ترس بێت ئەوا ئایین سەرچاوەیەکی دیکەی ترسە یان ترسێکی سەربارکراوە (خوف مضاف).. لێکچوونەکەش لەنێوان پارتی و ئیستبدادییەت دا لەوێوە دەست پێئەکات کە (ئیستبدادییەت مەرجەعیەتێکی یاسای و حقوقی نیە و بێ رابردووە و بێء ئایندەش بەڵکو سیستەمی ساتە [نظام اللحظة] (بڕوانە- مونتسکیو: السياسة و التاريخ- لوي التوسير- ترجمة: نادر ذكري- الطبعة الاولى: ١٩٨١- دار التنوير) بۆیە پارتی بەسیستەمی سات کاردەکات لە ٣١ی ئاب دا و ناکرێت سەرمان بسوڕمێت بڵێین ئەوەی روویداوە پێچەوانەی رابردووی تێکۆشانی پارتی و ئایندەی بزوتنەوەی کوردایەتییە.. بەڵێ ئەوەی حوکمی کرد سیستەمی سات بوو... پاشان ئەگەڕێینەوە سەر هەمان پرسیار کە پرسیاری پەیوەندی نێوان ئەفسانەی واقعی کوردی و ئەفسانەی کۆمەڵگای ئەوروپییە،
سەرەتا ئەوەش [illegible]

بەرامبەر چەرخی ناوەڕاستی مەسیحی ئەوا ڕینسانسی کوردی بە ئاگابوونی عەقلی کوردی نیە بەرامبەر بە چەرخی ئیسلامی ڕۆژهەلاتی.. ئەگەر بۆ زیاتر تێگەیشتن چەمکی (ئازادی) یاد بهێنینەوە.. کە چەمکێکی سەددەرسەد خۆرئاواییە لە پەیوەندی بە ڕۆشنبیرییەوە تەفسیری بکەین.. واتە ڕۆشنبیر و سەربەستی بەرلەوەی وەک پرسیارێکی سیاسی یان ئایدۆلۆژی بخوێنرێتەوە. پرسیارێکە لەسەر بنچینەی پرسیاری شوناس هاتۆتە ئاراوە لە ڕوانگەی بەرکەوتنی ژیاری کوردی بەدەردوە کە مەبەست لەدەرەوەی ئەورپییە. ئایدیای سەربەستی نەتەوە لای کورد سەربەستییە کۆمەلایەتییەکان وەک ئافرەت و پرسیاری (پێشکەوتن) و بانگەشەکردنی خوێندن وەک بەرەو پیرچوونی دەرگایەکی نوێی علمانی لە بنچینەدا پرسیارێکی خۆرئاوایی بووە و ئیلهام وەرگرتنە لە پێشکەوتنی ئەوروپییەوە... واتە وشیار کوردی بەرامبەر بە دواکەوتنی کورد لەسەر بنەمای وشیارییە بە پێشکەوتنی بەرامبەر.. [نمونەیەک لەشیعری کوردی:

بخوێنن چونکە خوێندن بوی دیفاعی تیغی دوژمنتان

هەموو ئان و زەمانێ عەینی قەلغان و سوپرتانە]

بە ڕۆشنبیری کردن لە ڕێی خۆرئاواوە لە فکرەوە بۆ سیاسەت لە ئەدەبەوە بۆ داهێنان و هونەر و شانۆ و ڕۆژنامە و سینەما و تەلەفزیۆن، هاوشێوە بوونی ئەیقۆنی (وێنەیی) کوردییە بە ئەوروپا.. بەلگەی بە جیهانی بوونی سیمۆلۆژیای ڕۆشنبیری خۆرئاوایە بۆیە دەلێین پەیوەندی ڕۆشنبیری کوردی بە ڕۆشنبیری ئەوروپییەوە پەیوەندییەکی وێنەیی یان ئەیقۆنییە پشت ئەستورین بەبوونی ئەو قەیرانەی ئەمڕۆ پوچگەرایی پرۆژەی نوێخوازی سیاسیو فەرهەنگی ئەسەلمێنێت.. ئێمە ئەمڕۆ پرسیاری خێل ئاراستەی سیستەمی حزبایەتی دەکەین و ئالییاتەکانی تەقلید لەپشت ڕوالەتەکانی نوێخوازییەوە دەخوێنینەوە. ئەم پرسیارانەش نیشانەی ڕازی نەبوونی فکری نوێی کوردییە (بەختیار عەلی- ڕێبین هەردی- مەریوان وریا قانع- سەروەر ئەحمەد و.... ) بەسروشتی واقعی کوردی و قولکردنەوەی وشیارییە بەواقع چونکە پرۆژەی گۆڕان پرۆژەی وشیارییە بە واقع و ڕەوتی ئەو وشیارییەش ڕەخنەگرتنە لەخود (الذات) لەسەر ئاستی سۆسیۆلۆژی و فەردی.. ڕەخنەگرتنیش لەخود پێویستییەکی هەمیشەیی‌یە. جگە لەوەی لە قۆناغی ئەمڕۆدا پێویستییەکی بەر لەهەموو پێویستییەکانە.

**جیهانگیری** (العولمة):

بۆ ئەوەی لە جیهانگیری تێبگەین ناچارین زیاتر رۆشنایی بخەینە سەر رێنسانس و رۆشنەگەری چونکە سەدەی رێنیسانس بنەمای زانستی سروشتی هاوچەرخی دامەزراند و سروشتی خستە ژێر خوێندنەوەیەکی ئەزموونی و مەنهەجییەوە بە شێوەیەکی رێک و پێک و ئەڵتۆ سێرگوتەنی لەبەرامبەر ستراتیژیترین دەزگای ئایدۆلۆژی چەرخی ناوەڕاست کە کەنیسەیە دەزگایەکی دیکەی ستراتیژی بۆ بەرهەمهێنان و بەگەڕ خستنی ئایدۆلۆژیا دامەزراند کە سیستەمی خوێندن (یان قوتابخانەیە).. کە لێرەوە پرۆژەی بەعلمانی کردنی کۆمەڵگاش بەئەنجام گەیاندراوە... ئیتر لێرەوە ئامانجی فکر لە سەدەی ناوەڕاستدا پاشەکشێی لێکرا کە گیری خواردبوو لە مانای ژیان و جیهان و لێکدانەوەی وەحی و دەسەڵاتەکانی کەنیسە.. بیریارەکانی رێنیسانس ئاراستەیەکی دنیاییان بە پرسیار بەخشی.. بۆیە ئەشێت گەورەیی رێنیسانس بەوە مەزەندە بکرێت کە قۆناغی وەچەرخانی پرسیارەکانی ئینسانە. ئەگەر سەرەتا لەبەردەمی مەکیاڤیللیدا بوەستین کە کورتترین و چڕترین دەربڕین بۆ تێگەیشتن لە فکری مەکیاڤیللی ئەوەیە کە (هەموو رێگایەک رەوایە بۆ گەیشتن بە ئامانج) ئەمەش ئەو مانایەیی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە کە ملکەچ پێکردنی دوو سیستەمی گرنگە ئەویش (ئایین- ئەخلاق) بۆ کردەگی ئینسان. ئەم مەسەلەیە بەڕۆشنی دیارە کە مەکیاڤیلی لە کتێبی (میر)دا پرسیار ئەکات (قەدەر چ رۆڵێکی هەیە لە ژیانی ئینسانیدا لە کاتێکا ئەگەر قەدەر ئەوە بێت لە دەرەوەی ئیرادەی ئینسان وەستاوە.. ئەوا مەکیاڤیلی قەدەری ئینسانی لە میتافیزیقا سەندەوەو دایەوە دەست ئینسان. بۆیە مەکیاڤیلی یە بەو پیاوە لەقەڵەم ئەدرێت سیاسەتی لەلاهوت و قەیدە ئەخلاقیەکانی خێر و شەڕ هێنایە دەرەوە.. لێرەوە یەکەم هەنگاو لە خۆرئاواوە دەستی پێکرد بۆ بەدنیایی کردنی سیاسەت.رێنیسانس جێگایەکی گەورەیی بەخشی بە ئازادی چونکە کاتێکدیموکراسیەت ون بێت وەک سیستەمێکی حوکمرانی کردن هەموو قسەکردنێکیش لەسەر ئازادی ون ئەبێ] ئەوەتا هیچ جۆرە دیالۆگێک و بیرێک نابینین لەسەر ئازادی سیاسی بە درێژایی سەدەی ناوەڕاست. بەڵکو بەمەسەلەیەکی دیکە جێگای گیراوەتەوە کە (ئازادی ئیرادەیە) کە گۆڕاوە بۆ شێوەیەکی لاهوتی کەچۆن گونجاندنێک بکرێت لەنێوان ئینسانێک کە ئازادی هەبێت لە ئیرادەدا و یەزدانێک کە ئیرادەیەکی ناکۆتای هەبێت.. گرفتی ئازادی لەسەدەی ناوەڕاستدا لە چوارچێوەیەکی لاهوتیدا گەمارۆ دراوەو نەترازاوە بۆ چاورچێوەیەکی سیاسی. بەڵام هاوکاتی رزگاربوون لەسەدەی ناوەڕاستی لاهوتی تەعەشاکردن بۆ مەسەلە سیاسییەکان و کۆمەڵایەتییەکان ئاراستەیەکی ئینسانی و ناناییبنی وەرگرت و ئازادی واتایەکی سیاسییانەی پێ بەخشرا و فەیلەسوفی ئینگلیزی تۆماس هۆبز Tomas Hobbes (١٥٨٨- ١٦٧٩) یەکەم کەس بوو کە دامەزاندنی

سیستەمێکی سیاسی جێگیری تاوتوێ کرد دوور لە ئاژاوە چونکە (هۆبز) لەماوەی شەڕی ناوخۆی نێوان پاشا و پەرلەمانی ئینگلیزیدا ژیا. ئەگەر چی هۆبز کەمتر بایەخی بە دیموکراسیەت داوە زیاتر بیرۆکەی پەیمانی کۆمەلایەتی دانا کەپاشتر ئەو بیرۆکەیە بووە بنچینەی جێگیری دیموکراسییەت چونکە لەگەڵ بیرۆکەی پەیمانی کۆمەلایەتی دا گرفتی ئازادی سیاسی وروژا. (هۆبز) بایەخێکی گرنگی بەم مەسەلەیەداوە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (لیڤیثان-Leviathan) داکۆکی لە ئازادی کرد بەو دانایەی ئینسانی ئازاد ئەو کەسەیە کە کۆسپ لەبەردەم کردەکییەکانیدا نیە.. لەڕاستیدا ئەوەی هۆبز بۆ چینی ناودراستی کرد مەکیاڤیلی بۆ (میر)ی کرد. دواتر جۆن لۆک [John Lock-١٦٣٢- ١٧٠٤] بایەخی بە ئازادی دا لەسەر بنچینەیەکی لیبرالی و ئازادی هەمیشە فالێکی سەرەکی بیری جۆن لۆک بووە و تێکڕای کتێبەکانی [ رسالة التسامح ١٦٨٩- رسالتان في حكومه ١٦٩٠- قيمة المال ١٦٩١ کە یەکەمیان لەسەر ئازادی ئاینی و دووەمیان لەسەر ئازادی سیاسی و سێیەمیان لەسەر ئازادی ئابووری] لەسەر بنەمای پرنسیپی ئازادی دانا. دواتر ژان ژاک رۆسۆ (١٧١٢- ١٧٧٨) بیرۆکەی ئازادی لە لۆکەوە وەرگرت و یەکەم ئاماژە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (پەیمانی کۆمەلایەتی) ئەوە بوو کە (ئینسان بەئازادی لە دایک ئەبێت) ئیتر تا دەگاتە پرۆژەی ئازادی وەک ماهیەتی ئینسان لای (کانت)و پرۆژەی ئازادی لیبرالی لای جۆن ستیوارت مل (١٨٠٦- ١٨٧٣-J.S Mill). بۆیە بەکورتی ئەشێت بووترێت زۆرینەی بیریارە سیاسییەکانی چەرخی هەفدە و هەژدەهەم (١٧-١٨) بیریاری پەیمانی کۆمەلایەتی بوون.. پرسیاری ئەوان سەبارەت بە ئەسڵی کۆمەڵگا هاتە ئاراوە؟ ئەمەش بەوە تەفسیر کرا کە حاڵەتێکی سروشتی و پەیمانێکی کۆمەلایەتییە. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە کۆمەڵگا و دەزگا کۆمەلایەتیەکان دەرئەنجامی سیستەمێکی یەزدانی‌نیە لێرەوە یەکەمین سنوور بەزاندنی بیدی ئاینی بۆ کۆمەڵ لە خۆرئاوا دەستی پێکرد. لێرەوە (ئەلتوسێر) پەیمانی کۆمەلایەتی بەوەحیەکی بۆرژوازی خوێندەوە.. لەڕاستیدا پرسیاری دەزگای سیاسی دروستکراوی یەزدانە یان عەقڵی سروشتی پرسیارێکە خۆرئاوا لە هۆبزەوە تا رۆشنەگەری پێوەی سەرقاڵ بووە. بۆیە ئەو رەخنەیەی لەسەدەی شانزەهەمەوە درێژ ئەبێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم ئەتوانین بەوە دەست نیشانی بکەین رەخنەیەکە بەتوندی بە ئاراستەیی ئاین کارکردووە.. هەر ئەم پرۆسەی رەخنەگرتنە لە ئاین لەلایەن خۆرئاوا لەلایەک سیستەمی ئاینیی پەک خست و لەلایەک رۆڵی ئاینیی لەکایەی سیاسی دابڕان [لێرەدا مەبەستمان لە ئاین نیە بەمانایەکی سایکۆلۆژی وەک لای توتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی باس کراوە بۆ نمونە ئەریک فرۆم کە پێی وایە (ژیارییەک نیە

گوناهـ لای ئینسانی کۆمەڵگای پیشەسازی یان چەمکی.دینی علمانی لای دۆرکایم.. یاز لێکدانەوەکانی ریجی دۆبریێه لە کتێبی (رەخنەگرتن لە عەقلی سیاسی) یان دیدی ئەنترۆپۆلۆژیای نوێ لای کلاسترو زۆر ژبالاندێ، کە ئەم ئیشکردنانە گەرانە بەدوای ئامادەبوونی ئاین لەکایەی سیاسی هاوچەرخدا..] لێرەوە مارکس گوتەنی رەخنەگرتن لە ئاین پێشەکی رەخنەکانی دیکەیە.. واتە رەخنەگرتن لە ئاین ئاسۆکانی دیکەی رەخنەی بۆ فکر کردەوە. تاپودلوی شۆرشی فەرەنسی کە گرنگترین وەچەرخان و ئاڵوگۆڕە لە مێژووی هاوچەرخ دا چونکە ئەم شۆرشە هەستا بە دوو پرۆسەی گرنگ:

یەکەم: چونکە حوکمی دا بەسەر ئایدۆلۆژیای سیستەمی کۆنداو بەمانەوەیەکی هەمیشەی لە دۆخی کۆندا بە درێژایی سیستەمی جیهانی [واتەلکانی مانای تەقلید بەدینەوە].

دووەم: هەروەها چەسپاندنی بنەرەتی ئایدۆلۆژیایی جیهانی هاوچەرخ و بەجیهانی کردنی بەهای فەلسەفی و سیاسی و رۆشنبیری و ئەورویی. جگە لەوەی شۆرشی فەرەنسی شەرعییەتی گەلی لە دەرەوەی دەسەلاتی سیاسی سەلماند و ئەشێت بوترێت گەل لە بنچینەدا جەوهەری شۆرشی فەرەنسییە و جگە لە دامەزراندنی پرۆژەی ئازادی تاکەکەس وەک دەرئەنجامی سەرکەوتنی سیاسییانەی لیبرالیزم چونکە نمونەی بالای لیبرالیزم ئازادی فکروڕادەربرین و لێبوردن و قودسییەتی تاکە کەسە.. هتد.لەسەر ئەم بنەمایەش ئەگەینە ئەوەی بڵێین ژیاری خۆرئاوا بۆتە ژیاریەکی جیهانی ئەمەش لە دەرئەنجامدا ژیارییە تەقلیدیەکانی توشی کێشەی ونبوونی شوناس کردووە و شێوەیەکی ناخاوتنی هێناوەتە گۆرێ بەناوی پرۆژەی بەرهەڵستی کردن کە بەلای (داریوشی شایگان)ەوە لە دۆخێکی شیزۆفیرینی ئەچێ کە دەرئەنجامی بەرکەوتنی دوو ئاستی مەعریفییە کە پەیوەستە بە دوو سیستەمی ژیانی جیاواز.. واتە مەسەلەکە بۆنمونە تەنها بەرکەوتنی عەقلی کوردی نیە بەعەقلیی خۆرئاوا بەڵکو بەرکەوتنی دوو ئاستی جیاوازیشە لەپەرەسەندنی کۆمەلایەتی و مێژوویی. بەگرنگیشی ئەزانم بڵێم لێرەدا ئەو دیدگایە ردتنەکەمەوە کە ئەیەوێت بڵێت مێژووییەک هەیەمێژووی خۆرئاوایە و مێژوییەک هەیە مێژووی خۆرهەلاتە چونکە لێردا ئەمانەوێت دیدگای خۆمان بۆ تایبەتمەندی رۆشنبیری تەرخان بکەین نەک دیگایەکی جەوهەر گەرای بۆ رۆشنبیری چونکە رۆشنبیری پرۆسەیەکە لە تێکرایی پرۆسەی مێژوو.. ئەو بەرهەڵستەیەش کە ئاماژەمان بۆ کرد رووبەڕوو بوونەوەی ژیارییە کلاسیکییەکانە لەبەرامبەر هێزی خۆرئاوا.. هێزێک ئەکەوێتە حسابی ئەم ژیارییانەوە.. ئەم مەسەلەیەش جیاوازە لە مەسەلەی دیالۆکی ژیارییەکان.. مێژووی بەشەرییەت لەرێی خۆرئاواوە تووشی کودەتایەک بووە کە ژیاری خۆرئاوای کردووە بە ژیاری جیهانی .. خۆرئاوا یەک لە سەدەی شانزە و هەڤدەدا

(١٦-١٧) پێئەنێتە سەدەی زانست و تەقەنییەتەوە، مرۆڤ ئەبێتە سەروەری جیهان و بۆیەکی عەقلی (دیکارت) دیکارت یەکەم کەس بوو ئەوەی راگەیاند کە عەقل عادیلانەترین شتێکە دابەش کرابێت بەسەر ئینساندا [بروانە مقالة الطريقة- رينيه ديكارت- ترجمة: د. جميل طيبا- بيروت- ١٩٥٩- القسم الاول ص٥٨] ئیتر لێرەوە ئینسان لە تێگەیشتنی ئاینیانە دابڕیندرا کە ئینسان بوونەوەرێکە کڕنووش ئەبات بۆ ئیرادەی یەزدان. ئینسان سەروەری دژی چەمکی شعور کردنە بە گوناهـ کە بەچەمکی کلاسیکی لە فکری یەهودی و مەسیحی و ئیسلامدا لە جەوهەردا یەکسانە بە کڕنووش بردنی ئینسان بۆ هێزێکی سەروو ئینسانی. لەڕاستیدا ئەگەر سەنتەری بیری یۆنانی (گریکی) گەردوون بێت و سەنتەری بیری مەسیحی لاهوت بێت.. ئەوا ئینسان سەنتەری فکری سەدەی نوێیە. لێرەوە ژیارییە تەقلیدی و ناوچەییەکان لەبەردەم هەڵوەشاندنەوەی دان لەسەر دەستی ژیارییەک کە رەوتێکی سەرپاگیر و جیهانی وەرگرتووە کە مەبەست (خۆرئاوایە). بۆیە ئەشێت بە ئاشکرا بڵێین مێژووی نوێ مێژوویەکی سەراپاگیرەو جیهانییە و مێژووی ئێمەشە، نەک لەبەر ئەوەی بەشداریمان لە دروست کردن و دروست نەکردنی ئەم مێژووە جیهانییەدا کردووە بەڵکو لەبەر ئەوەی هیچ شتێک ناماناپارێزێت کاتێک بمانەوێت دژایەتی بکەین.. جیهانی سێیەم یان ژیارییە تەقلیدییەکان ناچارن بچنە چوارچێوەی چەمکە گشتییەکانی خۆرئاواوە وەک: کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت و پەرلەمان و حزب و سەندیکا و دیموکراسیەت.. هتد. چ دۆخێکی کاریکاتێرییە بمانەوێت بە (شورا) بەرهەڵستی دیموکراسییەت بکەین کە گوتارێکی باوی جیهانییە. ئەوە وەهمێکی گەورەیە بمانەوێت شوناسی رۆشنبیرییت بپارێزیت و بشبیتە بەشێک لە مۆدێرنیزم. کاتێک چارەنووسی ئەم ژیارییە تەقلیدییانە ئەبەستینەوە بە چارەنووسێکی هاوبەشەوە کە چارەنووسی خۆرئاوایە. ئەبێت لەوە بوارە تێبگەین کە جیامان ئەکاتەوە لە خۆرئاوا ئەویش دواکەوتنی جیهانی سێیەم نیە لە ئاستی ئابووریدا بەتەنها بەڵکو دواکەوتنی پێکهاتەی عەقڵیشە.. گرنگە تێبگەین لەوەی ئەو کاریگەرییە جیهانییەی فکری خۆرئاوا بەسەر بەشەرییەتەوە بەجێی ئەهێڵێ لەسەر چەند رووداوێکی گرنگ بیناکراوە کە ئەکرێت دەستنیشانی بکەین بەگواستنەوە لە روانینی تەئەمولیەوە بۆ فکری تەقەنی و لە بیرۆکەی دنیا کۆتاییەوە بۆ بیری مێژوویی و بەخشینی مانایەکی دنیایی بە زەمەن. بەڵام کاتێک باس لە هاو ئاهەنگی بە جیهان دەکەین ناکرێت شوناسی رۆشنبیری تایبەت بپارێزین بەڵام ئەمە زۆر جار گرفتی بە خۆر ئاوایکردنی چڕ و ئامۆبوونی پلە بەپلەی خولقاندووە. خۆرئاوایی کردن (التغريب) وشیاری نیە بەفکری خۆرئاوا بەپێچەوانەوە نواندنی رەفتارێکی خراپە بەرامبەر بەسەرکەوتن و داهێنانی خۆرئاوا.. خۆرئاوا بڕۆژەی دیموکراسیەتە. لەسەر بنەمای جەوا

سەدە لەبەر زانستی کردن (العلمنة) بیناکردووە پاراستنی شوناسی رۆشنبیری بەداخەوە هیچ نیە جگە لەوەهم وێنەیەکی پوچ گەرایە بەرامبەر بە خود (الذات).. بزاوتی جیهانی دەرەوەی سەنتەری سەرمایەداری لەبەردەم مەیلی پێچەوانەدا ئەسوڕێتەوە مەیلێک بە ئاراستەی بزاوتی گشتی بەخۆرئاوایی کردن لە چوارچێوەی پرۆسەی بە جیهان کردن دایە و خۆگونجێنە لەگەڵ سیستەمی نوێی ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی جیهانیدا مەیلێکیش کە لە رۆشنبیری کەناردوە (ثقافة الاطراف) بە ئاراستەیی ئەم سەنتەرە دینامیکی‌یە کە سەنتەری خۆرئاوایە گوزارشت لە خۆی ئەکات لە رێگای بە ئیدۆلۆژی کردن (الادلجة) کە ئایدۆلۆژیا بەلای (شایگان)دوە وەک خالی بەیەکگەیشتن وایە لەگەڵ خۆرئاوادا (بۆزیاتر تێگەیشتن بڕوانە: أوهام و الهوية- داريوش شيغان- ترجمة: محمد علي مقلد- دار الساقي- الطبعة الاولى ١٩٩٣) کە تواندنی یۆتۆپیایەکی دوور لە زەمینەی واقعە.. سروشتی ئایدۆلۆژیایش بە مانایەک لە ماناکان ئەوەیە بەردەوام وەلام ئەداتەوە و پرۆژەیەکە بۆ کردار نەک بۆ پرسیار بڕوانە ئەو پرۆژانەی بەناوی [پەرەپێدانی سەرپاگیر و نوێگەری (تحديث)و رێگای ناسەرمایەداری و...هتد] هاتنە ئاراوە کە جگە لە سیستەمێکی ئایدۆلۆژی سەپێنراو هیچی دی نەبوو. جگە لەوەی بە شەحنەیەکی ئایینی جەماوەری پێ ئەیارکرا.. ئالێرەدا ئەو قسەیەی (نیشتە)م بیر ئەکەوێتەوە کە ئەڵێ]: باوەڕە چەسپییەوەکان دوژمنی حەقیقەتن و ترسناکتریشە لە درۆ (بڕوانە ما وراء الخير و الشر- فريدريك نيشته- ترجمة: د. محمد عضيمة) ئەوەتا لە دوای روخانی بلۆکی رۆژهەلاتەوەیان بلۆکی سۆشیالیستی‌یەوە جیهانی سێیەم توشی قەیرانێکی کوشندە بووچونکە نازانێت بە چ ئاراستەیەک گوزەرکات و ئاراستەیی خۆی ون کردووە... بۆ نمونە ئەگەر ئاوڕ لە ئەزموونی بەعلمانی کردنی (تورکیا) بدەینەوە دەبینین لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم کەماڵ ئەتاتورک لە وڵاتێکا پرۆژەی پرۆژەی عیلمانیەتی سەپاند کە تا ئێستا ئەو وڵاتە توندڕەوە لە پەیوەستگەیەکی بەئیسلام. وەئەتاتورک سەرکردەیەکی سەربازی بوو جگە لەوەی لە فەرەنسا خوێندبووی و بە حەماسەتی فکرەی فەرەنسی و دیدگای علمانی تێکۆشەرانەوە گەرایەوە هەروەها ویستیشی هەموو ئەم شتانە لەسەر تورکیا پراکتیزە بکات وەک رەتکردنەوەی سەڵتەنەت کە جۆرێکە لە شەرعیەتی ئیسلامی هەوەرها دامەزراندنی کوماری تورکیا لەسەر نمونەی خۆرئاوایی جگە لە رەتکردنەوەی رۆژمێری کۆچی ئیسلامی و رێنووسی عەرەبی.. بەگشتی مەناخێکی سیمۆلۆژی جیاوازیشی هێنایە گۆڕێ (بڕوانە الاسلام والعلمنة- محمد اركون- دراسات عربية- العدد- ٥- ١٩٨٦). بەلام لەهەمان کاتدا پرۆژەی ناسیونالیستی تورکی بە خەسلەتێکی رەهاوە پیا دەکرا چونکە دیمەکراسیەت و علمانیەت هێشتا وەک پرۆژەیەکی جدی و عەقلانی نەخراوەتە گەڕ. ئەو گەڕانەوەیەی لە

ئارادایە بۆ ئیسلام لە تورکیا نیشانەی پرۆسەی بە خۆرئاوایی کردنە (التغریب) نەک وشیاری بە خۆرئاوا لێردا؛ بۆ تێگەیشتن لە چەمکی گەڕانەوە بوی ئیسلام ناچارین پەنابەرین بۆ پێناسەی (ژۆرژبالاندی) بۆ چەمکی (زاکیرە) لای بالاندی یاددوەری کۆمەڵ لە چینی جیۆلۆژی زەوی دەچێت لێرە ئەگەر رابردوو بەشێکی شاراوە بێت هەر کاتێک رێگای بۆ ردخسا ئەتەقێتەوە چونکە یادەوەری کۆمەڵگای تورکی لە دوو چینی سەرەکی پێت دێت چینێک لە وشیاری کە لەڕێی ئیسلامەوەیە یان بلێین وشیارییەکی ئیسلامی دواتر چینێکی لە وشیاری هاتووە چینی یەکەمی داپۆشیوە کە وشیارییەکی خۆرئاوایی‌یە.. بۆیە کاتێک وەک بالاندی دەڵێت: رووداوی دەست بەردان لە بیری نوێگەری گەڕانەوەی بۆ بنەڕەت و تێکست و یادەوەری مێژوویی پەیدا دەکات و چینی ژێردوە بۆ یاددوەری کۆدێتە دەرەوە بەرەو رۆخی ئێستا لەبەر ئەوەی قۆناغی رابردوو هەوڵی داوە بازی بەسەر دابدات بێ ئەوەی بە ئاشکرا رووبەڕووی بێتەوە.. (بڕوانە گۆڤاری گوتار- ژمارە١- دەسەلات و نوێگەری- سازدانی: هاشم صالح. و: جمال رشید) (کە بەزمانی فرۆید ئەشێت ناوی بنێین گەڕانەوەی کەپت کراو).. لەڕاستی‌دا ئەو حاڵە نۆوارەی کە ئەمڕۆ لەئارادایە لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکان بەرامبەر بە خۆرئاوا کە نزیکەی سەدەیەک زیاترە.. کە ئیسلام وەک جۆرێک لە پەناگە دەرکەوتووە بۆ پاراستنی شوناس لەبەرامبەر خۆرئاوادا.. ئەمەش بەڵای متەوزە ئەو گرفتەی خولقاندووە کە واتێبگەین ململانێ ئەمڕۆ ململانێی نێوان علمانیەت و تەیاریی ئیسلامییە ئەگەر چی ئەم دوو ئاراستەیە رووبەکی ململانێکان[ بێ] بەڵام جەوهەری ململانێکە لە ئاستی عەقائیدا نیە بەڵکو لەنێوان هێزێکی حوکمڕان و هێزێکی کۆمەڵایەتی دایە لەژێر دەسەڵاتی حکوم.. کە هێزی حوکمڕان شەرعیەتی لەدەست داوە لە رێگای زۆرە ملێی فاشیانە وە خوی سەپاندووە واتە جەوهەری ململانێکە ئەبێت لەسەر مەسەلەی قووڵکردنەوەی پرۆژەی دیموکراتیزەکردن بێت. بەڵام کاتێک باس لە پرۆژەیەک دەکەین وادرووستە لە چوارچێوەی کێشەی رۆشنبیری کوردییەوە تێی بڕوانین کاتێک لە چاپتەری یەکەمی ئەم نووسینەدا گوتمان خەونی عەقڵانیەت و نوێگەریی کوردی بەرەو کوێ ئەچێت؟ ئەم پرسیارەش خۆی لە خۆیدا ئاشکرا کردنی گرفتێکی خەتەرە لە رۆشنبیری کوردیدا.. بۆ نمونە ئەگەر ئەو قسەیە دروست بێت وەک بەڵکەنەویستی لێ هاتبێت لە رۆشنبیری ئەورووپی‌دا کە ئەڵێت: گوتاری موفەکر ئەبێت پشت بە واقعی کۆمەڵایەتی ببەستێت کە لێوەی هەڵقوڵاوە.. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە رۆشنبیری کوردی هەڵقوڵاوی واقعی کوردی نیە بەڵکو هەڵقوڵاوی جیهانگیرییەکە لە بەهای رۆشنبیری لێردوە رۆشنبیری کورد هەڵگری دیدێکی ترلۆیدییە.. ئیدی رەخنەگران ئەنتلیجسنیای

و نویگەرخولز لە ئازادنیە کاتێک رۆشنبیر سەرقاڵی پیادەکردنی بەرهەمهێنانی خەونی عەقلانیەتە. لێرەوە رۆشنبیری کورد بەردەوام بە سیدێکی تراژیدییەوە مەحکەمەی واقعی کوردی ئەکات چونکە کاتێک ئەنتلجنسیایی کورد خەریکی قوڵکردنەوەی ئاسۆکانی بینینە بەسەر تازەگەریدا بزاوتی واقع لە سنووری بەرهەمهێنانی تراژیدیا نەچۆتە دەرەوە. بۆ نمونە بزاوتی یەکپارچەیی ئیتالیا زەمینەیەکی هاوشانە بۆ ئایدیای (میر)ی مەکیاڤیلی، هەست بە جۆرێک لە وەلام دانەوەی داویەشی ئەکەین لەنێوان فکر و واقعدا.. بەلام لەبەر ئەوەی ناهاوشانییەک هەیە لە بونیادی رۆشنبیری کوردیدا کە ئەمەش رەگ و ریشەی لە واقعی کۆمەلایەتی کوردی دایە واتا ناوهوشانی رۆشنبیری رەنگدانەوەی ناهاوشانی بونیادی کۆمەلگایە بەلام دواجار ئەنتلجنسیای کورد لە ریگای خەون بینین بە هێزێکی نوێوەو کردنەوەی ئاسۆکانی گۆران ناچارە بەردەوام لە پرۆسەی قوڵکردنەوەی وشیاری و رەخنەدا بمێنێتەوە.

تەواو. 1997

سەرچاوەکان:

١. عالم الفكر- المجلد الثاني و العشرون- العدد الثاني- ١٩٩٣ (مسيرة الديمقراطية... رؤية فلسفية بقلم: د. إمام عبد الفتاح إمام).

٢. الاضطراب الكبير- إيمانويل فالرشتاين حيوفاني اريغي سمير امين أندريه غندر فرانك مارشا فونتيس ترجمة: د. عصام الخفاجي اديب نعمة دار الفارابي- بيروت.

٣. الغرب والعالم، تاريخ الحضارة من خلال موضوعات- القسم الثاني- تأليف كافين رايلي- ترجمة: د. عبد الوهاب محمد المسيري+ دهرى عبد المسيح حجازي (سلسلة عالم المعرفة).

٤. ماكس هوركهايمر- بدايات فلسفة التأريخ البرجوازية الطبعة العربية الاولى ١٩٨١- دار التنوير.

د. لوي التوسير: مونتسكيو السياسة والتأريخ الطبعة الولى، ١٩٨١ الناشر، دار التنوير.

٦. الايدلوجيا وأجهزة الدولة الايدلوجية- لوي التوسير ترجمة: د. سهيل القش.

٧. حوار الدولة والدين- تأليف: سمير أمين+ برهان غليون. الطبعة الولى، ١٩٩٦. النشر، المركز الثقافي العربي.

## [illegible]

*سەروەر ئەحمەد*

سەرەتا دەمەوێت ئەوە بڵێم: کە بێ گومان لەبەردەم باسێکدایین، کە تارادەیەکی زۆر هەڵگری ئیشکالیەتێکی جۆراوجۆری گەورەو ئاڵۆزە؛ باسێک کە تاوەکو ئەم ساتە وەختەش کەم و زۆر لەناو گوتاری سیاسی و رۆشنبیریماندا ونە. لە کاتێکدا رووبەڕوو بوونەوەی گوتارێکی وەک ناسنامە پشت ئەستورە بەچەند مەرجەعێکی جۆراوجۆری سیاسی و فکری و ئایدۆلۆژی جیاواز. حەتمەن قسەکردن لەسەر بابەتێکی ئاوەها لەناو زەمینەی سیاسی و رۆ شنبیری کوردی‌دا هێندەی تر کارەکانمان ئاڵۆزتر و قورستر دەکات؛ بۆیە زیادەڕۆیی نیە گەر بڵێین: خۆدان لە قەرەی باسێکی ئاوەها؛ لەخۆی دا جۆرێکە لە سەرکێشی. بەم پێیەش سروشتی ئەم باسە بەرەو کایەی جۆراوجۆرمان دەبات و رەنگەر زۆر جار بە ناڕاستەوخۆیی بچینە ناو ئەهجێکی بەراورد کارییەوە، ئەگەر چی ویستی خۆشمانی تیا نەبێت، لە ڕاستی‌دا ئەمەش لەو لایەنەوە ئەڵێم؛ کە رەنگە لەژێر باری ناچارییا زۆر پرسیاری فکری و فەلسەفی لە ئاستێکی گشتی بەشەری‌دا. دابەزێنینە سەر ئاستێکی تایبەتی [واتە تایبەت بە مرۆڤی کورد]، چونکە لەڕاستی‌دا ناتوانین سەیری ئاسۆو ئاستەکانی چەمکی (ناسنامە) بکەین بەبێ گەڕانەوە و چوونەوە سەر زۆر لەو پرسیارانەی کە تا رادەیەکی زۆر جەوهەرین، چونکە وەک ئەوەی ئەیزانین: یەکێک لە خاڵە هەرە سەرەکی و جەوهەری‌یەکانی فکری خۆرئاوا، چ لەسەردەمی رۆشنەگەرییا، یاخود سەردەمی رێنیسانس؛ یا هەرزەمەنێکی تری فکری خۆرئاوا کە رەوت و پێڕەوی فەلسەفی و ئەدەبی و هونەری تیادا دەرکەوتبێت:دابەزینی پرسیارەکان بووە بۆ ئاستێکی جیاوازتر لە ئاستەکانی پێشوو؛ بۆ نموونە: وەک ئاڵوگۆڕی مانای هێز لەدەرەوەی سروشتەوە بۆ ناو سروشت، کە (فۆکۆ) لە دەستەواژەیەکی جیاوازدا ئەمەمان بۆ رانەگەیەنێت لەسەر لەدایک بوونی یاخود دەرکەوتنی (مرۆڤ).. یاخود ئاسانتر بڵێین: هەروەک ئەوەی لەناو دەقە فکریە جۆرلوجۆردکانا رەچاوی ئەکەین: ئەوەیە کە بەردەوام پرسیارەکانی فکر لە ئاستێکی دیاریکرلودا رانەوەستاوە؛ وەک ئەوەی بەر لە چاخی ناوەڕاست هیچ جۆرە هاوپەیمانیەکی ئاشکرا و بەیانکرلو لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا نەبوو، بەڵام لەناوبردنی چاخی ناوەڕاست، راستەوخۆ ئەو هاوپەیمانێتی‌یەمان بیر دێنێتەوە کە لەنێوان فەلسەفە و ئایین دا بەیان کرا، یاخود وردتر بڵێین ئەوەی لە نێوان عەقڵ و وەحی‌دا بەیان کرا؛ لەلایەن قەدیسەکانی ئەو سەردەمەوە، هەروەک قەدیس [ئەنسلیم- تۆما ئەکوینی- ئۆغە سطەنطیس]؛ سەر لەنوێ دوابەدوای چاخی ناوەڕاست، ئەم میکانیزمە گۆڕایەوە بە جیاکردنەوەی ئەو دوو جەمسەرە لەیەکتری، کە دواتر ئەم کاری جیاکردنەوەیە بەتەنها لە ئاستێکی تیۆری

رووتدا نەوەستایەوە، بەڵکە زۆر بە خێرایی دابەزییە ناو ماهی‌یەتی ژیانی ئەو سەردەمەوە هەڵبەت مەبەستمان لایەنی پراکتیکی‌یە. وەک ئەوەی هەوڵی جیاکردنەوەی کەنیسە لە دەوڵەت درا، کە لە ڕاستی‌دا، ئەمانە دەستکەوتێکی فکری گەورەن؛ وەنەشر کرێ بێ دو دڵی بڵێین ئێستای خۆرئاوا تارادەیەکی زۆر حەقیقەتی تیۆری دەسەلمێنن لا ئاستێکی پراکسیسکراودا. حەتمەن قوربانیەکانیشمان لەیاد ناچێت کە ئەو سەدەیە پێویستی بوو هەر لە قوربانی ڕۆشنبیرێکەوە تاوەکو قوربانی جەنگاوەرێک بەڵام لابوت پرۆژەیەکی ڕۆشنخواز هاتە گۆڕێ؛ بەلام گەر لە ڕاستی‌دا سەیری قوربانیەکانی کورد بکەین: سەرباری تراژیدیایەکی بێ‌وێنە بەڵام دواجار تێئەگەین کە قوربانیەکانی ئێمە لەپێناو قوربانی دان دایە، وەک چۆن شەڕی خوێناوی ئێمە بەدرێژایی مێژوو شەڕ بووە لەپێناوی شەڕدا؛ ئەمەش بەو مانایەی کە [کورد دەیەوێت بچێتە ناو سەردەمێکی نوێوە بەڵام بێ‌ئەوەی بەهاکانی خۆی بدۆزێتێ] مەبەستم لەبەهایەکی مرۆڤانەنی‌یە، هێندەی مەبەستم بەهێنانەبەتی‌یەکانێتی، کەسەرجەم ئەم بەهایانەش لەناو گوتارێکدا کۆدەبنەوە کە دەشێ بە (گوتاری ئاکاریی) ناو بەرین، چونکە دواجار هەمو بەهایەکی مرۆڤی کورد وەرئەگێڕێ بۆ جۆرێک لەئاکار، وەئەم ئاکارە گوزارشت لە بەهاکانی دەکات. کە تارادەیەک لەناواخنی باسەکەدا وردتری ئەکەینەوە.

ڕەنگە هەڵە نەبین گەر بڵێین سەردەمانێکی زۆر فکر لە بازنەیەکی میتافیزیکی کلاسیکی دا دەخولایەوە، بەم پێیەش پرسیارەکانی بەشەر ئاسۆکانی دیاری کراو بوو، وەک چۆن گەمارۆدراو بوو بەزانینێکی دیاری کراو؛ (مەبەستمان لە میتافیزیکای کلاسیکی. سەردەمی فکری گریکی‌یە بەتایبەتی) گەرچی زۆر لە بیرمەندەکان هەوڵیان داوە لەو خولگەیە بێنەدەرێ بەلام تا ئەندازەیەک لەرێگەی زەبری ڕەخنە توندەکانیانەوە کە ئاراستەی بیری میتافیزیکایان ئەکرد، دواجار خۆشیان ئەکەوتنەوە ناو هەمان شاوکێشەوە، وەک هەڵوێستی (هیدجر) لەسەر (نیتشە) کە بە یەکێک لەو بیرمەندانەی ناو ئەبرت کە دەیەوێت ئەو بازنەیە کۆتایی پێ بێنێت، بەلام بەهەر حاڵ بۆ ئەوەی تایبەتمەندێتی بابەتەکە ڕەچاو بکەین لەسەر ئەم لایەنە لائەچین؛ لێرەوە ئەشێ بگەڕێینەوە سەر ئەو بڕوایەی کە هەمرو داهێنان و دەسکەوتە گرنگەکانی بەشەر بگەڕێنینەوە بۆ سەرچاوەکەی کە فکری خۆرئاوایە؛ لەڕاستی‌دا ئەمەش پیرۆزکردنی عەقڵی خۆرئاوا نی‌یە؛ هێندەی حەقیقەتێکەو نکوڵی لێناکرێت، کە دەوترێت عەقڵی خۆرئاوا خاوەنی فۆرمێکی سەنتەریزمانەیە، ئەمە بەو مانایە دێت: کە سەرچاوەی هەمرو تەقەنیاتو مەنهەجەجیاوازەکان، فکری خۆرئاوا خۆیەتی، سەرباری ئەمەش هەر فکری خۆرئاواشە کە ڕەخنە ئاراستەی ئەو سەنتەریزمە عەقڵی‌یەی خۆی دەکات؛ کە دیارترینیان، وەک ڕەخنە توندەکان [illegible]

راستە هەندێ شت هەن کە بەشەر تیاندا هاوبەشە، بەشـێوەیەکی گشتی مانـای (ژیـان) کە سادەترین و دیارترین چەمکی هاوبەشە لەنێوان گروهە بەشەرییەجیاوازەکاندا؛ بەڵام ئەو حەقیقەتـەی ئـەم بڕوایـەی پێشوومان هـەڵ دەوەشـێنێتەوە ئەوەیـە کـە ئێمـە و نمونەکانی وەک ئێمە ئەو توانایەی نەبووە کە بتوانێ ئەو کەشە هاوبەشـە وەرگێڕێ بـۆ تەقـەنیات و ئـەدەواتی رەخنـەیی کەمـەرجی دامـەزراندنی هـەموو پرۆژەیـەکی عەقڵانییە.لێرەوە وەک پێشتر وتمان هەموو داهێنانێک دواجار ئەگەڕێتەوە بۆ ناو فکری خۆرئاوا؛ کەواتە لـێرەوە پێناسـی ناسنامەی رۆشنبیری چییە؟ وەچـۆن دەشـێت لـەو قەیرانە بێینـە دەرەوە!؟ لـەکاتێکا وەک (داریوشـی شـایگان) دەڵێـت: [ناسـنامەی رۆشنبیری تەنها چەمکێکی خۆرئاوایییە] (اوهام الهویة/ درایوش شایگان- ت. محمد علی مقلد/ دار الساقي ١٩٩٣ ص١٠٠) لەڕاستیدا دەبێت ئەو دەستەواژە گرنگەی (نیتشـە) بهێنینەوە یادی خۆمان کە هەموو داهێنـانێک بـەر لـە هـەموو شتێک ئەگەڕێنێتـەوە بـۆ تێکشکاندنی ئاکارەکـان.. ئـەگەر دواجـار لـە دوو تـوێی خوێندنەوەکـەماندا ئـەم دەستواژە نیتشەیییە بەردەوام ئامادە کەینەوە بەتایبـەتی لـەکاتێکا سـەرجەم بونیادە جیاوازەکانی ئێمە بونیادی تەقلیدین؛ بۆیە لەو بڕوایەدام تا ئەندازەیەکی زۆر پێویسـتمان بەم دەستەواژەیە ئەبێت هەروەک چۆن پێشـتر ئامازەمـان بەبەهاکانی مرۆڤـی کـورد دا لەناو گوتاری ئاکاردا، چونکە ڕووبەڕووی زۆر پرسیار ئەبینەوە کە تا ئەندازەیـەک نزیکـن و هاوشێوەن.

ئـەوەی گرنگـە و مەبەسـتمە بیڵێـم بـەر لـەوەی بەتـەواوەتی بچینـە نـاو نـاواخنی بابەتەکەمانەوە، ئەوەیە کە پێشـتریش وتـم: چونکـە ئـەم چەمکـە (چـەمکی ناسنامە) پرسـیارێکی قەیراناوییـە لـەخۆیدا وە لـەناو رۆشـنبیری کـوردیدا زیـاتر چـەمکێکی داخـراوە، داخـراو بەومانایـەی نـە لـەڕووی پراکتیکییـەوە کـە زیـاتر دیوێکـی سیاسـی و کۆمەڵایەتی ئەگرێتە خۆ، خاوەنی دەرئەنجامێکی ئاسۆکراوە و پـڕ لـە ئێشکالین لەسـەر ئاسـتی جیـاواز، وە نەلـەڕووی تیۆرییـەوە خـاوەنی دامەزراوەیـەکی رەخنـەیین، بەڵکـە تاوەکو ئەم ساتە وەختش لە بازنەیـەکی شـەفەهیدا گـەمارۆدراوین، بـەواتای پرۆسـەی نووسین کایەکی تازە بەنیسبەت رۆشنبیری ئێمەوە؛ بەبڕوای من رابـردوو بخەینـەژ ێـر چ جۆرێک لە تەقەنیاتەوە بەهەمان شێوەش پێویستە (هەنووکە)ش بخەینـە ژێـر رکێفـی هەمان تەقەنیاتەوە؛ مەبەستم لەوەیـە کـە چـۆن موحاسـەبەی رابـردوو بکـەین بەهـەمان شێوەش مەرجە مەحاسەبەی بڕاڤەکانی ئێستا بکەین.

ئەتوانم تاوەکو ئەم ساتە وەختـەش بڵێـم: کـە پرسـیاری ناسـنامە، تەنانـەت نەبۆتـە پرسیارێکی رووتیش لای رۆشنبیری ئێمە، مەبەستم پرسـیارێکیجەوهـەری و حەقیقیـە. لەبەرەوەوەی، کەئایا تاچەندێک ئێستیما کرد بۆ ناسنامە بەشـتەوەکی گشتـ دەەستە

یان نە؛؟ بەهەر حاڵ بە هیوام بتوانم بەلایەنی کەمەوە دەرگا لەرووی چەند پرسیارێکی رەهەند جیاواز والا بکەم دیسانەوە ئەڵێم گرانی ئەم بابەتە لەوەدایە کە زۆر گشتگیرانە تێکەڵ بە کایە جیاوازەکان دەبێت، رەنگە ئەمەش ئیشکالی مەنهەجیمان بۆ دروست بکات. وەڕەنگە بە رادەیەک کەم و کوڕیمان بۆ دروست بکات لەوڕووەوەی کە لەوانەیە نەتوانین بەتەواوەتی قوڵایی پرسیارەکان ئاشکرا بکەین بەلام دواجار ئێمەش دەست بەرداری ئەو پرسیارانە نابین کە دێنە روومان و تووشی راڕایمان دەکەن. مەبەستم لە راڕایی ئەو ئەگەرانەیە بەرەو شتێک دەڕۆن بەلام لەهەمان کاتدا پرچەکەن بەجۆرێک لە نەزانین یان نەشکری ئەم نەزانینە بۆ ئەوەی فۆرمێکی ئەفسانەییمان لادروست نەکات بە (زانینی نادیاری) ناو دێر بکەین، کە لە راستیدا ئەرکی سەرەکی رۆشنبیریش بەددرنی‌یە لە دروست کردن و بەستنی پەیوەندی‌یەکی ئۆرگانی لەنێوان خەسڵەتە دیار و نادیارەکانی رۆشنبیری..

بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندی‌یە بەرجەستە بکەین، دەبێت بزانین مەبەستمان لە (دیار و نادیار) چی‌یە؟ گەر چی ئاماژەی پێشوومان بەشێوەیەکی گشتی لە ئاستە هەمە چەشنەکان بوو. بەلام لە ئێستا بەدواوە مەبەستم لە (دیار / نادیار)بوون و مێژووە. هەڵبەت مێژوو وەک لایەنێکی دیار/ ئامادە، وەبوونیش وەک لایەنێکی نادیار/ نائامادە.

ئەگەر پێشتر وامان زانی بێت کە مرۆڤ کائینێکی وجودی‌یە، ئەوا دەبێت بەو زانینەدا بچینەوە، وەمن دەمەوێت وا پێناسی بکەم کە تا رادەیەکی زۆر کائینێکی مێژوویی‌یە.

لەراستی‌دا گەر جارێکی تر مرۆڤ بگەڕێنینەوە بۆ ناو بوونێکی رووت و زەمەنێکی رووت. ئەوا بێگومان دەچینەوە سەر ئەو بڕوایەی کە مرۆڤ بەتەنها لەناو بوونی‌دا کائینێکی ون و نادیارە! لابوت ئەم بڕوایەش قەهرێکی گەورەیە بەنیسبەت مرۆڤەوە. بۆیە بە بڕوای من تاکە چەکی مرۆڤ بۆ هاتنە دەردەوە لە چنگی ئەو قەهرە بەتەنها بڕوامینانی بووە بە مێژوو لەپێناو بەرجەستەکردنی جەوهەریی بوونی‌دا. لێرەوە دەبێت بپرسین لەم باسەی ئێمەدا مێژو چی‌یە؟ من مەبەستم لە مێژوو سەر لە نوێ هێنانەوە و ئامادەکردنەوەی نگا جیاوازەکان نی‌یە بۆ مێژوو. چونکە من لە ئاستێکی دیاریکراودا بەکاری دەهێنم. لەراستی‌دا ئەو دەستەواژەیەی سەریشەوە لەسەر مێژوو، پەوژش هێنانەوە نی‌یە. ئەوەندەی دەمەوێت دوور کەوینەوە لەبەد حاڵی بوون، چونکە من دەمەوێت دەستەواژەیەک بەکار بهێنم کە ئەڵێت (مرۆڤ کائینێکی مێژوویی‌یە) بەلام لێرەوە جەخت لەسەر ئەوە ئەکەمەوە کە بەهیچ شێوەیەک من نامەوێت لە بایەخی پەیوەندی ئەم دوو خەسڵەتە (بوون / مێژوو) کەم بکەمەوە. بۆیە گەر هەر ساتێک

ویستمان بەتەنیا یەکێکیان بخەینە ژێر راڤەکردنەوە، ئەوا بێگومان لەپێناو بەرجەستەکردنی دروست ترین پەیوەندی‌یە لەنێوانیاندا.

بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو راڤەکردنێکی پەرش و بڵاوەوە، ئەوا لێرەوە لە رێگەی (جەوهەری ناسنامەوە) زیاتر خۆمان لەو پەیوەندی‌یە ئۆرگانی و جەوهەری‌یەی نێوان (بوون/ مێژوو) نزیک ئەکەینەوە لەپێناوی مەبەستی بابەتەکەماندا.. لەراستی چەمکی (ناسنامە) بەشێوەیەکی گشتی دابەش ئەبێت بەسەر دوو ئاستدا:

ئاست یەکەم: ئاستێکی ئەنتۆلۆژی‌یە، ئەشێ بڵێین ئەم ئاستە زیاتر مانایەکی فەردی لەخۆ ئەگرێت. واتە مەبەستمان لەو ململانێ وجودیانەیە لەنێوان (من/ بەرامبەر)دا، کە ئەمەش زیاتر بەشێوەیەکی ترو بەتەقەنیاتی تر لەناو ئاستی دووەم دا چالاکانەتر کار ئەکات، کە زیاتر لەم ئاستەش دا کێشەکە پابەندە بەم گوزارشتەوە- دانـان بە بوونی یەکتردا- لەراستی‌دا ئەم دان پێدانانە لەخۆی‌دا شەرێکەلەسەر ئەساسی سەپاندنی ماهیەتی بوونی تاکە کەسی‌دا، بەلام ئەمە رووبەرێکی بچوک و شاراوەیە لە ژیانی بەشەری‌دا بەلام ئەم کێشەیە ناتوانێ بەتەنیا لەناو ئاستێکی فەردی‌دا بمێنێتەوە بۆیە کێشەکە ئەگوزرێ بۆ ناو رووبەرێکی گەورەتر کە ئەویش ئاستی دووەمە: ئاستی مێژوویی. بەبروای من ئەم ئاستە زیاتر هەوڵ ئەدات فاکتەردکانی ململانێ و کێشمەکێش لە رووبەرێکی شاراوەوە وەرگێرێت بۆ رووبەرێکی دیار و زانراو.

لەراستی‌دا گەر یەکێک لە رەهەندە سەرەکی‌یەکانی ملمڵانێی بەشەر لەسەر ئاستێکی وجودیانە: سەپاندنی بوونی خۆی بێت بەسەر بەرامبەردا (آخر)، [وەک کێشەی نێوان (سید/عبد) لای (هیگل)] (گۆڤاری گوتار- ژمارە-١- گوتاری مانەوە/شکستی دەسەلات) ئەوا لێرەوە ململانێکە لە ئاستی مێژوویی‌دا دەچێتە قۆناغێکی نوێوە کە ئەویش سەلماندن و سەپاندنی پرنسیپی جیاوازی‌یە لای کۆمەڵێک بەرامبەر کۆمەڵێکی تر حەتمەن دواجار مەبدەئی جیاوازی خۆی دیسانەوە لەپێناو سەپاندندا. مەبەستی سەرەکی ئێمە وەستانە لەبەردەم ئاستی دووەمدا، کە ئاستی مێژوویی‌یە ودلێردوە بەبروای من (ناسنامە) زیاتر وەک خەسڵەتێکی مێژووی دەرکەوتووە، وەدواجار مێژووش گوزارشت لە کۆی ئیشکالە وجودی‌یەکان دەکات، بەلام بیرمان نەچێت کە مێژوو هەمیشە دەیەوێت حەقیقەتە وجودی‌یەکان بشارێتەوە، بەو واتایەی مێژوو ئەو رووبەرەیە کە مرۆڤ تیایدا پیادەی پرسیارە وجودی‌یەکانی خۆی ئەکات بەلام بەدنیایەک دەمامکی جیاواز و لە رێگای چەندان ئایدۆلۆژیای جیاوازەوە، چونکە وەک پێشتر وتمان توانای مرۆڤ دیاری کراو و سنووردارە لەبەرامبەر پرسیارە میتافیزیکی‌یەکاندا، بۆیە ئەم توانایە وەرگێرا بۆ ناو ئاستێکی تر کە مێژووە وەرەنگە زیادەرۆیی نەبێت گەر بڵێین خەونی بەشەریش بۆ ئەوە بووە: تا بتوانێ پیادەی هێزێکی زیاتر بکات، وەک حەزی ...

رووبەرێکیش هاتووە کە تیایدا کاری رێکخستنی بەشەری تیا ئەنجام ئەدرێت، مەبەستم لە رێکخستنی بەشەر، دوورخستنەوەیەتی لە فەوزا. بۆیە دەبێت جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە سەرەتاییە بکەینەوە کە بێگومان بڵێین خەونی مرۆڤ بۆ مێژوو پەرچەکدارێک بووە لەبەردەم پرسیارە ئەزەلییەکاندا، بەڵام دواجار هاوکێشەکە گۆڕا و پێچەوانە کەوتەوە، بەو مانایەی هەرزوو ئەو خەونە سەرەتاییەی مرۆڤ لەبارچوو، چونکە خەونەکەی گۆڕا بۆ رێگەگرتنو بەرەنگاری بوون. بەواتای رێگەگرتن لەو تراژیدیا خوێناویانەی کە مێژو ئەیخولقێنێ (وەک بەرفراوان بوونی هێزی شەڕ و شەرانگێزی).

گەر بچینەوە سەر ئەو پرسیارەی پێشتر رامانگەیاند و وتمان ئایا مێژوو لەم بابەتەی ئێمەدا چییە؟ جەتمەن مەبەستی من هەیمەنەتی هێزی مێژووە، وەلەهەمان کاتدا مەبەستم لەو مرۆڤەیە کە دواجار کەوتۆتە ژێر جەبرییەتی مێژووەوە، (مەبەستمان لە جەبرییەتی مێژوو ئەوەیە کە بۆنمونە: (مرۆڤێک کاتێ بەزمانێکی دیاریکراو قسە ئەکات. وەک چۆن پیادەی ئاکارێکی دیاریکراویش دەکات، ئەمە لەخۆیدا ملکەچکردنە بۆ هێزی مێژوو)، بەو مانایەی بەشەر دەستی نییە لە هەڵبژاردنی نەژادی خۆی) بەبڕوای من پێویست ناکات بگەڕێینەوە سەر ئەو وتوو وێژو ئەتروحە زانستیانەی دەست نیشانی فاکتەرەکانی دەکەن، چونکە ئەمەدەمانباتەوە بۆ ناو وتوویژێک کە زۆر ئەستەمە ئێستا ئێمەبتوانین قسەی لەسەر بکەین، بەڵام ئەکرێ بڵێین: گەر گەرانی مرۆڤ لە جەوهەری بووندا، گەڕان بێت بەدوای ماهیەتی بوونیدا، ئەوا گەڕانی لە مێژووشدا گەڕانە بەدوای هاکانیدا بەهایەک لەلایەک وەک ئەلتەرناتیفی ئەو ماهیەتەو لەلایەکی تریشەوە وەڵام دانەوە بێت بۆ مەبەست گەراییەکانی.

گەر لە تێڕوانینی (هیگل)ەوە، مێژووی بەشەرییەت بریتیبێت لە مێژووی فکر..! ئەی ئایا مێژووی ئێمە بریتییە لەچی؟ رەنگە ئەم پرسیارە تا رادەیەک پرسیارێکی تەقلیدی بێت بەڵام بەنیسبەت بابەتەکەمانەوە جێگەی گرنگی پێدانە. لای (هیگل) مێژو بریتییە لە یەکگرتنی (فکر و واقع) کە ئەکرێ ئێمە لەژێر دوو ناوی تردا وەری بگرین کە ئەویش ئاستی (ئاخاوتن و کردارە).

رەنگە هەڵە نەبین گەر بڵێین: تاوەکو ئەم ساتەوەختەش مێژووی کورد بریتییە لە مێژووی کردار (مەبەستمان لەناوبردنی مێژوو لێرانەدا بەمانایەکی ئۆرگانی نایەتەوە) بێگومان کاتێ (گۆتە) ئەڵێ: (سەرەتا فعل بوو) بەواتای لەسەرەتادا ئێمە لەبەردەم کرداردا بووین نەک ئاخاوتن، چونکە تەمەنی کردار لە تەمەنی ئەخاوتن کۆنترە بەم مانایەی تاوەکو هەنووکەش پیادەی کردار ئەکرێت، واتە تاوەکو ئێستاش بەشێوەیەکی گشتی کردار لای مرۆڤی کورد نەچۆتە ژێر باری ئاخاوتنەوە؛ بۆیە ئێمە لێرەوە ئەکەوینە بەردەم تۆزێک لە کرداری پیادەکراو کە لەناو مەرجەعێکی سەرەتای ناعەقڵانی بەوە دبێتە

دەرێ. ئەم پەیوەندییەی نێوان ئاخاوتن و کرداریش پەیوەندییەکی جەوهەریو نۆرگانییە، وەئەم دوو ئاستە لە کاتێکا ئەتوانن بیناى پرۆژەیەک بکەن کە یەکیان گرت، چونکە ئەساسەن ئەم یەکگرتنە جارێکی تر ئاستی کردار ئەگوازێتەوە بۆ ناو پرۆسەیەکی تیۆری، بۆ نمونە کاتێک توندو تیژی ئەخرێتە ژێر کۆنترۆلی یاساوە بەمانای کردار ئەخرێتە ژێر باری ئاخاوتنەوە. ئەمەش بەمانای بەعەقلانی کردنی کردارێک دێ (کە توندو تیژییە)، وەک لای (بالاندیە) یان (هۆبز) کە ئەبەسترێتەوە بەدەسەلاتو دەولەتەوە. ئێمە لێرەوە ناچینە سەر ئەو رەخنانەی ئاراستەی دەسەلات دەکرێت، تاوەکو ئەو رەخنانە ئامادە کەینەوە کە ئاراستەی عەقلانیەت کراوە، چونکە لە باسەکەمان دەردەچەین، ئەوەی مەبەستی ئێمەیە ئاشکرا کردنی چۆنیەتی پەیوەندی هەردوو ئاستەکەیە.

لەڕاستی‌دا دەبێت ئەوەش لەبیر نەکەین لەکاتێکا ئێمە ئەم وتووێژانە ئەکەین کە بەر لە ئێستا و تا ئەنووکەش جاری کۆتایی و مردنی زۆر شت لێ‌ئەدرێت هەروەک (خواوەند) لای (نیتشە) و مرۆڤ لای (فۆکۆ) و (مێژوو) لای (فۆکۆیاما) بەلام لەڕاستیا ئەمە ناگاتە ئەوەی کە بەدوای ئەو بەها دۆڕاوەی خۆماندا ئەگەڕێین، وەئەمە بەمانای سڕینەوەی پرسیاری ئێمە نایەت گەرچی دەبێت ئەوەش بزانین کە چەندێک لەدەرەوەی مێژوودا بین وە چەندێکیش کەنار گیر بین، دواجار گەر ئەم دەستەواژەیە دروست بێت.(ئێمە پاشکۆیەکین) ناچینە دەرەوەی قەوارەی بەشەری بەلام ئەشێ لەژێر ئیرادەی ئەو ژیارییەدا بمێنینەوە. ئەوەش هەر بەمانای قەدەری ئێمە دێت. دەبێت ئەو حەقیقەتە بڵێین: کە کۆمەڵگای کوردی بەدرێژایی تەمەنی بەشەرییەت لە مێژوو ئەترسێ! وەئەم ترسەش ئەگەڕێتەوە سەر ئاکارێکی تایبەتی ئەم کۆمەڵگەیە وەک چۆن پێشتریش وتمان تاکو ئەم ساتەوەختەش لەناو رووبەرێکی بەرفراوان لە کرداردا دەژی لە دەرەوەی ئاخاوتن، جگە لەوەی هەمیشە مەیلێکی بۆ ناو مێژوو هەیە بەلام پاشەکشێ کردنەکانی زۆر لەو مەیلە گەورەتر و زۆرترە.. وەلەڕاستی‌دا ئەو کاتەی پاشەکشێ دەکات بەواتای بەهیچ جۆرێک باوەڕ بە مێژوو ناهێنێ، چونکە ئەگەر لە ساتێکدا باوەڕمان بە مێژوو هێنا ئەوا دەبێت باوەڕیش بەوە بهێنین: کە ئەو ئاکارەی لەسەدەیەکدا خاوەنین لەسەدەیەکی تردا ئەیدۆڕێنین، بۆ ئەمەش لەم رووەوە مرۆڤی کورد تارادەیەکی زۆر پارێزگارە (محافظ)؛ بۆ ئەوەی ئەم روانینەمان فراوانتر بکەین، دەچینە سەر ئەوەی کە بڵێین: باوەڕ نەهێنانی کورد بە مێژوو باوەڕ نەهێنانە بە (کتێب)؛ (وەمەبەستمان لە کتێب پرۆسە ذهنییەکانی بەشەرە لە چوارچێوەی کیتابەدا)؛ بۆ زیاتر ئاشنا بون بە دەستەواژەی (ترس لە مێژوو) ئەچینە ناو پەیوەندی مرۆڤی کورد بەڕابردووەوە؛ وەک ئەوەی (شتراوس) ئەڵێ: (سروشت) بە شێوەیەکی

تایبەتی ئەو بوارەیە کە مرۆڤ لێوەی رادەمێنێ و لە رێگەیەوە پەیوەندی بە باپیران و روحەکان و خواکانەوە دەکات)- مقالات في الاناسة/ کلود لیڤی شتراوس- ت: د. حسن قبیسي، ص١٥٢- دار التنویر- لبنان ١٩٨٣- ئەم روانینەی (شتراوس) تا ئەو رادەیە راستە کە (ئاخاوتن)/ یا (کتێب) ئەبوو بووە ناوەندێکی سەرەکی بەرفراوان بۆ پەیوەندی کردن بەرابردووەوە، ئەگەر چی ئەم تێگەیە لەخۆیدا رۆچوونە بۆ ناو ئایندەش. بەڵام لەلای مرۆڤی کورد تاوەکو هەنووکەش (سروشت) تاکە ناوەندێکە بۆ پەیوەندی کردن بە شێوەیەکی گشتی نەک (کتێب). چونکە (کتێب) ئەو ناوەندەیە کە لێوەی پەیوەندی بە کلتوورەوە (Tradition) دەکرێت، وەئەمەش بەو مانایە نایەت کە توانای تیادا نەبێت لێوەی پەیوەندی بە پاشەرۆژەوە بکرێت. چونکە بۆ زیاتر روون کردنەوە پێم باشە پەیوەندی نێوان (ئاخاوتن و کردار)مان لەبیر نەچێ کاتێ رووبەرووی ئەم پەیوەندییە ئەبینەوە. لە میانەی پەیوەندی مرۆڤ لەرێگەی سروشتەوە. ئەمانگەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی کە چ ئاخاوتن یا چ کتێب هیچ جۆرە متمانەیەکی نی‌یە، چونکە گێرانەوەی دیاردە سروشتی‌یەکان بۆ هێزێکی نادیار. واتە متمانە نەکردن بە زانست کە توانایەکی مرۆیی‌یە؛ بەم پێیەش بڕواهێنان بە کتێبە دنیایی‌یەکان تا رادەیەکی زۆر بڕواهێنانە بە ئیرادەی مرۆڤ نەک ئیرادەیەکی نەبینراو. مەبەستمان لە ئیرادەی مرۆڤ ئەو ئیرادەیەیە کە (نیتشە) ناوی ئەبات. وەوەکو ئەوەی (فرانسۆ شاتلی) دەڵێ: (مەبەستی نیتشە تەواو مەبەستێکی ویرانکەرانەبووە بەڵام ویرانکردنی ئەوهامەکان کە بەجیهانی هاوچەرخەوە لکابوو. ویرانکردنی هێزی کۆنخوازی ئەو هێزەی دژ بە هێزی چالاک بوو) (-عدد-٦- العرب و الفکر العالمي- الحداثة في الفلسفة- فرانسو شاتلي- ت: ص٣٧- مرکز الانتماء القومي بیروت/ ١٩٨٩) لەراستیدا مەبەستی (نیتشە) و پەیامەکەی گێڕانەوەی هێز بوو بۆ ئیرادەهەروەها گێڕانەوەی جەوهەر بوو بۆ ناو ژیان، وەک ئەوەی مەبەستی سەرەکی ئێمەش لەم باسەدا بەتایبەتی کاتێک مێژوو دەکەینە بابەتی قسەکردن، دابەزینە بۆ ناو ژیان. لەراستیدا ئەم قەیرانە زۆر گەورەتریشە کە ئێمە باسی دەکەین چونکە تاوەکو ئەم ساتە وەختەش ژیان لەناو کۆمەڵگای کوردیدا لەدەرەوەی هەمو راڤەکردنێکی زانستی‌یە. بەو پێیەی کە بڕوا نەهێنان بەزانست واتە بڕوابوون بە خورافیات. لێرەشەوە جێگەی (ئاین) لە غیابی شوێنی (زانست)دایە. بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم ناواخنە: دەبێت جەخت لەسەر ناوەندێتی و توانای هێزە تەقلیدی‌یەکان بکەینەوە لەو رێگەیەوە کە ئەشێ بڵێین تاهەنووکەش (خوێندن) نەبۆتە پرۆژەیەکی جەوهەری، بەڵکە بەتەنها وەک کارێک پیادە دەکرێت. کە هاوتە بای زانین ناودستیتیەوە، ئەمەش بە رادەیەکی زۆر دەگەڕێنەوە بۆ ئەو بنەما تەقلیدی (Imitative)یەی لەپشت مانای خوێندنەوەیە لەراستیدا (خوێندن) ناتوانێ

پیادەی کەمترین توانا بکات؛ بۆیە بەهیچ شێوەیەک نەیتوانیوە ئەو راڤە تەقلیدی و سەلەفیانە بگۆڕێت کە لەهەمان کاتدا پڕ چەکن بەمەرجەعێکی دینی لە راڤەکردنا بۆ دنیا. بۆیە مردنی خەسڵەتە جەوهەری و سەرەکی‌یەکانی مانای خوێندن بۆتە هۆی زیاتر بالادەست بوونی راڤە تەقلیدی‌یەکان کەچوارچێوەی راڤە سەرەتایی‌یەکان تێناپەڕێنێ بەم واتایەش ئەشێ بڵێین: هیچ مەبەست گەرایی‌یەکی ستراتیژی لەپشت خوێندنەوە نی‌یە. بۆ نمونە تاوەکو ئەم ساتە وەختەش (باران بارین) یەکێکە لەو دیاردە زۆر باوە کۆمەلایەتی- دینی. یانەی. راڤەکردن کە بە (رەحمەتی خواوەند) ناودێر ئەکرێت؛ کەواتە دەبێت بپرسین ئایا دەبێت ئەرەکنو مەبەستی خوێندن چی‌بێت؟ کە ناتوانێت راڤەیەکی خورافی و سەرەتایی بگۆڕێت بەراڤەیەکی زانستی؛ لەڕاستی‌دا گەرچی خوێندن زۆرترین و گەورەترین شەریحەی کۆمەلایەتی لەخۆی کۆئەکاتەوە. بەلام خوێندنگاکان هەر لە سەرەتاوە ماڵێکی ترن. وێرانترو خوێناوی تر لەماڵەکانی خۆمان. هەر لە هەلگرتنی وێنەی باوکەوە لای مامۆستا تاوەکو ئەوەی قوتابخانە دەبێتە دەزگایەک بۆ ئەشکەنجەدان. چونکە گەر ئەو دەستەواژەیەی پێشوومان بەپرسیار بکەینەوە دەبێت بپرسین: چ بەهایەک لە کۆمەڵگای کوردی‌دا هەیە لەناو ئاکاری کۆمەلایەتی‌دا لەبار ئابرێت؟ لێرەوە رۆڵی مامۆستا لە زانینەوە دەبێتە رۆڵێکی زیاتر ئیداری یا رۆڵێکی زیاتر پۆلیسی گەر دەروست بێ دەڵێین (چاودێر) بەو مانایەی سەر لەنوێ ئەرکێکی کۆمەلایەتی دێنێتەوەو پیادەی دەکات بۆیە ئەم شەریحەیە لاوازترین شەریحەیە. بەو مانایەی (خوێندن) لەخۆی‌دا نەبۆتە پرۆژەیەکی رۆشنەگەری. بۆیە نەک (خوێندن) نەیتوانیوە کۆتایی بە خورافیات بهێنێ بەڵکە توانایەکی زیاتر و نوێشی کردۆتەوە بەر خورافیات. چونکە ئەساسەن خوێندن نەبۆتە ئەو پرۆژەیەی کە ئەکوکی‌یەکانی خۆی لەگەڵ شێوەی خورافی و تەقلیدی‌دا بەشێوەیەکی پیادەکراو فڕێ بداتە ناو بونیادی کۆمەلایەتیمانەوە، بەم پێیەش تاڕادەیەک خوێندن هاوتەبای هێزە تەقلیدی‌یەکان کارئەکات. لەڕاستی‌دا ئەمەش رووبەڕوی چارەنووسێکی ترسناکمان دەکاتەوە. کە رەنگە بەوپەڕی نیگەرانی و نائومێدی‌یەوە بڵێم (رۆژهەلات بووەتە بەهەشتی سەلەفی‌یەت). لەڕاستی‌دا هێز و توانای چالاکی دەزگاکانی ئاین وەک (مزگەوت) زۆر فراوانتر و بەهێزترە لە توانای (خوێدن) کە دەزگایەکی زانستی‌یە، بەبڕوای من تاوەکو سمبولەکانی خوێندن نەگۆڕێ، مەحالە (خوێندن) بتوانێ میکانیزمی ئیشکردنی خۆی بگۆڕێ. چونکە لەڕاستی‌دا هێندەی (خوێندن) وەک دەزگایەکی قەمعی ناودێر ئەکرێت، هێندە مەبەستگەرایی‌یەکانی ئاشکرا ناکرێت. دەمەوێت بەو نمونەیەی پێشتر باسمان کرد. یادتان بهێنمەوە کە (گێڕانەوەی باران بارین بۆ ئیرادەی خواوەند) لەخۆی‌دا جۆرێکە لە پەیوەندی کردن لەڕێگەی دیاردەیەکی

سروشتەوە، وەک ئەوەی لای (شتراوس) ناومان برد، ئەمەش بەو مانایە دێت کە چ (خوێندن) یا (زانست) یا (ئاخاوتن)کە سەر بەرەگەزی (کتێبن)دەکەونە دەرەوەی سیستمی راڤەکردن لای ئینسانی کوردی.

لەڕاستی‌دا کاتێکیش ئەم بۆچوونەی ئێمە هەڵ دەوەشێتەوە کە لەپاڵ ئەوراڤە سەلەفی و تەقلیدییانەدا، راڤەکردنی دژوار لەئارا دابێت بەشێوەیەکی گشتی. وەلابوت رەچاوی ئەوەش دەکەین کە لە فکری خۆرئاواش‌دا راڤەکردنی لەم جۆرانە هەیە، بەڵام لەگەڵ گەشەکردنی راڤەی زانستی‌دا. راڤە تەقلیدی‌یەکان کەوتنە قەیرانەوە.ئێمە لەو بڕوایەدا بووین کە ئینسانی کورد باوەڕ بە کتێب ناهێنێت، بەو مانایەی کە باوەڕی بەئیرادەی مرۆڤ نی‌یە، کەواتە ئەکرێت بڵێین (خوێندن) تەنها ئەرکێکی کۆمەڵایەتی‌یە کاتێک پیادە ئەکرێ]، وەلە هیچ ئاستێکی توانا و هێزدانی‌یە، چونکە راڤەکردنی خوێندن لەناو راڤە تەقلیدی و دینی‌یەکەدا مانایەکی نی‌یە، حەتمەن هەتا ئەمڕۆکەش حیکمەتەکانی خوێندن زۆر بچووکترن لە چاوە ئەرشەرەکانی باپیرانمان‌دا، وەک چۆن مەزاری شێخەکان پیرۆزتر و کاریگەرترە لەچاو لابورێکی پزیشکی‌دا. رەنگە هەڵە نەبێت گەر بڵێین (ژیان) لەناو بوونی‌یە تەقلیدی و دینی‌یەکان‌دا لەئاستێکی ئۆرگانی‌دا نی‌یە، بۆیە ئەشێ ئەم ساتەش بە ئاستێکی ناعەقڵانی ناوبەرین، وەئەم ئاستەش ئەو ئاستەیە کە زانست بەتایبەتی کتێب بە گشتی تیایدا بە لەعنەت دەکرێت چونکە نابێت لەیادمان بچێت کە زانستیش لە ئاستێکا کار ناکات گەر زەمینەیەکی تەواو ئۆرگانی نەبێت، وەئەمەش پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە کە خۆرئاوا روبەڕووی بوویەوە. ئەو زەمینەیەی کە خۆرئاوا تیایدا بڕوای بەهێز و ئیرادەی مرۆڤ هێنا وەک چۆن متمانەی تەواوی بە زانست کرد، وە وەک ئەوەی بەردەوام دەر ئەنجامە زانستی‌یەکانیشیان دەخەنەوە ژێر ئەشتەرگەری نوێ بەبڕوای من فاکتەرێکی زۆر ناعەقڵانی و ترسناک لەپشت ئەم بۆچوونە سەلەفی‌یەوە هەیە کە پشت ئەستورە بە مەرجەعێکی دینی کە (ئیسلام)ە، وە زۆرینەی راڤەکانی خۆی لەو مەرجەعەوە دێنێتە دەرێ، حەتمەن ئەو مەرجەعە دینی‌یەش لەسەر ئەساسی دەوالیزم (دوانەیی) پێک هاتووە، وەبەم پێیە ئەو فاکتەرە ترسناکە ئەو بۆچوونەیە لەلای کۆمەڵگای کوردی کە بڕوای وایە بەتەنها (دین) ئەتوانێ پارسەنگی‌یەکی گشتی رابگرێ لەسەر هەمو ئاستە جیاوازەکانی پەیوەندی بەتایبەتیش لەسەر ئاستی ئاکار و بەها، واتە رێکخستنی خۆی دەبەخشێتە دین، ئەمەش بەو مانایە دێت کە ئەگەر لۆژیکی دین لەدەست بدەین ئەوا کۆمەڵگا بەرەو فەساد و لادان لەئاکار دەچێت؛ لەڕاستی‌دا گەر بەشێوەیەکی گشتی ئەم بڕوایە هەڵەیە و لەناو جەرگەی سەلەفی‌یەتەوە گوزارشت لەخۆی دەکات. چونکە دەبێت لەوە بگەین کە لۆژیکی دین لۆژیکی ئاکارە (بۆ نمونە ئازادی پابەندە بە ئاکاردوە. ودسەرجەم چەمکە مرۆیی‌یەکان

پابەندد بە ئاکاردەرە ) لەم رووەشەوە ( ئاکار ) گوزارشت لە کۆی چالاکییە مرۆییەکان دەکات، وەلەڕاستی‌دا ئەم بڕوایەش خاوەن هێزێکی میتافیزیکی شاراوەیە بۆیە بە ئاسانی گەمارۆی توانا بەشەرییەکان دەدات. بەڵام دەبێت ئێمە لەوە بگەین کە ئەگەر باوەڕمان لەسەر دنیا گۆڕا ئەوا بێگومان ردوشت و ئاکاریشمان ئەگۆڕێ، بەڵام تارادەیەکی زۆر بەهاکان جەوهەر و نرخی خۆیان لەدەست نادەن، چونکە کاتێک بەهاکان ئەدۆزێن کە کۆمەڵگا بەردو قەیرانێکی ئابووری بچێت، ( وەئەمە بڕوای پیاوێکی سەلەفییە کە وادەزانێ ئازادی فەسادی ئەخولقێنێ )، بۆیە لە واقعی کۆمەڵایەتی کوردی‌دا هەمو بەهایەکی ئینسانی و هەموو راڤەکردنێکی زانستی پێویستە مەرجی ملکەچی تێدا بێت بۆ ئاکارەکانی کۆمەڵگا، ئەمەش بەو مانایەی کە تواجار هیچ جۆرە هێزێکی چالاک توانای ئامادە بوونی نی‌یە غەیری هێزە کۆن خولزەکان، لێرەوەیە کە ( ئاکار ) دەبێت گرتاری باڵادار ( فوقی ) وەک چۆن چەمکی ( خێر ) لای ( ئەفلاتون ) لەسەرووی هەموو شتێکی ترەوە نیشان ئەدرا، ئاوەهاش ( ئاکار ) کە ئامێتەیەکی دینی و کۆمەڵایەتی‌یە گەمارۆی مانا زیندەگی‌یەکانی ژیان دەدات.

لێرەوە دەمەوێت بچمە سەر بەهای تەقلیدییەت لە واقعی کۆمەڵایەتی کوردی‌دا، لەبەردەم چەمک و مانا نوێخولزەکاندا، یا ڕاستتر بڵێم لەبەردەم رەوتی نوێگەریی‌دا: ئەوەی ئاشکرایە لە زانینی ئێمەدا ئەوەیە: کە نوێگەریی سەر بەرەگەزی فەرهەنگی خۆرئاوایە؛ مەبەستمان لە نوێگەری دوور لە هەموو پێناسێک ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە بە درێژایی مێژوو، سەرجەم وزەو هێزە مادی و مەعنەوی و فکرییە بەشەرییە هەمە چەشنەکان- عەقڵی خۆرئاوا پەی پێبردووە و ئاشکرای کردووە، وەئەمەش ئەو دەرئەنجامەی ( فۆکۆ ) مان یاد دێنێتەوە کە ئەڵێ: [دەسەڵات لە کۆمەڵگای ئەورووپی‌دا گەشەی کرد بەردو شێوەکانی سەنتەریزم] ( عدد- ٤٣ الفكر العربي المعاصر- نحو نقد العقل السياسي- ميشال فوكو- ت: جورج ابي صالح- ص ٥٢/ مركز الانتماء القومي- بيروت ١٩٨٧ ) لەڕاستی‌دا لێرانەدا مەبەستم لە ئەرجسی‌یەتی دەسەڵاتە لەناو فکری خۆرئاوادا، چونکە ئەو گەشەکردنە لەخۆی‌دا دەگەڕێتەوە سەر یەکێک لە فاکتەرە سەرەکی‌یەکان کە بریتی‌یە لە خاوەندارێتی دەسەکەوتە هەمە لایەنەکان، بەو مانایەی کەسەرجەم هێزە ئەمە چەشنەکان لەناو قەوارەی خۆرئاوادا کۆبوونەتەوە، بەم پێیەش دەبێت لەلایەکی ترەوە رەخنەکانی ( هابرمانز)مان لەبیر نەچێت کە بەبڕوای ئەو دەسەڵاتی سیاسی کۆنترۆڵی سەرجەم رووبەرە جیاوازەکانی ژیانی کردووە، لەو بڕوایە دام قەیراناوی ترین قەیرانی ئێمە لەڕێگەی ئەم رەخنەیەوە دەر ئەکەوێت؛ بەو واتایەی گەر دەسەڵاتی سیاسی کۆنترۆڵی هەموو هێزە جیاوازەکانی کردبێت، ئەی ئایا دەبێت

دەسەڵاتی سیاسی لەناو کۆمەڵگا تەقلیدییەکانی وەک ئێمەدا کۆنترۆڵی کام هێزە جیاوازانە بکات؟ دیویکی تری ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئایا دەبینێت دەسەڵاتی سیاسی ئێمە بە چ چەکێک، بەرەنگاری بەرامبەر (اخر) و - پارێزگاری لە ناسنامەی بوونی- خۆی بکات؟ لەڕاستیدا ئەمەش بەو مانایە نایەت کەوا تێبگەین دەستەیەکی بەشەریی نژایەتی دەستەیەکی تر بکات لەسەر ئەساسی دابەش بوونی رەگەزپەرستی، بەڵکە مەبەستمە بپرسم ئایا چ مەرجەعێکی سیاسی و فکری و تەقەنی لە پشت کیانی ئێمەوەیە؟ لەڕاستیدا ئەمە قەیرانەکەی ئێمە کە تووشی جۆرێک ئیزدیواجیەتی کردووین؛ لەلایەک لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پڕ چەکین بە هێزی خێڵەکی و سەلەفی،لەلایەکی دیشەوە لەڕووی سیاسییەوە تەنها دەمامکێکی شێواومان هەیە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ بەرامبەردا کە خۆرئاوایە بەشێوەیەکی گشتی. لەڕاستیدا دەبێت بزانین کە زیندووبوونەوەو تەشەنەکرنی سەلەفییەت لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا، وابەستەی گەشەکردنی گۆڕانە لە زەمینە جیاوازەکانی خۆرئاوادا؛ حەتمەن ئەمەش پۆزش هێنانەوەنییە بۆ فکری خۆرئاوا هێندەی واقیعێکی لەبەر چاوە. لەڕاستیدا هیچ شتێکی هێندەی دووبارەبوونەوەی رابردوو کوشندە نییە. چونکە قەیرانەکانی ئێستای خۆرئاوا هاوکاتی گۆڕانەکانیتی. بەڵام قەیرانەکانی ئێمە هاوشانی شکستە ئەمینەییەکانمانە. دەمەوێت بڵێم ئەو هێزانەی دەسەڵاتی سیاسی ئێمە کۆنترۆڵی دەکات تەنها هێزێکی عەقڵی و جەسەدییە، کە ئەمەش پشت ئەستورە بەسیستمی خێلەکیو مێژووی کردار دەسەلمێنێ بێئاخاوتن. لەکاتێکا خۆرئاوا زیاد لە هێزێکی لەژێر کۆنترۆڵ دایە، کە تەکنەلۆژیا دەرکەوتووترینیانە.

گوتاری ناسنامە بەو شێوەیە لە گوتاری نەتەوەگەرایی (ناسیونالی) جیا ئەبێتەوە کە زیاتر هەوڵ دەدات لەناو یەک بونیادی دیاریکراودا رانەوەستێتەوە. وەک ئەوەی جیاوازی و ناکۆکییەکانیشی بەتەنها ناگەڕێنێتەوە سەر بنەمایەکی رەگەزخوازانە. وەستەمەن گوتاری نەتەوەیی/ ناسیونالی. بەرادەیەکی زۆر گوتارێکی سیاسییە و گەمارۆی رووبەرەسیاسییەکان دەدات. ئەشێ بپرسین کە ئایا گوتاری ناسنامە کەلەسەر پرنسیپی جیاوازی پێک دێت دژ بە رەوتی هیومانیزم نییە؟ بەبڕوای من گەر چی هیومانیزم ئەو چەمکەیە کەدەیەوێت جیاوازی نێوان دەستە بەشەرییەکان و گروپە مرۆییەکان یەکلا بکاتەوە، بەڵام دواجار ئەگەردکانی بەردەم ئەم رەوتە زۆر کەمترن لە ئەگەرەکانی بەردەم پرنسیپی جیاوازی کە گوتاری ناسنامە گوزارشتی لێئەکات. بەبڕوای من ناسنامەی سیاسی کە زیاتر ناسیۆنالیزم ئەتوانێ گوزارشتی لێ بکات بەهیچ شێوەیەک دەلالەتێکی سلبی ناخاتەوە، چونکە چەندان رەهەندی جۆراوجۆری تر هەن لەناو کۆمەڵگادا کە لەدەرەوەی قەوارەی سیاسی کار ئەکەن وەک ناسنامەی رۆشنبیری.

لەڕاستی‌دا (ناسیۆنالیزم) تاکە مەرجەعە و تاکە دەروازەیە لەبەردەم کۆمەڵگای کوردی‌دا، چونکە ئێمە دەزانین کە (ئیسلام) ئەو چەکە گەورەیەیە کە هەمیشە (عەرەب) پرچەک ئەکات. وەلەڕاستی‌دا ئینتیما کردن بۆ ناسنامە ناگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری، چونکە وەک پێشتر ئاماژەمان‌دا وتمان کە بەشەر لەژێر جەبرییەتی مێژوودایە بۆ نموونە (قسەکردن بە کوردی جۆرێکە لە ملکەچی بۆ ئەو جەبرییەتە وەک چۆن ئینگلیزێکیش مەحکومە بە ئینگلیزیبوون) بەواتای ئێمە دەچینە دەرەوەی هەڵبژاردنی ڕەگەز و کۆمەڵگا، بۆیە ئەکرێ بڵێین ناسنامەی سیاسی لەسەر ئەساسی ئەم جیاوازی‌یە بینا بووە، وەئێمەکاتێک ئەتوانین بزانین ئینتیماکردن بۆ ناسنامە دژ بە هیوانیزمە یانەء! گەر لەبەردەم ئەزموونێکی دیاری‌کراودا بین. واتە ئەزموونێکی دیاری‌کراو ببێتە بابەتی قسەکردنمان، چونکە ئەساسەن ئەو گوتارەش گوتاری کۆمەڵەیەکە کە دەیەوێت بوونی خۆی بسەپێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەرجەع و ئەهجە جیاوازەکان ئاسۆی وەڵامەکانی ئێمەش ئەگۆڕن.

بەڵام لەبیرمان ئەچێ کە ئێمە لەژێر جەبرییەتێکداین کە تارادەیەکی زۆر چارەنووسمان وابەستەی چارەنووسی بونیادە کە (لێرەدا مەبەستم کۆمەڵگا تەقلیدی‌یەکانە)؛ بەبڕوای من گوتاری ناسنامە لە زەمینەیەکی سیاسی دا؛ گوتاری کائینێکە کە دان بە بونیا نانرێت، مرۆڤی کورد ئەو نموونە لەبەر چاوەیە کە تامەنووکەش مانایەکی‌نی‌یە بۆ بوونی خۆی، لەڕاستی‌دا کاتێک عەقڵی سیاسی کوردی بەشێوەیەکی گشتی کە ناتوانێ گوزارشت لە ناسنامەی سیاسی بکات، ئەمە لەوەوەیە کە کە پڕ چەک نی‌یە بەهیچ جۆرە هێزێک بەو مانایەی ناتوانێ گوزارشت لە بوونی کۆمەڵگایەک بکات؛ بەبڕوای من ئەوەندەش بەسە گەر خۆمان ڕووت بکەینەوە لەسەرجەم چەمک و ماناکان وەبەتەنها وەک بوونێکی ڕووت بمێنینەوە. ئایا دان ئەنان بەم بوونەدا لەخۆی‌دا کێشمەکێشێکی بەشەری‌نی‌یە؟ لەو بڕوایەدام ڕەهەندی سیاسی بەتەنها جومگەیەکی مەبەستەکانمانە؛ چونکە گەر گوتاری ناسنامە لەسەر ئاستی سیاسی هەوڵ بدات سەرجەم کێشمەکێشم و ناکۆکی‌یەکانی ناو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆی بشارێتەوە بەمەبەستی دواندنی بەرامبەر (آخر) ئەوا لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی بەگشتی هەمیشە هەوڵ دەدات ناکۆکی‌یەکانی خۆی ئاشکرا بکات. چ لەبەردەم خۆی‌دا، یا لەبەردەم بەرامبەردا (آخر).

لەڕاستیش دا ئەم ئیشکالانە چەندێک دەگەڕێتەوە بۆ ئیشکالی مێژوویی، ئەوەندەش دەگەڕێنەوە بۆ ئیشکالی ئەنتۆلۆژی. یا بە گوزارشتێکی تر ئەشێ بڵێین: بوون بەشدارە لە ئەفراندنی ئەو ئیشکالە مێژوویانەدا، وەک چۆن فاکتەری جەوهەرییەتی. بە بڕوای (کلاستەر) ((لەسەر شعوبی سەردتایی) [جەنگ ئەداتی پاراستنی (ناسنامە) بووە.

بەمانای هیچ کۆمەڵێک هەست بە یەکێتی و جیاوازی خۆی ناکات ئەگەر نەکەوێتە ململانێوە لەگەڵ کۆمەڵەیەکی تردا] (عدد- ٣٣- ٣٤- الفكر العربي/ الهوية- الثقافة- السياسية- (من منظور انثروبولوجي) علي حرب ص ٩٩/ معهد الانتماء القومي- بيروت- ١٩٨٣ ) لەڕاستیدا ئەم بۆچوونەی (کلاستەر) جەخت کردنە لەسەر مەبادیئی جیاوازی، کاتێ لەرێگەی شەڕەوە گوزارشتی لێئەکرێ]، تاوەکو لەلایەکەوە جیاوازی خۆی بگەیەنێت وەلەلایەکی تریشەوە شەڕ بکاتە رووبەرێکی هاوبەش لەناو کۆمەڵەکەیدا، ئەمەش هاوکاتی مەبەستەکانی ئێمەیە بۆیەنیشاردەتمان پێدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەوێت ئاماژە بەوە بدەم کە ئەم بۆچوونەی (کلاستەر) ناتوانێ لەڕوبەرێکەوە خۆی بگوازێتەوە بۆ رووبەرێکی تر، یا بەدەستەواژەیەکی تر: ئەم بڕوایەی (کلاستەر) تاڕادەیەکی زۆر دەلالەتێکی سیاسی لەخۆی ئەگرێ و ناتوانێ لەزیاد لە دەلالەتێکا خۆی بنێنێتەوە. بەڵام ئەکرێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە چەندێک فاکتەرە ئابووری و سیاسییەکان بەشدار بن لە جوڵاندن و خەڵقکردنی مەبدەئی جیاوازیدا، ئەوا بێگومان پرنسیپی جیاوازی کە دەلالەتێکی سەرەکی (ناسنامە)یە لەپاڵ ململانێ وجودییەکان دا لەقەوارەیەکی گەورەتر و روبەرێکی فراوانتردا بڵاوئەبنەوە لەسەر ئاستی مێژوو. بەڵام هەمیشە حەقیقەتی ئەم فاکتەرانە ون ئەکرێن و دائەپۆشرێن ئەویش بەهۆی ئەو فاکتەر و قەیرانانەوە کە بەشەرییەت بۆ خۆی خوڵقاندویەتی؛ بەبڕوای من ئەو بۆچوونەی (کلاستەر) ئەو کۆمەڵگایانە ئەگرێتەوە کە جەنگێک ئەکەن کە توانای دامەزراندنیان لەدەست نەدابێت چونکە لەزانینمانا نامۆنییە کە (کورد) بەدرێژایی مێژووی بەشەرییەت جەنگاوەرێکی هەمیشەیی بووە. بۆیە گەر دروست بێت ئەوا ئەڵێم: (کورد خاوەنی گەورەترین و دەوڵەمەندترین ئەرشیفی خوێنە) بەڵام دواجار شەڕێکی نییە لەپێناو دامەزراندنی خەونێکا، هێندەی خاوەنی ئەرشیفێکی خوێناوی شەڕە لەپێناو وێرانکردنی خەونەکانیا، بەواتایەکی تر گەر بتانەوێت ئەڵێم (شەڕێکی نییە لەسەر ئەساسی دۆڕاندنی خوێن و بردنەوەی خەون) هێندەی خەونەکانی ئەدۆڕێنێ تاوەکو مێژوویەک بۆ خوێن تۆمار بکات (وەک شەڕی ناخۆی ئێستا و حزبە سیاسییەکانی ناو مەیدانی سیاسی لە کوردستانی باشوور) بەم پێیە (ئەخوێن لە مێژووی ئێمەدا گۆڕاوە بۆ خەون و ئەکردلریش گۆڕاوە بۆ ئاخاوتن). دەبێت لێرەوە بچینەوە سەر پەیوەندی نێوان تەقلید و نوێگەریی.. ئایا [پێکەوتن (التوفيق) لەنێوان تەقالید و تەقەنیەتدا مومکینە] ئەمە ئەو پرسیارەیە کە (شایگان) لەهەمان کتێبی ناوبراودا دەیکات (أوهام الهوية- ص ٢٥ ) مەبەستمان لە هێنانەوەی ئەم پرسیارەدا، سەرلەنوێ ئامادەکردنەوەی سیستمی تەقلیدی و سیستمی نوێگەرییە بۆ ناو باسەکەمان، کە زیاتر هەوڵی فراوانکردنی ئەو پرسیارەیە چونکە ئەم دوو سیستمە یەکێکیان پابەندە بە بەهاڕوحییەکان و ئەوەی دیکەشیان پابەندە بە بەها تەقەنییەکانەوە.

سەرەتا دەمەوێت ئەوە بڵێم کە کۆمەڵگای تەقلیدی (مەبەستم لەو کۆمەڵگایانەیە کە هەتا هەنووکەش وابەستەی کۆنترینو ئسوولیترین جۆری تەقالیدن لەچوارچێوەی سیستمێکی تەقلیدی دا) ئەو کۆمەڵگایەکە خۆی بەهاوپەیمانی هەموو کات و شوێنێک دەزانێ، چونکە ئەساسەن کۆمەڵگای تەقلیدی پشت ئەستورە بە بەباوەڕ و بنەمایەکی نەگۆڕ، نەگۆڕ بەو واتایەی کە لەخۆی دا ماهیەتی (ژیان) رەت دەکاتەوە وەک پرۆژەیەکی ئینسانی و عەقڵانی ئەشێ بەحوکمی چەشنێک لە پەیوەندی لەنێوان (کورد و ئیسلام)دا، بڵێین ئیسلام باشترین نموونەی پرنسیپە نەگۆڕەکانە، وەهەمیشە ئیسلام و هاوشێوەکانی ئیسلام دەیەوێت بەو مەرجەعە دینییەی خۆی هەمو ئایندە بخاتە ژێر رکێفی راڤەکانی خۆیەوە، لەراستیدا کاتێکیش ئەم تراژیدیایە رووی داو- روودەدات کە رەخنە کرایە دەرەوەی میکانیزمی بش کردنیانەوە (مەبەست: ئیسلام و هاوشێوەکانی ئیسلامە بەتایبەتیش لایەنی سۆسیۆلۆژی)؛ چونکە ئەساسەن ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە بڕوا بە ناکۆکی و ناتەباییەکانی خۆیان ناهێنن، وەبڕواش بە ناکۆکی خۆیان و دەرەوە ناهێنن وەک (ئاین لەبەردەم زانستدا) تا ئەو ئەندازەیەی کە دەسکەوت و راڤە زانستییەکانیش دەگەڕێننەوە بۆ ناو مەرجەعیە دینییەکە کە (قورئان)ە، رەنگە بشێت گەر بڵێین: تەبابوونی نێوان ئیسلام و کورد ئەگەڕێتەوە بۆ خاڵێکی هاوبەش کە ئەویش پرنسیپی نەگۆڕە، کورد بەتایبەتی لە ئاکاردا و ئیسلامیش بەتایبەتی لە راڤەکردن دا، لێرەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بڵێین: متمانە نەکردن بەزانست تارادەیەکی تەواو دەگەڕێتەوە بۆ رۆڵی نێگەتیڤانەی ئیسلام لەواقیعی کۆمەڵایەتیماندا. چونکە کۆمەڵگای تەقلیدیش هەمیشە شوێن تێوەرە تەقلیدی و سەلەفییەکان دەکەوێن، مادام حەقیقەتی دینی نەگۆڕو پیرۆزە، وەک چۆن ئاکار لای کۆمەڵگای تەقلیدی نەگۆڕ و پیرۆزە، کەواتە نەکرێ بڵێین هەموو بەها و هێزێکی خۆی لە رابردووەوە دێنێتە دەرێ، وەک چۆن لە راڤەکردنی دنیادا هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ سەر دەقەکانی رابردوو: لەراستیدا دەبێت ئەم هۆگرییەی کومەڵگای تەقلیدی بگەڕێنینەوە بۆ حضوری هەمیشەیی پرسیاری نوێو نەکراو، چونکە لەراستیدا هەڵەیەکی گەورەیە گەر وابزانین هەموو پرسیارە نەکراو نەزانراوەکان کە لەزەمەنێکی نوێدا رووبەروومان دەبنەوە، هاوتەبان لەگەڵ پرسیار و راڤەکانی رابردوودا. وەحەتمن دەبێت ئەو حەقیقەتە بدرکێنین: کە کاتێک بیری تەقلیدی نەتوانێ پێ بنێتە ناو ژیارێکی نوێوە، گەر پاشەکشێ لە بەها روحی و مەبدەئە نەگۆڕەکانی خۆی بکات.

بەبڕوای من لێرەوە ئەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەبڵێین پێکەوتن لەنێوان تەقالید و تەقەنیەتدا مومکین نییە لەناو یەک ساتی دیاریکراودا، بەتایبەتیش تەقالیدی رۆژهەڵاتی کە زیاتر وا بەستەی تەقالیدی دینی و مەزهەبییە.

ئەشێ ئەم کارکردە تەقلیدییانەی ئێستا بگەڕێنینەوە بۆ سەر مەرجەعێکی ناعەقڵانی، لێرەوە پێویستە بزانین مەبەستمان لە ناعەقڵانییەت چییە؟ لەڕاستیدا مەبەستم لە ناعەقڵانیەت: ئەو عەقڵییەتەنییە کە لەبەردەم چەمک و مانا نوێکاندا، تووشی قەیران و شکسشت هاتووە لەناو خۆیدا، بەڵکە مەبەستم لەو عەقڵیەتەیە کە باوەڕ بەهێز و ئیرادەی مرۆڤ ناهێنێ و تاوەکو ئێستاش وەک بوونەوەرێکی لاواز و بەرهەم هێنراو تێی ئەڕوانێ، بۆ نمونە پرسیاری کۆمەڵگای تەقلیدی بەتایبەتی کۆمەڵگای کوردی لەمردن.. ئەو پرسیاردیە کە لە دەرئەنجامدا بە پاشەکشێ کردن لە ماهیەتی ژیان دێتەوە ( مەبەستمان لە ژیان کۆی چالاکییە هەمەلایەنەکانە ) بەم پێیەش ژیان ناخاتە ژێر باری غەریزە و عەقڵ و ئیرادەی خۆیەوە، مەبەستمان لە جۆرێک لە عەقڵانییەتە، واتە بەعقلانی کردنی ژیان. هەروەک چۆن لەلای ( فرۆید ) جەستە لە حاڵەتێکی پەسەند نەکراوەوە، ئەگوازێتەوە، بۆ حاڵەتێکی پەسەند کراو، لەڕێگەی ئاشکرا کردنی چالاکییەکانی لاشعور و توانا غەریزییەکانەوە.یاخود وەک ئەوەی چۆن مرۆڤ لە کائینێکی بێدەنگەوە گۆڕا بۆ کائینێکی تسەکەر بەرهەمهێنراودوە بوو بە کائینێکی بەرهەم هێنەر، یاوەک وەرگێڕان و دابەزاندنی ئاستی هێز لە خواوەندەوە بۆ مرۆڤ لای (نیتشە ). ( ئەمانە هاوکاتی تێگەیەکی ( میشال فۆکۆ ) ن ) ئەمانە ئیشارەتێکی بچوکن بۆ سەر ئەو دەروازانەی خۆر ئاوا لێوەی تێکەڵ بەمانا جەوهەرییەکانی ژیان بووە.

لەڕاستیدا ئەوەی هەمیشە ئێمەی بەردو کەنارەکانی ژیانی بەشەری و شارستانیەت و... هتد، بردووە، پەنا بردنی ئێمە بووە بۆ سیستمی ئاکاری ( أخلاقي )، چونکە پێشتر جەختمان لەسەر ئەوە کردووە، کە تارادەیەکی زۆر پێکهاتە تەقلیدییەکان پڕچەکن بە ئاکارێکی نەگۆڕ چونکە تاکە شتێک کە مانا بۆ هێزد سەلەفی و تەقلیدییە مردووەکان ئەهێڵێتەوە. ئەو جوت بوونەیە کە لەنێوان ئاکارە نەگۆڕ و تێزرد رەها و پیرۆزەکاندا هەیە.

لێرەوە ئەو پرسیارە ئەکەین کە ئایا بونیادی تەقلیدی لە تواناییدا هەیە پرسیاری جیاواز و دژ بە بونیادی خۆی بەرهەم بهێنێ؟ بێگومان هەموو بونیادێک ئەو توانایەی هەیە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە دواجار ئەو پرسیارانە ئەگەڕێنەوە ژێر باری راقە تەقلیدییەکان، وەئێمە ئێستا نمونەی رۆشنبیری عەرەبیمان لەبەردەم دایە، کە ئەو پرسیارانە تا رادەیەکی باش بەرەو جەمسەری فکری جیاواز رۆیشتوون، وەتا ئەندازەیەک هەوڵ دەدەن دەمامکە پیرۆزەکانی ئاین داماڵن و بەتاڵی بکەنەوە؛ وەڕەنگە هیچ کارێکیش هێندەی ئەم کارە قورس و گران نەبێت، چونکە لەڕاستیدا لەناوبردنی مانا تەقلیدییەکان و تێکشکاندنیان کارێکی گرانە. بە حوکمی ئەوەی تا ئەمڕۆکەش واقیعی ژیان لە ژێر کۆنترۆڵی هێز و دەسەلاتی عەقڵە سەلەفییەکاندایە، بەو مانایەی کە تا ئەم ساتەوەختەش لە زۆربەی گەلانی رۆژهەلاتدا تەقلیدییەت خاوەنی هێزێکی

گەوردیە و توانای خۆی لەدەست نەداوە، ئەو پرسیارانەی ئێستا لەناو رۆشنبیری عەرەبی دا لە ئیسلام دەکرێت. لە چاخی ناوەڕاست بە دواوە ئاراستەی مەسیحیەت دەکرا، حەتمەن لێرەوە تێئەگەین کە غیابی هێزی رەخنە بە درێژایی چەند سەدەیەک بەنیسبەت رۆشنبیری عەرەبی‌یەوە بەتایبەتی. چۆن بۆتە هۆی مایەی کەڵەکە بوونی تەیرانەکان، چونکە ئەو پرسیارەی لە ساتی خۆی‌دا بەیان ناکرێ و ناخرێتە ژێر راڤەکردن و نێو لێکدانەوەوە، ئەوا بێگومان وەک برینێکی هەمیشەیی بەسەر لاشەی ئەو رۆشنبیری‌یەوە دەمێنێتەوە، بۆیە دەبێت دان بەو حەقیقەتەدا بنێین کە (ئەگەر رەخنە نەبوو، ئەوا بێگومان بەشەرییەت خۆی بەرەو فەیرانێک دەبات) چونکە هەردەم رەخنە گەمارۆی مانا تەقلیدی و سەلەفی‌یەکان دەدات (مەبەستمان لە رەخنەیەک نی‌یە کە پرچەکە بە چەمکە ئایدۆلۆژیەکان).

رەنگە زیادە رۆیی نەبێت گەر بڵێین گەورەترین تراژیدیای خوێناوی رۆشنبیری کوردی دەگەڕێتەوە بۆ دروست نەبوون و ئامادە نەبوونی هەمیشەی عەقلی رەخنەیی، کە بەلایەنی کەمەوە رەخنە شعوری کۆن و تەقلیدی‌یەکان بر بیندار ئەکات، ئەم برینەش وابەستەی قەیرانی دەکات. لێرەدا پرسیارێک روبەڕوومان ئەوەستێتەوە: گەر گوناهی هەموو تراژیدی و ناعەقلانی خۆمان بگەڕێنینەوە بۆ ناو بونیاد و لەو رێگەیەوە موحاسەبەی ئەو بونیادە بکەین، ئایا ئەمە لەخۆی‌دا شەرعیەتدان نی‌یە بە هەمو چەشنە لادانێک و هەڵە لە هەنوکەدا؟

لەو بڕوایەدام جەوهەرییەن ئەم پرسیارە زۆر دروستە، چونکە تارادەیەکی زۆر کێشەکانمان بۆ جیا ئەکاتەوە و لاشمان ئاسانتر ئەکات.. من لەو باوەڕەدام بەنیسبەت کۆمەڵگای ئێمەوە تارادەیەک ئەم پرسیارە ئەوە ناگەیەنێت، کە گێڕانەوەی کێشەکانمان بۆ ناو بونیاد ببێتە هۆی شەرعی‌یەت دان بەلادانەکانی کێشەی ئێستامان، چونکە لە واقیعی کۆمەلایەتی سیاسی و رۆشنبیری ئێمەدا، رۆڵی بونیادەکە سەر لە نوێ ئامادەکردنەوەی خۆی لە هەنووکەدا زۆر گرانترە لە واقیعێکی تر، چونکە ئێمە نەمانتوانیوە موفاصەلەیەکی زەمەنی لەناو مێژوودا پێک بهێنین، یاراستتر بڵێین: خاوەنی حوقبەی زەمەنی رۆشنبیری جیاواز.. جیاواز نین: جیاوازییەکە لێرەوەیە، ئێمە نکوڵی لەرۆڵی هەنووکە ناکەین لەسەر ئاستی بەشەری بەلام لەسەر ئاستی کۆمەڵگای کوردی نکوڵی لێ‌ئەکەین، بەو واتایەی چەمکە نوێکانی دنیای ئێستا (وەک بازاڕی هاوبەش- هەیبەتی قەوارەی سیاسی- دیموکراسیەت.. هتد) ئەتوان بەڕادەیەک کار لە ئێمە بکەن. بەڵکە هەندێ جار لەژێر باری ئەو کاریگەرییانەدا تەواو بزریش دەبین. بەلام هەمیشە ئێمە ناتوانین ئەو چەمکە نوێیانە بخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە و کاریان پێ‌بکەین. ئەمەش دەمانگێڕێتەوە سەر ئەو بڕوایەی کە هەمیشە مەحاسەبەی بونیادەکەمان بکەین لە هەموو ئاستە جیاوازەکاندا. بەلام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە دەست لە چاودێری کردنی هێزەکانی ئێستامان هەڵبگرین گەر هەر شێوەیەک بنوێنن.

لەڕاستی‌دا یەکێک لە میکانیزمە ترسناکەکانی سیستمی تایفەگەری، ئەوەیە کە هەوڵ دەدات هەمیشە دەسەلاتی سیاسی کە لە ئێستادا ماوشانی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی‌یە

بەرەو دەسەڵاتێکی تایفی بەرێت، بەم پێیەش ئەکرێت بڵێین کە سیستمێکی تەقلیدییە هەوڵ دەدات هەمیشە پرۆژەی دەوڵەت لەناو خۆیدا بتوێنێتەوە نەک بە پێچەوانەوە هەوڵی توانەوەی بنەما تەقلیدییەکانی خۆی بدات لەناو دەوڵەتدا، هەروەک (برهان غلیون) دەڵێ: [سیستمی تایفی دوژمنی یەکەمی بیرۆکەی نەتەوەییە] (نظام الطائفية) من دولة الى قبيلة- برهان غليون/ مركز الانتماء القومي/ بيروت- ١٩٩٠) لەڕاستیدا هەمو دەسەڵاتێکی سیاسیش لەناو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا مەرجە هاوپەیمانی بیرۆکەی نەتەوەیی بێت، بەڵام دوور لەمانایەکی دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی، بەڵکە لەپێناو مسۆگەرکردنی قەوارەیەکی سیاسی.

لەڕاستیدا لەهەنووکەدا زۆرینەی هێزە کوردییەکان لەسەر ئەو سیستمی تایفییە کار ئەکەن. چونکە پێکهاتەیەکی خێڵەکیان هەیە، وەبەبڕوای من بە درێژایی سەدەی بیستەم هێزە کوردییەکان نەیانتوانیوە لە[illegible] گوتاری سیاسی تەقلیدی دەربچن بەتایبەتی دوای ئازاری ١٩٩١ ئەگەرێکی زۆر لەبەردەم هێزە کوردییەکان دا بوو تاوەکو هاوپەیمانی پرۆژەی نیشتمانی بووەستنەوە بەڵام ئەشێ بڵێین ئەو هێزانە زۆر لەوە سەلەفی ترن کە بتوانن مانایەک بە قەوارەی سیاسی بدەن، لەکاتێکا وەک ئەوەی لە تێگەیەکی (هابرمانزەوە) وتمان، هەمو کێشمەکێش و ناکۆکییەکان گۆزراونەتەوە بۆ ناو قەوارەی سیاسی، دەشێ لێرەوە بڵێین (ناسنامەی سیاسی) لەناو هێزە کوردییەکان بەتەواوەتی بزرە، بەڵکە دروستە گەر بڵێین تاهەنووکەش هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەی سیاسی ئەدرێت لەلایەن هێزە کوردییەکانەوە. لەڕاستیدا لە کۆتای باسەکەماندا ئەو پرسیارە ئەکەین کە ڕەنگە لەم باسەمان بکرێت. ئایا پەیام و زانینی ئێمە بەرەو ئەو زانینە دەڕوات کە تیایدا چەمکە نوێیەکانی خۆرئاوا پەسەند بکەین؟

سەرباری ئەوەی کە ئەڵێم هەر سەرکێشییەک بێت، بەبڕوای من گەر دەرئەنجامەکەمان بەپەسەند کرنیش ناو برێت، ئەوا بێگومان لای من گرنگ ئەوەیە کە پیادەی ژیانێکی عەقلانی و ئازاد و مۆدێرن بکرێت. وەحەتمەن مۆدێرنیزەکردنی کومەڵگاش خەونی هەموو ڕۆشنبیرێکە وەئاشکراشە کەڕەگ وڕیشەی مۆدرێنیش دەگەڕێتەوە ناو فەرهەنگی خۆرئاوا بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەوا تێبگەین پرۆژەی نوێگەری کەپشت ئەستورە بەتەقەنیەی نوێ، چۆتە دەرەوەی ٨بەها ئینسانییەکان، چونکە لەڕاستیدا لە ئێستادا گوناهی گەورە لەلایەن پێکهاتە سیاسییەکانەوە بەکار ئەبرێت، لە ڕاستیدا هیچ ئاسۆیەک لەبەردەم ئێمەدا نەماوە غەیری ئەوەی بەدوای وێنەیەیەکی خۆمان بگەڕێین، وێنەیەک کە چمادی بەخوێن نەشۆرێتەوە بەڵام لەبەر بوونی خوێنی جەستەی هێزی تەقلیدیو سەلەفییەکانیش نەترسین، وێنەیەک کە بێگومان کۆڵانێکیان بەین نەبێت لەگەڵ ئازادیدا..

١٩٩٧ سلێمانی.

# ویستگەی پرسیار

**گوتار:**

## چۆن دەڕوانینە جیهانگیری بەها ئابووری و سیاسی و ئایدۆلۆژییەکان کە جیهانی سێیەمیان توشی قەیرانی ناسنامە کردووە؟

*د. شیرزاد نەجار*

- جیهانگیری (العولمە - Globolisation). بریتییە لە دەرکەوتنی تۆڕێک لەکارلێکردن و بە نێو یەکداچوون و پەیوەندی دلریەتی. واتە ژیانمان دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو ڕووداو و بڕیارانەی لە دوورەوە بەدیار دەکەون و بڕیاریان لەسەر دەدرێت. خاڵی گرنگ لە بەجیهانیکردن دا ئەوەیە کە ڕەهەندەی جوگرافی خەریکە بایەخی خۆی لە دەست بدات و سنووری نێوان وڵاتانیش گرنگی جارانی نەماوە... هەرچۆنێک بێت لێرەدا سەرنجی ئەوە دەدەین کە بەجیهانیکردن ئەوە دەگەیەنێت کە چوارچێوەی یاخود پانتایی [ناوخۆیی] و [نیشتمانی] بە بەردەوامی بەجیهانگیرییەوە پەیوەست دەبێت. ئەم کارلێکردن و بەنێویەکداچوونە جیهانگیرییانە دەرەنجامی چەندین پرۆسێسە.. لەلایەکەوە بەیەکێک لە ئاکامەکانی ململانێی نێوان زلهێزەکانی لە قەڵەم دەدرێت کە بە قۆناغی جەنگی سارد جیا دەکرێتەوە. لەلایەکی دیکەش بەرئەنجامی بەرفراوانبوونی بازرگانی نێو دەوڵەتی و بڵاوبوونەوەیەتی.. هەروەها ڕێکخراوە بازرگانییە نوێیەکان تایبەتمەندی ڕێکخراوی فرەڕەگەزی وەرگرتووە، ئەمەش بواری لەبەر دەم (جیهانگیری ئابووری)دا ڕەخساند. لێرەوە بایەخی ئابووری نیشتمانی هەرەسی هێناوە و ئابووری نێو دەوڵەتی خەسڵەتی ململانێی نێوان تەکەتولاتە ئابوورییە جیاوازەکانی وەرگرتووە. لەلایەکی دیکەوە بە جیهانیکردن گری دراوە بە داهێنانە تەکنەلۆژییەکانەوە کە کاری کردۆتە سەر زۆر لەبوارەکانی ژیان هەر لە پێشکەوتنی چەکی ئەتۆمییەوە تا گیروگرفتەکانی پیس بوونی ژینگە تا دەگاتە تۆڕی پەیوەندییە جیهانییەکان، پەخشی تەلەفزیۆنی لە ڕێی مانگە دەستکردەکانەوە، کە ناو دەبرێت (بە ڕێگای خێرایی ئاڵوگۆڕی زانیاری). دواجار جیهانگیری ڕەهەندێکی گرنگی لایەنی سیاسی و ئایدۆلۆژییە. گرنگترین کاریگەریشی لە بڵاوبوونەوەی بەها سیاسییەکانی لیبرالیزمی خۆرئاواییە.. وەک ئەوەی (فۆکۆیاما) لە کتێبی [کۆتایی مێژوو]دا وێنای کردبوو، وورووژاندنی ئەم مەسەلەیەش وەک بەڵگەیەک بوو بۆ سەرکەوتنی دیموکراسیەتی لیبرالیزم جیهانگیری سەربەخۆیی خودی دەوڵەتی نیشتمانی تێک شکاند ج لە ڕێی

بزاوتی بازرگانی- ئابووری، یان لە ڕێی شۆڕشی زانیاریو پەیوەندییەکانەوە.. ئەم بارودۆخەش مەسەلەی جۆراوجۆر ئەوروژێنێ کە گرنگترینیان هەڵوێستی دەوڵەتە نیشتمانییەکانە لەسەر (شوناسی نیشتمانی) و (ڕۆشنبری نیشتمانی) لەبەرامبەر ئەم ئاراستە جیهانی‌یەدا؟ ئەم مەسەلەیەش دروستە بەتایبەتی بۆ دەوڵەتە نیشتمانییە لاوازەکان کەخاوەنی توانستێکی وانین تا لە ڕێی ئەم خواستەوە بتوانن بەرهەڵستی دیاردەی (جیهانگیری) بکەن: لە ئاستی ئابووری و ئایدۆلۆژی و سیاسی و کۆمەلایەتی‌دا- لە ڕاستی‌دا مەسەلەی (شوناسی نیشتمانی) دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان لەو مەسەلانەیە کە قەیرانێکی حەقیقی وروژاندووە لە کاتێکدا ئەم دەوڵەتانە مێژووی سەربەخۆبوونیان نوێیە (بە دیارکراوی ئەکەوێتە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە). سەرباری ئەوەی ئەم وڵاتانە پێویستیان بە بیناکردنی شوناسی نیشتمانی هەیە و پێش بنێیت چوارچێوەی دەوەڵەتێکی نیشتمانی نوێشەوە و ڕزگاریان بێت لە پەیوەستەگی بۆ شوناسی بەرتەسک و ناوچەیی. کە بەهۆی کۆمەڵێک فاکتەری جۆراوجۆرەوە (ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی..) نەتوانراوە ئەو پرۆژەیە تەواو بکرێت و چەمکێکی نوێش بۆ شوناسی نیشتمانی دابرێژرێت. لەکاتێک دا ئەم وڵاتانە لەبەردەم مەسەلەیەکی ترسناک دان کە چۆنێتی پاراستنی خودە لە ژێر فشاری بەهێزی ئاراستەیی جیهانگیری دا.. ئەم مەسەلەیەش ئەرکێکی ئێجگار گرانەو پێویستی بە تواناو بەرگەگرتن هەیە چ وەک سیستمی حوکمڕانی یان هاوڵاتیان. لە کاتێکا فشار بەرەو توانەوە لە جیهانگیری دا فشارێکی توند و بەهێزە. بۆیە پاراستنی (شوناسی نیشتمانی) پێویست بە سیاسەتێکی درێژ خایەن هەیە کە پشت ببەستێت بە بیناکردنی (هۆشیاری بە خود) لای هاوڵاتیان و چاکسازیش بکرێت لە پەیوەندی نێوان هاوڵاتیان و حکومەتدا جگە لەوەی سیستەمی حوکمڕانی پێویستە کارلێکی هەبێت لەگەڵ سیاسەتی نێو دەوڵەتی هاوچەرخ دا و ڕۆڵێکی ئیجابی بگێرێت لەمەسەلەی بەرهەڵستی کردنی (تاک ڕەهەندیو باڵا دەستی و دەست بەسەراگرتن) لە سیاسەتی نێو دەوڵەتی‌دا.

هەولێر
کۆلێژی یاسای ڕامیاری
زانکۆی سەلاحەدین

# ویستگەی پرسیار

**گۆڤار-**

**لەکاتێکا بەرەو کۆتایی سەدەی بیستەم دەچین، بەبڕوای تۆ پرسیاری ناسنامە، کە پرسیارێکی قەیراناوییە، چۆن لە پرسیارێکی تەقلیدییەوە دەبێتە پرسیارێکی هاوچەرخ..؟**

***فەرەیدون حەسەن:-***

ئێمە لەم بوارەدا قسە لەسەر بابەتێک دەکەین کە واتایەکی گشتی لەخۆ هەڵناگرێت بەڵکە ئەوەی ئێمە بەتایبەتی قسەی لەسەر دەکەین ناسنامەی کوردییە..

لەڕاستیدا هەمو شتێکی سروشتی ئینسانی کورد تایبەتییە، بەو واتایەی زۆر بە قورسی دێتە ژێر باری ڕاڤەکردنەوە، بۆیە هەموو وەڵامەکانیشمان شێوەیەکی تایبەتی لەخۆ دەگرن.

بۆئەوەی ئەو پرسیارە لە فۆرمێکی گشتییەوە بچێتە ناو فۆرمێکی تایبەتییەوە دەبێت لێرانەدا پرسیاری ئەوە بکەین، کە ئایا چۆن دەتوانین ناسنامەی خۆمان دابمەزرێنین؟ دواتر دێینە سەر واتای هاوچەرخێتی ئەم ناسنامەیە..

دیارە هەمو گروهێکی بەشەری خاوەنی ناسنامەیەکی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام لێرانەدا دەتوانین ناسنامە لەدوو ئاستدا جیابکەینەوە..

ئاستی مێژوویی و ئاستی ئەنتۆلۆژی/ وجودی حەتمەن ناسنامە لەئاستی مێژووییدا کاتێک پێک دێت کە گروپێکی کۆمەڵایەتی یا نەتەوەیەک قەولرەیەکی هاوبەش سەرجەم ئەفرادەکانی پێکەوە گرێبدات، وە هەڵگری پرۆژەیەکی سیاسی تایبەتی خۆیان بن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جیهان و بەشدار بوون لەژیاری بەشەریدا، لێرەوە ئەکرێ بڵێین کەنەبوونی پرۆژەیەکی سیاسی هاوبەش کە گوزارشت لە چارەنووسی کۆمەڵگایەک بکات بەمانای لێرانەدا ئەو کۆمەڵگایە لەتوانای دامەزراندنی ناسنامەی سیاسی خۆیدا نییە.
ئەو کاتەی دەستەیەکی بەشەری وەک (کورد) کەهیچ بەشدارییەکی لە جوڵانەوەی مێژوودا نییە. هەر بەوە واتایە مانای توانی داگیرکردنی هیچ شوێنێگەیەکی نییە وەئەو کات وەک کائینێکی بێخەون دەمێنێتەوە، ئەوکات تەنها لەژێر باری ناچاریدا پشت بەئاستی یەکەم دەبەستێت بۆ بوونی خۆی کە ئاستی ئەنتۆلۆجییە وەئەم ئاستەشیان بەبێ حضوری ئاستی مێژوویی هیچ گەشەیەک ناکاتو بەردەوام ئاراستەکەشی بەرەو ناوەوەی خۆیەتی، بەواتای هیچ شتێکی هاوبەش لەنێوان کۆی ئەفرادەکاندا نامێنێت تاوەکو لەیەک گوتاری هەمەلایەنەی هاوبەشدا کۆک بێ و گوزارشت لەخەونی هەموویان

بکات، بۆیە لێرەوە بەشێوەیەکی سروشتی ئاستی ئەنتۆلۆژی بەبێ حضوری ئاستی مێژوویی هەرەس دێنێت.

بەهاوچەرخی بوون نەک پرسیارێکی زۆرپێویستە لەخۆمانی بکەین. بەڵکە لەهەنووکەدا پرسیارێکە بەڕادەیەک خۆی بەسەر شەردا ئەسەپێنێ کە هەموو دەمێک بەهێزێکی خێراترو بەتوانایەکی زیاترەوە دێتە ئاراوە؛ بۆیە پرسیاری چۆنیەتی هاوچەرخی بون پرسیارێکی زۆر لەپێشینەو زۆر پێویستە. بەڵام پێش ڕۆچوونمان بۆناو ئەم تەوەرەیە پێویستە ئەوە بڵێین: چۆن پرسیاری بوون و نەبوونی ناسنامەی کوردی دەکەین وەچۆن پێناسەیەکی ئەو ناسنامەیە دەکەین! لێرەدا بۆئەوەی پێناسێک لەحاڵی ئێستادا بۆ ناسنامەی کوردی بدۆزینەوە، پێویستە جارێکی تر لە جیهانی چەمکە گشتی‌یەکان دابەزینو بێینە سەر واقیعی تایبەتی کوردی وەهەمو ئەو ڕاستیانە دەست نیشان بکەین کە لە ڕێگایانەوە ئەتوانین ناسنامەی کوردی پێناسە بکەین، وەبۆ ئەمەش پێویستمان بەوە هەیە کەهەموو ڕەهەندە جوگرافیی‌و زەمەنی‌یەکان لێک بدەینەوە، لێرەدا پێویستە لەم دوو خاڵەدا کۆیان بکەینەوەو تیشکێکی بخەینە سەر، یەکەمیان: ئایا ئینسانی کوردی چی بەرهەم هێناوە؟ دووەمیان: ئایا ئینسانی کوردی چۆن سەیری دنیاو دەوروبەری خۆی دەکات؛ سەرەتا پێویستە ئەو سەرنجە بدەم: کەکاتێک بەمجۆرە قسە لەسەر مەسەلەکان دەکەم، پەیوەندییەکی بەزەمەنێکی دیاریکراوو پرۆژەیەکی دیاری کراوەوە نی‌یە، چونکە ئەساسەن نەبوونی ماوەو قۆناغی زەمەنی جیاواز.. جیاواز لەخۆی‌دا بەڵگەی سروشتی شێوازی کۆمەڵگای کوردی‌یە، بۆیە من قسە لەسەر مێژووی زەمەنی کورد خۆی دەکەم، ئەوەش لۆژیکێکی خۆی هەیە، بەتایبەتی کاتێک ئینسانی کوردی بەدرێژایی چەندان سەدە لەهەمان حاڵەتدا دەمێنێتەوە کە پێشتر تێی کەوتووە، دیارە هەمان دیاردە تایبەتی‌یەکانی تایبەت بەخۆی لەقەوارەیەکی ترو لەناو دەمامکێکی تردا دووبارە ئەکاتەوە. لێرەدا ئەتوانم بڵێم: حەقیقەتی جەوهەری ئەوەیە کە ئینسانی کورد ئینسانێکە تاوەکو ئەم ساتەوەختەش پابەندە بەسروشتەوەو لێی جیانەبۆتەوە. بۆیە تێڕوانینی بۆدنیاو چ بوونی لەپانتایی مێژوویی خۆی‌دا، بەدەر نی‌یە لە پابەندبوونی تەواوی بەسروشتەوە، وەتا هەنووکەش شتێکی نەهێناوەتە گۆڕێ، جگە لە پەیوەستی هەمیشەیی بەسروشتەوە.

لەڕاستی‌دا هەموو گەشەکردنێکی کورد لە ئاستی قەبارەدا بووە: لەڕووی بایەلۆژیەوە زیادبونی ژمارەی دانیشتووانی، لە ڕووی ئابووری‌یەوە. زیادبوونی سەری مەڕەکانی وەرووبەری زەوی‌یە داچێنراوەکانی، وەلە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە زلتر بوونەوەی قەبارەی خێڵ. بەبڕوای من پێویستە بپرسین کە ئایا نەبوونی هیچ دامەزراوەیەکی مەدەنی‌و دەوڵەتی یا نەبوونی دەسەلاتێکی سیاسی عەقڵانی، لەخۆی‌دا گوزارشت لە غیابی

هەمیشەیی کۆمەڵگای کوردی ناکاتو لەناو مێژوودا؟ من لێرانەدا مەبەستم بوونو نەبوونی پەیوەندیو دامەزراوە کۆمەڵایەتیو ئاستی پەرەسەندنیمە؛ چونکە حەقیقەتی بوون لەئاستی مێژوویی‌دا، وەحەقیقەتی فەعالیەتی مێژوویی هەر میللەتێک لە رێگەی پەرەسەندووی تەزری دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانەوە دەردەکەوێت. لەڕاستی‌دا ئەو ساتانەی کەئینسانی کورد بەرهەمی هێناوە بەتەنها بریتی‌یە لە تێکشکانەکانو دراما خوێناوی‌یەکانیو دووبارە بەرهەم هێنانەوەی قەیرانە هەمەلایەنەکانی. بۆیە سەرجەم کۆچە بەکۆمەڵەکانیو سەرجەم قەلا ڕوخاوەکانیو ئەو هەموو خوێنەی لەڕووبەری جوگرافیای کوردا ڕژاوە. ئەو حەقیقەتە تاڵەمان بیر ئێنێتەوە کە سەرباری ئەو هەموو خوێنەش ئینسانی کوردی هیچ شتێکی بەرهەم نەهێناوە، نەدەقێکی یاسایی بەرهەم هێناو، نەدەسەلاتێکی سیاسی کەگوزارشت لە چارەنووسی بکات کەواتە ئەگەینە ئەو حەقیقەتەی کەئینسانی کوردی بەدرێژایی مێژووی تەمەنی هیچی بینا نەکردووە، غەیری بەرهەم هێنانی بەرهەم نەهێنان.

بابزانین ئینسانی کوردی چۆن سەیری دنیا دەکاتو وەچ جیهانبینی‌یەکی هەیە! ئەوەش دەڵێم کە ئەم قسەکردنانە تەنها چوارچێوەی سەرنجەکانم دەگرێتەوەو ناچێتە خانەی لێکدانەوە.

تێڕوانینی ئینسانی کورد بەدەوروبەردوە، لەپەیوەندی ڕاستەوخۆی ئینسانی کورد بەسروشتی دەوروبەری‌یەوە هەڵهێنجنراوە؛ بۆیە جیهانبینی کوردی لەئاستی جوگرافیای ڕاستەوخۆی دەوروبەر تێنەپەڕیوە، بۆیە دەبێت ئەو حەقیقەتە بڵێین کەیەکەم بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی بەودیوی خۆیەوە، لەو کاتەوە بووە کەبەرامبەر (آخـر) داگیری کردووە. ئینسانی کوردی لە قەوارەی خۆی‌دا سەیری دنیا دەکات بۆیە هیچ جیاوازییەکی نی‌یە لەگەڵ سەردەمەکانی پێشتری‌دا، هەر هەمان ئەو کائینەیە کە خۆی لەناوەندی سروشتێکی ڕاستەوخۆدا، کە پەیوەستە بەخۆیو مەڕوماڵاتی‌یەوە، دەبینێت. بەو واتایەی کە مامەڵەکردنی لەگەڵ زەویو مەڕوماڵاتیش‌دا بۆ سەلماندنی ژیانی سروشتی‌یەتی لەناو سروشت‌دا، کە ئەمەش دەلالەتی جیانەبوونەوەی ئینسانی کوردی‌یە لە سروشت.

حەتمەن چۆنی‌یەتی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتیەکانو شێوازی پەرەسەندنو پێکهاتەی زمانیو بونیادی سیاسیو ڕۆشنبیری کوردی، ئەو جومگانەن کە لەڕێگەیانەوە ئەتوانین قسەکانی پێشترمان ئیسپات بکەین، چونکە خۆرئاوا دنیایەک گۆڕانو دەسکەوتی گەورەی بۆخۆی مەیسەر کرد کەچی تا هەنوکەش خێڵ مەرماوە. واکۆتایی سەدەی بیستەمەو کەچی کورد تاهەنوکەش پێکهاتەی خێڵەکی‌یەکانی بەتواناترو بەهێزتر بووە، وەلەم بونیادە نەترازاوە بۆیە هەمیشەش پێکهاتەی دەسەڵاتەکانی پێکهاتەیەکی خێڵەکی‌یە؛ حەتمەن جیهانبینی خێڵیش لەسنووری شوێنەکەی خۆی تێناپەڕێت.

گفتوگۆیەکی لەم شێوەیە لەسەر ئەو کێشە چارەنووسسازانە ناتوانێت دەرباز بێت لەتێگە باوەکان، مەبەستم ئەو تێگە گەشبینانەیە کەوا سەیری دنیا دەکەن بەو واتایەی هیچ قەیرانێکو هیچ ئیشکالێکی نەبێت، تا ئەو ڕادەیەی بۆ نموونە پێکهاتەکانی گوتاری سیاسی ئێستامان ئەو هەولانەن کە پیرۆزی بۆ پەیامە کۆنەکان دەگێڕنەوە، یاخود بانگەشەی گەیاندنی جیهانی نوێ بەسۆشیالیزم لە کوردستانەوە دەکەن، وە لە باشترین حالەتدا لە زەوی دواکەوتوویی کوردەوە پەیامی گەیاندنی دیموکراسیەت بۆ ڕۆژهەلات ڕانەگەیەنن.

لەگەڵ بۆچوونی باوردا مونامەرەیەکی ساختانە هەیە کەنابێت خۆمانی لێخافڵ بکەین ئەویش بریتی‌یە لە نەبینی ئەو ڕاستی‌یەی کە هەموو تەماسو بەرکەوتنێکی کورد بەجیهانی دەرەوەی خۆی، بەئاڕاستەی هاتنە لە دەرەوەی خۆی بۆناو خۆی نەک لەئیرادەی خۆیەوە بەرەو دەرەو جیهان بەگشتی.

ئێستا لە جیهانێکداین کە ناتوانین بەبێ دەسەلاتێکی سیاسی بەیانی بوونی هیچ بوونێک بکەین، بۆیە گرنگە مەحکەمەی گوتاری سیاسی کوردی بکەین لەهەر ئاستێکدا بێت.

دیارە هاوچەرخی بوون بەڕادەیەکی زۆر دەچێتەوە ناو بونیادی ڕۆشنبیری‌یەک چونکە بەتەنها ڕۆشنبیری ئەتوانێ ئەو پرسیارانە بانگهێشت بکات بۆ ناو ڕاڤەکردن وەتەنها ڕەخنە ڕۆشنبیری‌یەکان ئەتوانن ببنە چاوگی دامەزراندنی عەقلانیەت.

وەمەحاڵە بتوانین بەتەقەنیاتی فکری جۆرلوجۆرەوە تێکەڵ بەقەیرانە هەمەلایەنەکانمان بین بەبێ هەڵوەشاندنەوەو لێکدانەوەی قووڵی کەسایەتی کوردی، چونکە لەڕاستی‌دا ڕۆشنبیری کوردی ئەو ڕۆشنبیری‌یە نی‌یە کە خاوەنی بۆچوونی جیاوازو پڕ لە ئیشکال بێت لەسەر ئاستی جیهانبینی جیاواز، بۆیە ئەکرێ سروشتی ئەو تایبەتمەندیتی‌یە ڕەچاو بکەین. وەسەبارەت بە خاڵی دووەم کەلای من جێگەی بایەخ پێدانە، بریتی‌یە لە پرسیار کردن لەڕێگەی ئەو گروهو حیزبە سیاسیانەوە کەوەک ئەلتەرناتیف کارئەکەن، وەلێرەوە ئەتوانین حوکم بەسەر بوونیو نەبوونی فاکتەرەکانی ناسنامە بدەین. لەکۆتاییدا دەڵێم: بۆئەوەی هاوچەرخ بین دەبێت بەر لە هەمو شتێک بینایەکی هەمەلایەنەی خۆمان بکەین بەتایبەتی وەستان لەسەر ڕەهەندی سیاسیو ڕۆشنبیری، لە کۆتایی‌دا بەپێویستی دەزانم جەخت لەسەر ئەو ڕاستیە بکەم کە دامەزراندنی ناسنامە بەڕادەی سەرەکی لە ئەستۆی سیاسەتمەدارو ئیرادەی سیاسی‌دایە نەک ڕۆشنبیر..

سلێمانی..

# ویستگەی پرسیار

**گوتار:**

بەهۆی بەسەرچوونی بیری نەتەوەیی و شۆڕشگێڕی و... هتد، یەوە لەناو ژینگەی خۆرئاوادا، کە ئەنووکە ناوەندێکی بالا و خاوەن هەیمەنەتە- پرسیاری ناسنامە بۆتە پرسیارێکی قەیراناویی، ئایا تا چەند ئەم چەمکە (ناسنامە) لەناو گوتاری سیاسی (کە حیزب گوزارشتی لێ دەکات) حچوری هەیە؟! وە چ مەرجەعێکی سیاسی و فکری و ئایدۆلۆی ئەتوانێ پشتگیری ئەوچەمکە بکات؟

**ئاراس عبد الکریم:**

بەر لە هەموو شتێک بەوەدا کە پرسیاری شوناس لەناو ژینگەی خۆرئاوادا بەهۆی بەسەر چوونی بیری نەتەوەیی و... هتد.وە قەیراناوی دەبینن، ئیارە مەبەستی پرسیارەکەتان قسە کردنە لەسەر ڕەهەندێکی دیاریکراوی شوناس کە (شوناسی نەتەوەیی= الهوية القومية )یە. چونکە پرسیاری شوناس- بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە- نەک هەر لە خۆرئاوا دا لەقەیراندا نییە بگرە ئێستا (شوناسی ڕۆشنبیری= الهوية الثانية ) بوەتە فەلەکێک کە هەموو پرسیارەکانی گوتاری شوناس بەدەوریدا دەسوڕێنەوە. بێگومان ئەمەش پاساوی خۆی هەیە و ئاساییە کە گوتاری شوناسی خۆرئاوایەکی خاوەن ناوەندی بالای هێز و ئابووری و مەعریفە و زانست و تەکنەلۆژیاو... هتد زیاتر سەرگەرمی وروژاندنی چەمکی وەک دایەلۆگ و پێکەوە ژیان و هاوکاری و ئەو چەمکانەی دی بێت کە زیاتر دەرگا لەسەر (عەولەمە )ی دیدگاو جیهانبینە جیاوەزەکان دەخاتە سەرپشت. ئەگەرچی ئەمە خۆی لەخۆیدا دان پیانانە بە شوناسی ڕۆشنبیریی دەرەوەی خۆرئاوادا، بەلام مەبەستی سەرەکی خۆرئاوا لەم پرۆسەیەدا دروست کردنی هەستێکە لای کۆمەلگاکانی دی کە نەک هەر ئامادەی مامەلەو دیالۆگ بن لەگەل کلتوورەکەیدا، بەلکو بەپێویستیشی بزانن. چونکە خۆرئاوایەکی سەرمایەداری کە سروشتێکی ئەختەبووتانەی هەیە لە پەلهاویشتن بە جیهاندا هەردەبێ گوتاری شوناس لای ئەو جەخت لەسەر ئەوە ڕەهەندە بکات، بەتایبەتی لەکاتێکا گوتاری شوناسی ولاتانی کەنار زیاتر بەدیوی ڕەهەندەکەی دی (شوناسی نەتەوەیی )دا کەوتۆتەوە. لێرەدا دەکرێ بپرسین ئایا سەبارەت بە خۆرئاوا، ئامادەگی کۆمەلگاکان بۆ قبوولکردنی مەعریفە و کلتووری... هتدی خۆرئاوا فاکتەرێکی یاریدەدەر نییە بۆ زیاتر ئامادەگی بازاڕەکانیشیان لەبەردەم هەیمەنەی بەرهەمەکانیدا؟ بەشێوەیەکی دی بلێین: ئایا ئەو

ستراتیژە ئابوورییە گەورەی خۆرئاوای سەرمایەدار پێویستی بە ستراتیژێکی سۆسیۆسایکۆلۆجی نی‌یە لەولاتانی کەناردا پیادەی بکات؟

لەکاتێکدا گوتاری شوناس (نەک خودی شوناس) وەک بورهان غلیون دەلێ: خۆی لە خۆیدا ئایدۆلۆژیایە ئاشکراشە کە ئیشی سەرەکی گوتاری ئایدۆلۆژیا چەپاندن و شاردنەوەی جیاوازییەکانە لەناو بەهایەکی پیرۆزتر و پانتاییەکی فراوانتردا. هەر بۆ نمونە چەمکێکی وەک (عەولەمە) بەر لە هەموو شتێک شاردنەوەی جیاوازی نێوان خەونی نەتەوە جیاجیاکانە لەنێو خەونی گەورەی مرۆڤایەتیدا.. لێرەدا مەبەستم لەوەنیە کە هەمیشە گوتاری شوناس بە ستراتیژێکی سلبیانە ئیش بکات چونکە هیچ گومانێک لەوەدانیە کە نەتەوەکان چەند لێکدی جیاوازبن زیاد لە خەونێک هەیە کۆیان بکاتەوە، جگە لەوەی مامەلەکردن و پێکەوە ژیان و پەیوەندیی کلتووری‌و زانستی‌و فەرهەنگی و هتد پێویستی‌یەکی گرنگی هەمو نەتەوەیەکی سەرئەم زەمینەیە.

بەبروای من گوتاری شوناس لەرەهەندە نەتەوەیەکەیدا، هیچ نەبێ بۆ ئەم قۆناغە مێژووییەی ئێمەی کورد زیاتر ئیجابیانە دەنەوێتەوە، بەوەی جیاوازییە دۆگماییەکانی خێڵ جیاوازەکان لەناو بونیادی نەتەوەیەکدا دەشارێتەوە، بێگومان لەگەل بوونی هەستی نەتەوەییدا دەنا هەرگیز دەمارگیری عەشیرەت لەناو بیری نەتەوەییدا خەفە ناکرێت. چونکە مەرج نی‌یە بوونی گوتاری شوناسی نەتەوەیی مانای ئامادەبوونی فیعلی شوناسەکەبێت؛ بەلام ئەم چەمکە بۆ ئێمەی کورد کە هێشتا پرۆژەی بوون بەنەتەوەمان بەمانا فراوانەکەی تێ نەپەڕاندووە، جێگەی باسەو پرسیاری زۆر هەلدەگرێ..بە بڕوای من شوناس بەرلەوەی هەرمانایەک لەخۆبگرێ و هەر پێناسەیەک قبوولبکات، دەلالەتێکی (وجودیی)هەیە..

شوناس مانای (بوون)ێکە، ئیدی بوونێکی سیاسی یان کۆمەلایەتی یان فەرهەنگی یان ئایینی یان هەموو یان پێکەوە یان کەمتر بێت، گرنگ ئەوەیە بوونێکی سەلمێنراوە لەشێوەی وێناکردنێکی تایبەتدا کە هەلگری چەندین ڕەمزە یان بەشێوازێکی تر: تێکەلەیەکی (خليط) ڕەمزییە کەوێناکردنێکی تایبەتمەند و جیاواز لەناو وێناکردنەکانی دیدا بەرجەستە دەکات.

واتە شوناس دەربرینێکی بەرجەستەی (من)ە، (من)ێکی جیاواز لە (ئەوی دی). هاوکات لەگەل ئەم (بوون)ە جیاوازەدا کە بەرووی دەرەوەدا خۆی نیشان دەدات، شوناس ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ پەیوەست بون (إنتماء) بەرووی ناوەوددا، ئەگەرچی ئەم بۆچوونە لەسەر ئاستی تاک و کۆش هەر ڕاستە بەلام مەرج نیە هەموو دەمێک و لای هەموو تاک یان کۆیەک ئەم ئینتیمایە پرۆسەیەکی ئیرادەگەریانە بووبێت و بەویست و ڕەزامەندیەوە ئەنجام درابێت.

بەم پێیە شوناس دیدگایەک یان هەڵوێستێکی دیاریکراوە بەرامبەر بە (بوون)، واتە شێوەیەکە لە پەیوەندیی لەنێوان (بوون)ێک و دەرەوەیدا. هەموو پەیوەندیەکی لەم بابەتەش کە ئاراستەیەکی جیهانبینی تایبەت دیاریدەکات ڕەهەندێکی مێژوویی لەناو خۆیدا هەڵگرتووە: بۆیە هەر (من)ێک- یان لێرەدا- هەر شوناسێک بەو ئاراستەیە لەگەڵ خود (ذات)و ئەوی دیدا مامەڵەی نەکردبێت، تەنها وەک بوونێکی ئەبستراکت کراو و داخراو بەسەرخۆیدا دەمێنێتەوە و ئامادەبوونێکی مێژوویی (یان لەناو مێژوودا) نابێت. واتە ئەگەر ڕاستگۆبین لەگەڵ خۆماندا: (من)ێکی پەراوێزی وەک (من)ی کوردی.. (من)ێکی بچووکی سینەناخ لە فۆبیاو گرێی خۆبەکەم زانی و شەرم و...هتدی ئاڵۆزکراو بەچەندین تارمایی گەورەو بەهەیبەت و (زۆر جاریش) دڕندەی ئەوی دی.

ئەگەر چی سەرەتا ئەم وێناکردنە بۆ (من)ی کوردی لەدیدی (ئەوی دی)ەوە بەرهەمهاتووە. بەڵام ئایا ئەم (من)ە هیچ وێناکردنێکی جیاواز، یان ڕوونتر بڵێم دژ بەو وێناکردنەی ئەوی تری بەرهەمهێناوە؟ یان وێناکردنەکەی (ئەوی دی) بۆتە قەناعەتێکیش لای ئەم. ئەگەرچی (بوون)ی هیچ (من)ێک بەبێ (ئەوی دی) مانای نییە، بەڵام گرفتی (من)ی کوردی بەر لە هەموو شتێک لەوەدایە کە (ئەوی دی) نەک هەر سەرچاوەی ئێستای مەعریفەکەیەتی- ئەگەر هەیبێت- بەڵکو سەرچاوەی شوناسەکەشی بووە.

ئەگەرچی هەمیشە ناسینی ئەوی دی ڕوانگەیەکە بۆبینینی خود، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە لەگەڵ دەرکەوتنی ئەوی دیدا خود پاشەکشەی لێبکات و خۆی لەئاستی ئامادەبووندا نەبینێ.. بۆیە خاڵی جەوهەری ئەناسینی (من)ی کوردیدا بەبڕوای من خوێندنەوەی ئەم (من)دیە تاسەر ئێسقان و توێکاریکردنی جەستەیەتی بەپرسیاری بوێرانە و گومانایی. واتە زیاتر ڕەخنەکان ئاراستەی ناوەوەی ئەم جەستەیە بکەین و لەجیاتی ئەوەی بپرسین، ئایا ئەوی دی ئەو پەراوێزەی لەکوێوە هێناوە کە (من)ی کوردیی تیا قایم کردووە؟ بابپرسین تۆبڵێی بەرلەهەموو (بوون)ێک پەراوێزێک هەبووبێ کە (من)ی کوردیی بەرهەمیهێنابێ؟

یان بوێرانەتر و ئاشکراتر بپرسین: ئایا لەدەرەوەی پەراوێزی (ئەوی دی)، (من)ی کورد بۆ هیچ پانتاییەک گەڕاوە؟ یان لای ئەم هەموو پانتاییەک پەراوێزی (ئەوی دی)یە ئەگەر دەقاودەق بەو پانتاییە نەچێت کە جەستەی (ئەوی دی) لەخۆ گرتووە. ئایا ئەم شوناسە شاخاوییە، جەنگاوەرە، داواکەوتووە، خێڵەکییەی کە بەپێی خوێندنەوەی (ئەوی دی) سروشتی (من)ی کوردییە، لای خودی ئەم (من)ە چ وێناکردنێکی جیاوازی هەیە؟ ئایا ئەم بوونەوەرە بەستەزمانە کە هەمیشە شایانی بەزەیی و هەندێک جاریش

گازندیە (بەپێی دیدی ئەویتر)، یان لای هەندێک تەنانەت شایانی ڕقو نەفرەتیشە، خودی ئەم بوونەوەرە خۆی بەشایانی چی دەزانێ؟ ئەگەر چی بەتەنها خوێندنەوەی گوتاری سیاسی کوردی بەس نییە بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانە و بەر لەو گوتارە خوێندنەوەی نەستی کوردی و پاشان جەستەی ڕۆشنبیری کوردی دەکرێ بڕێکی ئەو وەلامانەمان بۆ دەستەبەربکات، بەلام پرسیارەکەتان تەنها ئاماژە بۆ گوتاری سیاسی کوردی دەکات، ڕوونتر بلێم بۆ خوێندنەوەی چەمکی شوناس لەناو گوتاری سیاسی کوردیدا، بۆیە هەولدەدەین لەو تەوەرەیە دەرنەچین.

سەرەتادەبێ دان بەو ڕاستیە تالە بنێین کە لە کۆمەلگای ئێمەدا تەنها (حیزب) نوێنەر و نمایشکەر و زمانحالی سیاسەتەو گوتاری حیزب تاکە گوتاری سیاسەتە.. لێرە پیاوی سیاسی، ئەو زاتەیە کە بەیانیان لەدەرگای حیزبەوە دێتە دەرێ وئێوارانیش هەر لە هەمان دەرگاوە ئاوا دەبێ.. عەقلی سیاسی لێرە تەنها لەناو هەردەمی حیزبدایەو لەدەرەوەی جەستەی حیزب شەرعیەت بەهیچ کەس و گروپ و دەزگایەک نادرێ کە وەک ئەو قسە لەسیاسەت و پرۆژە چارەنووسسازەکان بکات. چونکە لێرە ئەو شتە نیە کە پێی ئەوترێ (ڕای گشتی) کە یەکێکە لە پایەگاکانی کۆمەلگای مەدەنی. بگرە هیچ ئامازەیەکی مژدەهێن نابینرێ کە هێلە سەرەتاییەکانی کۆمەلگای مەدەنی لە دەڤەرەکەماندا دەستنیشان بکات.

بێگومان ئەم تێکچڕژان و تێکەلبوونەش لەئاکامی هەیمەنەتی کۆمەلگای سیاسیدایە لە هەموو بوارەکاندا بەسەر کۆمەلگای مەدەنیدا تاڕادەی سڕینەوەی. کۆمەلگای سیاسیش لێرە بێگومان حیزبی کوردییە. بۆیە ناچار دەبێ بەناو گوتاری سیاسی حیزبی کوردیدا بگەڕێین تا بزانین چەمکی (شوناس) چ ئامادەبوونێکی فیعلی هەیە لەبەرنامەیدا و ئایا ئەم چەمکە وەک پرۆژەیەک کاری بۆ کراوە یان تەنها دروشمێکی جوانە و هیچی دی؟ لەڕاستیدا کەم چەمک هەبووە هێندەی (شوناس) شوێنی دیار و هەمیشەیی لە گوتاری حیزبی کوردییدا پێ بەخشرابێ. بەڕادەیەک کە واهەست دەکرێ ئەم چەمکە گرنگترین و سەرەکیترین بەرنامە بێت لە ستراتیژی حیزبی کوردیدا. بەلام لە پراکتیکدا لە دروشمێکی حازر بەدەست و ڕەمزێکی پیرۆز بەولاوە هیچ ئامادەبوونێکی جددی لەناو ستراتیژی حیزبدا نیە. بێگومان حیزبی کوردی هەمیشە پێویستی بە ڕەمزی لەم شێوەیە تازیاتر شەرعیەت بە بوونی خۆی بدا، ڕوونتر بلێم، تاهێندەی دی بوونی حزبەکە بەپێویست بناسێنێ و تەنانەت بەپیرۆزیش نیشانی بدات.

لەڕاستیدا بەهەلەیەکی گەورەدا دەچین گەر لە ڕێگەی گوتاری سیاسی حیزبی کوردییەوە و تەنها لەبەر خوێندنەوەی ئەم چەمکە لەناو ئەو گوتارەدا واهەست بکەین بوونێکی فیعلی هەیە. چونکە بەبڕوای من ناسینی حیزبی کوردی لەڕێگەی گوتاری

سیاسی خۆیەوە. لەرێگەی پەیرەوو پرۆگرام و بەرنامەی نووسراو و وتراویەوە بەدەستی خۆی‌و لەسەر زاری خۆی هەڵەیەکی گەورەیە. من لەو بڕوایەدام کە نزیکترین ڕێگە بۆ ناسینی ئەم حیزبە کە ڕاستەڕێ بمانباتە سەر جەستەی حەقیقی ئەم بونیاددە سیاسیە لەڕێگەی ڕەمزەکانیەوە دەبێ. ئەو سومبولە پیرۆزانەی کە بەبێ ئەوان حیزبی کوردی هەناسەی بۆ نادرێت.

تا لێرەوە ئەو عەقڵە بخوێنینەوە کە بەو شێوازە مامەڵە لەگەڵ بونیادێکی سیاسیدا دەکات. مەبەستم ئەو هزرەیە کە دەقاودەق بەمیکانیزمێکی خێڵەکی ئایینی‌یەوە ستراتیژی پرۆسەکانی دەبات بەڕێوە. تا لەوێوە بزانین شوناس لەو ستراتیژەدا چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ.

سەرەتا وتمان شوناس مانای بوونە.. شوناسی نەتەوەییش بێگومان ئاماژەیە بۆ بوونی نەتەوەیەک. کەواتە دەبێ سەرەتا بزانین حیزبی کوردی چ ستراتیژێکی هەیە بۆ پرۆسەی بوون بەنەتەوە؟

هیچ گومان لەوەدانیە کە یەکێک لەپایەگا سەرەکیەکانی (شوناسی نەتەوەیی) بریتیە لە قەوارە (کیان)ی نەتەودیی و بەبێ قەوارە شوناسێکی نەتەوەیی نەک هەر لەناو تەونێکی گوماناویدایە بەڵکو وەهمێکی هەڵخەڵەتێنەریشە. نەتەوەی بێ قەوارە گەر شوناسێکیش بەخۆی ڕەوا ببینێ. ئەوا شوناسێکی پەرلوێزانەیە و بەردەوام لەدنیایەک قەیران دایە. کەواتە جێی خۆیەتی بزانین قەوارە لە دیدی حیزبی کوردیدا چ دەلالەتێکی هەیە. ئایا بەو مانا سیاسی‌یە دێت کە تیایدا نەتەوە سەربەخۆییەکی فیعلی هەبێ‌و چارەنووسو بەڕێوەبردنی کایەکانی ژیانی بەدەست خۆی بێ. ئەویش بەپشت بەستنی بە ئابوورییەکی سەربەخۆی وا بەستەنەکراو بەهیچ قەوارەیەکی دییەوە یان لە فەرهەنگی ئەودا قەوارە مانایەکی دی هەیە؟

ئەگەر تەنیا یەک خاڵی دیار لە دیدیی حیزبی کوردی وەربگرین وەک نمونەیەکی زیندوو لە حەقیقەتی مانای ئەو چەمکە تێ دەگەین لە هزری ویدا. ئەو خاڵەش کە بەلای منەوە زۆر گرنگە مەسەلەی (دانوستان= مفاوضات) و ڕێکەوتنی حیزبی کوردییە لەگەڵ ڕژێمە داگیرکەرەکاندا بەشێوەیەک کە هەمیشە و لەهەموو ئاستێکدا جەختی لەسەر دەکات وەک بلۆی یەکێک بێت لە هێڵە گشتیەکانی ستراتیژی ئەم حیزبە.

بڕواناکەم هیچ کەسێکی ژیر نکوولی لە گرنگی گفتوگۆی سیاسیانە بکات بۆ چارەسەری کێشە سیاسیەکان. بێگومان کێشەیەک بەدایەلۆگ چارەسەر بکرێ، شتێکی‌یە گەر پەنا ببرێ بۆ چەک و خوێن ڕشتن. بەلام گرفتەکە لەوەدایە کە بەرلەهەرکەسێک حیزبی کوردی دەزانێ گفتوگۆ لەگەڵ چ عەقلێکدا دەکات و دەشزانێ دانوستان لای ئەو عەقلە گەر هەر مانایەکی هەبێ مانای قەوارەی کوردی نیە. لەم دانوستانەدا کە هەمیشە

ستراتیژی ئەوی دی نەفی کردنی شوناسی (من)ی کوردی بووەو هەوڵدانی بەردەوامی بۆ ناشیرنکردنی وێنەی کەسێتی کورد و تەنانەت سڕینەوەشی بووە. جێی خۆیەتی بپرسین حیزبی کوردی ئەو قەناعەتەی لەکوێوە هێناوە کە دایەلۆگی سیاسی لەگەڵ عەقڵێکی لەو شێوەیەدا پیادە بکات؟ من دەڵێم لە جەستەی خۆیەوە.. روونتر بڵێم لەپیرۆزیی جەستەی خۆیەوە، جەستەیەک کە پاراستن و مانەوە و گەشەکردنی بەهەر شێوەیەک بێت یەکەم قەناعەتی حیزبی کوردییە. حیزبی کوردی هەمیشە تەماشای لەسەر جەستەی خۆی جێگیرە، لێرەوە ئیرادە تەنها ئەو ئیرادەیەیە کە لەناو ئەو جەستەیە دایەو لەدەرەوەی ئەو و لەناو بونیادی نەتەوەدا هیچ ئیرادەیەکی دی نییە.

هەر کات ئەم جەستەیە هەستی کردبێ ئیرادەی ئەم لەئاستێکدایە کە توانای سەلماندن و بەڕێوەبردنی قەوارەی سەربەخۆی نیە ئیدی ئەمەی لابووە بەقەناعەتێک کە کۆمەڵگای کوردی لەئاست ئەو ئیرادەیەدانییە کە قەوارەیەکی سەربەخۆی خۆی دەستەبەر بکا و بیبات بەڕێوە. بەڕاستی حیزبی کوردی بەتایبەت لەدوای نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەوە لە هەموو پرۆژەیەکی دانوستانی لەگەڵ ڕژێمە داگیرکەرەکاندا ڕاستو چەپێکی گەورەی بەقەوارەی نەتەوەییدا هێناوە و تەنانەت شوناسی کوردیشی خستۆتە بەر گومانێکی گەورە و تەنانەت خەتەرناکیش. دەنا بۆچی لە هەموو پرۆژەیەکی ڕێکەوتندا خاڵی یەکەم (وەک ئەوەی لە پرۆژەی ڕێکەوتنی نێوان بەرەی کوردستانی و ڕژێمی بەعسەوە لە هاوینی ١٩٩١دا لەلایەن هەردوولاوە گەڵاڵەکرابوو) بەوە دەست پێ دەکات کە حکومەتی عیراقی لە کوردەکان خۆش ببێ.. بێگومان ئەو کوردانەی کە بەشداری ڕاستەوخۆی شۆڕشیان کردووە.

واتە دەبێ ڕژێمی بەعس لەئینسانی کورد خۆش ببێ.. لێرەوە دەبینین ئینسانی کوردی شوناسی تاوانباری پێ دەبەخشرێ.. بەڵێ حیزبی کوردی لەوە سڵی نەکردۆتەوە کە ئیعتیبار بۆ مێژووی خۆشی دانەنێ چ جای مێژووی نەتەوەکەی.. پێشمەرگە لەجیاتی شۆڕش چەتەیی کردووە!! حیزبی کوردی خۆیشی- بەپێی ڕێکەوتنەکەیان- لەجیاتی خەبات خیانەتێکی نیشتمانی کردووە! دەنا بۆ داوای لێخۆش بوون دەکات؟! بەم پێیە ئەگەر حیزبی کوردی وێناکردنێکی جیاواز لە (ئەوی دی) بۆ شوناسی کوردی بەرهەمهێنابێ، ئەوا لەجیاتی وێنەی قوربانییەک، وێنەی تاوانبارێکی پەشیمانی بەکەسایەتی ئەم بوونەوەرەوە لکاندووە!! هەر لەسەر ئەم لایەنە(قەوارە)، ڕاپەڕینی ١٩٩١، لەکاتێکدا هەوڵی زێڕین بوو بۆ حیزبی کوردی، هاوکات خستیە بەردەم پرسیارێکی جددییەوە، پرسیاری (قەوارە). دامەزراندنی حکومەت و پەرلەمان لەم (هەرێمە!)دا ئەگەر بە قەناعەتی هەرکەسێک لە ئیرادەی حیزبی کوردییەوە بووبێ بۆ دامەزراندنی کیانێکی کوردی، ئەوا خودی گەڵاڵەنامەی بەرەی کوردستانی ئەم بۆچوونە

ڕەت دەكاتەوە، چونكە لەخاڵی (سێیەم)ی بەیانەكەدا دان بەوەدادەنێن كە دامەزراندنی پەرلەمانێكی كوردی لەم دەڤەرەدا لەبەر كشانەوەی دەزگا دەوڵەتیەكانی حكومەتی عێراقییە. نەك وەك پێداویستی‌یەكی ئەم قۆناغەی كۆمەڵگاكەمان و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەكی كوردی. ڕاستە بەهیچ شێوەیەك نكوولی لە فاكتەری دەرەكی و ڕۆڵی سلبیانەی دەوڵەتە ئیقلیمی و تەنانەت دەوڵەتەكانیش ناكرێ لەم بوارەدا. بەڵام پرسیاری سەرەكی لەم خاڵەدا پرسیاری ئیرادەیە. ڕاستتر بڵێم پرسیارە لەسەر قەیرانی ئیرادە. خۆ ئەگەر كەسێك بڵێ حیزبی كوردی هەبووە لەدوای ڕاپەڕینەوە ئیشی بۆ دامەزراندنی قەوارە كردووە! ئەوا لەكاتێكدا دەوڵەت وەك گرلشی دەڵێ: بریتی‌یە لە (كۆمەڵگای سیاسی+ كۆمەڵگای مەدەنی) مافی خۆمانە بپرسین كە حیزبی كوردی كۆمەڵگای سیاسی لەناو خۆیدا بۆ جەستەی خۆی بتوێنێتەوەو بەهیچ شێوەیەك بواری دامەزراندنی كۆمەڵگای مەدەنی نەدابێ. ئیدی ئەم قەوارەیە لە كوێوە ئیشی بۆ كراوە؟! بەڕاستی سەیرە چەند وەزارەتێكی مردوو نمایشی بەڕێوەبردنی قەوارەیەك بێنێ! بۆچی دوور بڕۆین و خۆمان بەكێشەی دەوڵەت و قەوارەی نەتەوەییەوە خەریك بكەین. باهەر سەیری كۆمەڵگای كورد بكەین و بزانین هەستی نەتەوەیی.. تەنها وەك هەستێك.. لە چ قەیرانێكی خەتەرناك دایە. كۆچی بەردەوامی ئینسانەكانەی ئەم دەڤەرە بەتایبەت خاوەن هێز و توانا زانستی و فیكری و ڕۆشنبیریەكان چ مانایەك دەبەخشێ؟ ڕاستە ئێمە هێشتا پرۆسەی بەنەتەوەبوونمان بەمانا فراوانەكەی تێ نەپەڕاندووە، بەڵام بابزانین حیزبی كوردی لەم بوارەدا چ پرۆسەیەكی ئەنجام داوە؟

پێشتر وتم میكانیزمی هێزی ئەم حیزبە هەمان میكانیزمی خێڵەكی - ئاینیی‌یە. باسەرەتا باس لە عەقڵە خێڵەكیەكە بكەین. گومان لەوەدانیە كە تاكی سەربەخێڵێك، واتە كەسێك كە خۆی بەئەندامی فیعلی خێڵێك دەزانێ و عەقڵێكی خێڵەكیانەی هەیە، ئەم پەیوەست بوونەی بەخێڵەوە لە ئاستێكی هێندە ئەخلاقی بەرزدایە كە خودی ئەو پەیوەست بوونە بەهایەكی ئەخلاقی پیرۆزی لای ئەم هەیە، چونكە خێڵ لای ئەو كەسە بونیادێكی پیرۆزە.

عەقڵی خێڵەكی بۆ پاراستنی جەستەی خۆی و مانەوەی هەمیشە ئەو قەناعەتە لای ئەندامانی دەوروژێنێ كە پیرۆزی ئەم جەستەیە ڕاستی‌یەكی بەڵگە نەویستە و بوونی ئەندامان لەدەوری خێڵ هیچ مانایەك بە (بوون)یان نادات، واتە بێ شوناس دەمێننەوە. بەڕادەیەك كە هەمیشە ئەوە دەسەلمێنێ ئەم خێڵە لە هەموو خێڵەكانی دی پیرۆزترە، تا كەسێك نەوێرێ بیر لەوە بكاتەوە پەیوەست بێ بە جەستەكەیەوە لە دەرەوەی جەستەی خێڵ، لێرەوە لای كەسێكی خێڵەكی خێڵەكانی دی جەستەیەكی پاك نین یان جێگەی گومانن، یان هیچ نەبێ وەك خێڵەكەی خۆی پیرۆز نین. بۆیە لای كەسێكی وا

بونیادێکی لەخێڵ گەورەتر کە خێڵەکانی تریشی گرتبێتە خۆ جێگەر گومانە.. بونیادێک کەپێی دەوترێ (نەتەوە) هەرگیز لەئاستی مەزنیو پیرۆزی خێڵدانیە، واتە شوناسی ئەو کەسە هێندەی شوناسی خێڵەکەیەتی شوناسی نەتەوەکەی نیە.

بەهەمان شێوە حیزبی کوردی هەمیشە ئەوە بۆ ئەندامەکانی دەسەلمێنێ کە جەستەی ئەم جەستەیەکی پیرۆزە و پەیوەست بوون پێیەوە ئەرکی هەموو دڵسۆز و شۆڕشگێڕێکە و تاکەکان لەناو ئەم جەستەیەدا بوونیان مانای تەواوەتی خۆی هەیە.

ئەم جەستەیە لە جەستەی حیزبەکانی دی پاک تر و پیرۆزتر و جوانترە.. بێگومان لەبەر نەبوونی مەعریفە و فیکر و ئایدۆلۆژیای سیاسەتێکی هاوچەرخانە تابێتە نێوەندێک بۆ ململانێی حیزبی کوردی لەگەڵ حیزبە کوردییەکانی دیدا. بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ خۆی لەهەموان شۆڕشگێڕترە. بەردەوە خەریکە چۆن بۆ ئەندامەکانی بسەلمێنێ کە حیزبەکانی دی شۆڕشگێڕ نین، هیچ نەبێ وەک ئەم.

تا ئەو قەناعەتە لای ئەندامەکانی دروست بکات کە ئەم حیزبێکی پێشکەوتوو خوازە، خەریکە بەدروست کردنی ئەو قەناعەتە لای ئەندامەکانی کە حیزبەکانی دی کۆنەپەرستن.. و بەم شێوەیە... ئەم ستراتیژە ئایینەیەی کە بەهەمان سروشتی (تکفیر)ە ئایینیەکە هزری حیزبی کوردی دەبزوێنێ، هێندەی دی ئەو حیزبە لە پیرۆزییدا نقوم دەکات، لێرەوە بەهەمان شێوەی بنیادمە خێڵەکیەکە، ئەندامی حیزبیش بەر لە هەموو شت گومان لە جەستەی هەموو حیزبێکی دی دەکاتو لەوێوەش گومان لە بونیادی ئەو نەتەوەیەی کە جەستەی ئەو حیزبانەشی لە ئامێز گرتووە.. بۆیە شوناسی نەتەوەش بەپلە دوو دێت (لای ئەم) لەپاش شوناسی حیزبەوە.

حیزبی کوردی لەڕاستیدا ئەگەر بە دروست کردنی شوناسێکەوە خەریک بووبێ تەنها شوناسی حیزبەکە خۆی بووە، بەشێوەیەک کە شوناسی نەتەوە بەردەوام لە بچووک بوونەوە دابووە تا ئەو ئاستەی جەستەی ئەم حیزبە پێی هەزم بکرێ. ئەم جەستە پیرۆزەی کە دەقاودەق دەبێ بڕیارەکانی وەک فەرزەکانو ئەرکو ئەرێکانی وەک فەرمانی خوایانە لەلایەن ئەندامانەوە بێهیچ پرسیارو دوودڵیەک بەئەنجامی بگەیەنن، فەرزێک کە لەگەڵ ڕەهەندە سیاسیەکەشیدا دەلالەتێکی ئەخلاقی گەورەی هەبێت.

تالەناو ئەم جەستەیەدا ئەندام لەگەڵ هەست کردنیدا بەدڵنیاییو ئارامی دەروونی. هەرگیز جورئەتی ئەوە ناکات کە بیر لەوە بکاتەوە کە لەوانەیە جەستەیەکی هەبێ لەجەستەی حیزب پرۆزتر، یان هیچ نەبێ وەک ئەم پیرۆز بێ، چونکە ئەمە بەر لە هەموو شتێک گومانێکە لە پیرۆزی حیزبو گومانیش کەسەکانی بەردو مەڵدێری گومڕاییو کوفر دەبات. بەڵی حیزبی کوردی بەو میکانیزمە ئایینیە نیش دەکات تا بگاتە ئەو ئاستە لە

پیرۆزی وەک دۆزکایم لە دوالیزمی ئایین و باو (المألوف)دا ئاماژەی پێداوە: تێکەڵەیەک بێت لە هەیبەتو ڕێزو پەنهانی.

بێگومان جگە لە هەر فاکتەرێکی بابەتیو زاتی قەیرانی فیکریو مەعریفیو ئایدۆلۆژی کارێکی وا دەکات حیزبی کوردی هەمیشە وا بەستەی ئەو عەقڵیەتە ڕاستتر بڵێم ئەو ناعەقڵانیەتە بێ. ئەو چەمکانە کە بەشێوەیەکی جدی بونیادی حیزب دەپارێزنو تازەی دەکەنەوە ئەویش لەرێگەی خوێندنەوەی تازەو ڕەخنەگرانەوە؛ کە حیزبیش ئەو چەمکانەی شک نەبرد ئیدی پەنا دەباتە بەر ئەو میکانیزمە ئایینیە کە لە مێژە لەنەستی کوردیدا کار دەکات.

بەپیرۆز ڕاگرتنی جەستەی حیزب بەو شێوە ڕەهایەی کە بوار بۆ هیچ پرسیارو گومانێک نەهێڵێتەوە ئەم جەستەیە لەبونیادێکی سیاسیەوە دەگۆڕێت بۆ بونیادێکی ڕەمزیو لەجیاتی ئەوەی هزرەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکەنو ئەویش مامەڵە لەگەڵ هزردا بکات دەچێتە نەستەوەو لەوێوە هەیمەنە بەسەر هەستی تاکەکاندا دەکات. ئەم واقیعەش بە ئاشکرا لە فەزای سیاسی کوردیدا ڕەنگ دەداتەوە کە سروشتێکی ئایینیانەی هەیەو دوورە لە خوێندنەوەی جدیانەی فیکری و تیۆریو ئایدۆلۆژیو مەعریفیو سیاسەتێک کە هەرگیز بەقەرەی زانستی سیاسەتدا ناچێت، سیاسەتێک زیاتر بە پیشەیەکی (مهنة) ئاسایی دەچێتو لە خولگەیەکی داخراودا لەسەر هێڵی (ئیجتهاد)ی چەند کەسێکو لەبەرژەوەندی ئەو کەسانەو ئەو جەستە پیرۆزە بەڕێوە دەچێت کە ئەمانی لەخۆگرتووە.

بەم شێوەیە گەڕان بەناو پەیڕەوو گوتاری حیزبی کوردیدا بەمەبەستی نرخاندنی چەمکی شوناس لە پرۆسەیەکی هەڵخەڵەتێنەر بەولاوە هیچی دی نیە. چونکە بوونی ئەم چەمکە لەناو گوتارەکەیدا بوونێکی ڕەمزییەو بۆ جوانکردنو ئارایشت کردنی ئەو گوتاردو سیمای حیزبەکەیە.

ستراتیژی حیزبی کوردیش جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ ستراتیژی خێڵدا لەمەڕ تەسککردنەوەی ئاسۆی بونیادی نەتەوەو توانەوەی لەناو جەستەی حیزبداو بەپەراوێزکردنی هەستی نەتەوەیی لە ئاست هەستی پەیوەست بوون بەحیزبەوە. کە تێیدا ئەندامان لەسەر هەمان میکانیزمی ئایینی پەروەردە دەکرێن کە ئاراستەکەی هەمان ئاراستەی دوالیزمی باوەڕداریی ڕەهاو بەنەفرەت کردنی ڕەهای هەیە. باوەڕبوون بەپیرۆزی جەستەی حیزبو لەوێشەوە پیرۆزیی هەموو بڕیارو ئەرێو نەرێکانی حیزب. بەرامبەر بەمیش بەنەفرەت کردنی بەردەوامی ئەو جەستانەی دی کە لەدەرەوەی جەستەی حیزبدان، تا ئەو ڕادەیەی لە کاتی قەیرانی جیاوازییە فیکریو ستراتیژییەکانی نێوان دوو حیزبدا، ئیدی فۆبیای (شیرک) واتە شەریک پەیدا کردن بۆ

حیزب جەستەی ئەو حیزبە دادەگرێو لای ئەندامانی حیزبیش وەک لای باوەڕدارانی ئایین شەریک پەیدا کردن بۆ حیزب وەک شەریک پەیداکردنە بۆ یەزدان بەگەورەترین کوفر. کوفری سیاسی دەژمێررێت. هەر بۆیە ئیشی حیزبی کوردی لەکاتێکدا بۆ بەپیرۆز ڕاگرتنی شوناسی خۆیەتی، بەلام بەرامبەر بەم هەستە گرێیەکی ئەگرێسیڤی ( علوانی ) بەرامبەر شوناسی ئەوی دی ( حیزبی کوردی دی ) لادروست دەبێ؛ نەبوونی بنەماکانی دیموکراسی لە کۆمەڵگای کوردیدا هێندەی دی ئەم گرێیەی لا قووڵتر ئەکاتەوە؛ بەڕادەیەک کەوێنا کردنی بۆ حیزبێکی تری کوردی خەتەر نابێت لەو وێناکردنەی کە بۆ دوژمن ( داگیرکەر ) دایڕشتووە، چونکە وەک ( سەروەر ئەحمەد ) دەڵێ: حیزبی کوردی کەوێنەی دوژمنی لانەما ئیدی چ بەهانەیەک بۆ بوونی خۆی دەدۆزێتەوە؟ بەڵێ ئەگەر بوونی دوژمن هەمیشە سەلمێنەری بوونو بەپێویست زانینی ئامادەبوونی حیزبی کوردی بووبێ. ئەم پێویستی‌یە لەکاتی ئامادەبوونی حیزبێکی تری کوردیدا جەستەی ئەو حیزبەی خستۆتە بەرپرسیارو حیزبی کوردیش ئەو بونیادەیەکە هەرگیز قبووڵی پرسیاری ئاناکات. پرسیارێک کە بچووکترین گومان لەدەوری ئەم جەستەیە بوروژێنێ. هەر بۆیە حیزبی کوردی هەمیشە دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە حیزبێکی گشتگیرە، حیزبی هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگای کوردییەو دەرگاکانی لەبەردەم هەموو ئەندامانی نەتەوەدا والایە!. چونکە لەقەناعەتی ئەم حیزبەدا ئیرادەی نەتەوە بریتی‌یە لەو ئیرادەیەی کە حیزب دەتوانێ بەرجەستەی بکات. جەستەی نەتەوەش ئەوکاتە وەک ( بوون )ێک دانی پیادەنرێت کە بتوانێ بچێتە ناو جەستەی حیزبەوە!!

بەختیار عەلی لە ( کۆمەڵگای پرسە ) دا دەڵێ: حیزبی کوردی ئاشێکە خوێن ئەیگێڕێ، ئاماژە پێدانم بەم ڕستەیە، بەهەمان مەبەستی بەختیارنیە، کە بۆ خوێندنەوەی مەرگدۆستی- یان لەم رستەیەدا- چەمکی خوێنو پیرۆزی ئەم خوێنەیە لەکلتووری حیزبی کوردیدا، بەڵکو مەبەستم میکانیزمی ئیشی حیزبی کوردییە، لەوێنەی ئاشێکدا کە بەردەوام ئیشی هاڕینو هاڕین بێت. بۆیە بەبڕوای من حیزبی کوردی پرۆژەیەکە بۆ بچووک کردنەوەی هەموو پرۆژەیەکی دی کە گەورەتر بێت لە ئیرادەو جەستەی حیزبەکە.. بچووک کردنەوەی پرۆژەی تەوارەی نەتەوە لەناو پرۆسەی پاراستنی قەوارەی ئەوی دی ( داگیرکەر )دا.. بچووک کردنەوەی پرۆژەی بوون بەنەتەوە لەناو پرۆسەی خێڵەکیانەی ئۆتۆمی حیزبداو لەناو پرۆسەی دەزگاکانی حیزبدا.

حیزبی کوردی کاتێک لە چارەنووسازترین پرۆژەدا ئاگەڕێتەوە بۆ ئیرادەو ( بوون )ی کۆمەڵگاو ئەگەر لەدەرەوەی خۆی شوێنێک هەبێت ئەوا ئەو شوێنە ( ئەوی دی )یە، هەر لە دەوڵەتە ئیقلیمی‌یەکانەوە تا دەگاتە ولاتانی خۆرئاوا، بەمە دەیسەلمێنێ کە ئیرادەی ئەم نمایندەی ئیرادەی کۆمەڵگاکەی نیە. بەم پێیە ئەم بونیادە سیاسیە بەناو هەر

مێژوویەکەدا بگەڕێت هەرگیز بەناو مێژووی کۆمەڵگاکەیدا ناگەڕێ. ئەو نێوەندەش کە (ئەوی دی) بۆی دەستنیشان بکات بێگومان پەراوێزێکە لە پەراوێزەکانی ئەوی دی. بۆیە من لەو بڕوایەدام ئەگەر حیزبی کوردی بۆ ناوەندێک یان پانتاییەک گەڕابێ ئەوا ئەو پانتاییە هەمیشە لە پەراوێزدا بووە، چونکە بەر لە هەموو شتێک تاک (فرد) لەدیدی حیزبی کوردییدا بوونەوەرێکە لە پەراوێزی کۆی حیزبدا، تاکێکی وابەستە بەجەستەی کۆوە کە وەک بونیادێکی ئۆتۆنۆمو تایبەتمەند هەرگیز هەست پێکراوو دانپیانراو نییە. بێگومان کۆمەڵگای کوردی وەک کۆمەڵگایەکی پاتریارکیسی دواکەوتووی خێڵەکی، خۆی نێوەندێکی لەبارە بۆ هەیمەنەکردنی دەسەڵاتی کۆ بەسەر ئیرادەی (تاک)داو تواندنەوەی بوونی تاک لەناو بونیادی کۆدا، نەک بەشێوەیەک کە تاکەکان پێکەوە کۆیەک بەرهەم بهێنن و یەکدی تەووا بکەن. بەڵکو وەک خانەیەکی ئیرادەو بوون زەوت کراو لەناو ئۆرگانێکدا کە رەفتارو هەستو ئەستیشی لەسەرەوە کۆنترۆڵ کراوە.

لێرەوە بەر لەهەرشتێک لە دیدی ئەم کۆمەڵگایەدا چەمکی (جیاوازیی) کە بنەمای دامەزراندنی شوناسو کەسایەتی هەموو تاکێکە، چەمکێکی قێزەونەو یەکێکە لەنەرێکان. بۆیە هەر لەسەرەتاوە تاکی کوردی ئەو ئیرادەیەی لێزەوت کراوە کە وەک تاکێکی جیاواز لەناو کۆدا دەربکەوێ، چونکە ئەم رەفتارەی تاک لەدیدی کۆدا زەنگێکی خەتەرەو هەڕەشە لە جەستەی پیرۆزی کۆ دەکات. ئەم رەفتارەی کۆ لەگەڵ تاکدا کە دەشێ ئیسلام وەک ئایینی سەرەکیی ئەم کۆیە رۆڵێکی گرنگی بینیبێ، ستراتیژێکە کە تیایدا تاک تەنها هەڵگری کەسایەتی سەپێنراوی کۆیە، یان بڵێین هەڵگری شوناسی سەپێنراوی کۆو هیچ شوناسێکی سەربەخۆی نیە کە بوونی وەک بوونەوەرێکی ئیرادەگەر لەناو بونیادی کۆمەڵگادا بسەلمێنێ. هەر بۆیە ئاساییە گەر تاکێک جورئەتی ئەم سەلماندنەی هەبێ، ئەوا لەناو هزری کۆمەڵگاداو بەپێی نرخاندنە ئەخلاقیەکانی کەسێکی گومڕاو سەرکەشو بێزراو بێتو تەنانە لەگەڵ هەست کردنی ئەم تاکە بەو جیاوازییانە. جیاوازی (من)ی خۆی وەک خودێک لەهەموو (من)ەکانی تری ناو کۆمەڵگا، یان بەشێوەیەکی دی بڵێین جیاوازی شوناسی سەربەخۆی خۆی لەشوناسی کۆ. لەگەڵ ئەم هەستەدا ئاساییە هەستێکی قووڵ بەنامۆیی لادروست بێت. ئەم هەست کردن بە نامۆ بوونە (إغتراب) گەر ڕوانگەیەک شک نەبات تا لەوێوە بەشێوەیەکی عەقڵانی جەستەی کۆ ببینێتو بیخوێنێتەوە، گەر پردێکی پەیوەندی شک نەبات تا لەڕێگەیەوە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەکۆوە بکاتو بچێتە ناوی و لێودی بێتە دەردوە. ئەوا بوونێکی هێند داخراوی دەبێت کە هیچی کەمتر نیە لە تواندنەوەی (تاک) لەناو بونیادی کۆداو خۆکوشتنێکی هێمنو لەسەرخۆی (خود)ە. ئەم دیدگا عەقڵانیە خۆی لە خۆیدا پرۆژەیەکی ڕۆشنبیری دەخوازێ، ڕۆشنبیریەکی نوێگەرانە لەناو واقیعی کۆمەڵگادا. کە

لەلایەکەوە توانستی ناسینی (خود)ی هەبێ و بەدەر لە دیدی تەقلیدیەت توانای ناسینی (کۆ)شی هەبێت. بێگومان ئەم پرۆسەیە بەر لە هەرکەس لای ئەم تاکەیە کە ئەو ئیرادەیەی دەستەبەرکردووە کە پێشتر ئاماژەم پێدا. لێرەدا مەبەستم ئەوەنیە ئەم پرۆسەیە تەنها پرۆسەی تاک بێ و لە ڕەهەندی تاکخوازیەوە بەناو جەستەی کۆدا پیادەبکرێت. بەڵکو پرۆسەیەکی رۆشنبیرییە وگەڕانە بەدیدێکی گوماناوییەوە بەناو مێژوودا. تەماشاکردنی مێژووە وەک کۆمەڵێک هەڵوێستو پرۆسەی کراوە کەشیاوی خوێندنەوەی تازەو رەخنەو بەستنەوە بن بەئێستاوە نەک بینینی مێژوو بەتەنها وەک کۆمەڵە ڕووداوێکی داخراو چەند بنەمایەکی ئێکسپایەر لەزەمەنێکی جیاواز لە ئێستادا. بەبروای من کۆمەڵگایەک کە ئیرادەی تاکەکانی تێدا زەوت کرابێ، زەحمەتە بۆ خۆیشی خاوەنی ئیرادەیەکی سەربەخۆ بێت.. کۆمەڵگایەک کە تاکەکانی هەمیشە لە پەراوێز دابن خودی کۆمەڵگاکەش هەمیشە لە پەراوێزدایە.. کۆمەڵگایەک کەدان بەجیاوازی تاکەکانیدا نەنێ و رێز لە شوناسە جیاوازەکانیان نەگرێ، زەحمەتە بتوانێ جیاوازی خۆی لەئەوی دی لەدەرەوەی پەراوێزدا بسەلمێنێ و رێز لە شوناسی خۆشی بگرێت.. کۆمەڵگایەک کە هەنگاوی یەکەمی (بوون)ی لە بوونی تاکەکانیەوە دەستی پێنەکردبێت. واتە کەسایەتیەکەی هەڵگری کەسایەتی تاکەکانی نەبێ یان بڵێین شوناسەکەی جێگەی شوناسی تاکەکانی تیا نەبێتەوە، هەمیشە بوونێکی سەپێنراو بەسەر تاکەکاندا لەدەرەوەی ئیرادەی خۆیان دەسەپێنێ و زەحمەتە ئەو تاکانە وا بەئاسانی فێربن رێز لەبوونی جیاوازی یەکدی بگرن وەفێری پێکەوە ژیان بن لەناو جیاوازییەکانیاندا. واتە شوناسی نەتەوە ئەگەر بوونێکی فیعلیشی هەبێ، نابێ وەک چەمکێکی پیرۆزو بالاو هەیمەنکەر بەسەر هەستو نەستی تاکەکاندا دەربکەوێ و بەعەقڵێکی ئایینیانە مامەڵەی لەگەڵا بکرێ، چونکە بەم پێیە شوناس جگە لە دۆگمای نەتەوە پەرستی و گوتاری شوناسیش جگە لە ئایەتەکانی شۆڤێنیزم هیچی دی نین. شوناسی نەتەوە یان کۆمەڵگا چەند پیرۆزیش بێ. نابێ شوناسی تاکی تیا بچەپێنرێ و بسڕێتەوە.

دەکرێ لەگەڵ شوناسی کۆمەڵگادا جیاوازییەکانیش بوونی خۆیان سەربەخۆیانەو ئیرادەگەریانە بپارێزن، واتە شێوە ژیانێکی دیموکراسیانە پەیرەو بکرێت، چونکە لەقەیرانی دیموکراسیدا بەرلەهەموو کەس (بوون) و ئیرادەو شوناسی تاک دەکەوێتە بەر مەترسی سڕینەوەو لەناو چوون و هەر ئەم شوناسەشە کە هەمیشە دەکەونە بەر شالاوی نەفرین و کلۆمانی بێ سەروبەری یەکدی و لەوێشەوە تێکڕای کۆمەڵگا لەو فەوزایەدا دەژی. دیموکراسی وەک (ڕێبین هەردی) دەڵێ: چەند چەمکێکی سیاسییە هێندەش دەلالەتێکی ئەخلاقی هەیە. هەر لەم بۆچوونەوە، گەر بەها ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگا بەو شێوە عەقلانییە بنرخێنرێن، گەر لەو دیدگایەوە مامەڵە لەگەڵ شوناسە

جیاوازه‌کانی ناو بونیادی کۆمه‌ڵگادا بکرێت، له‌و بڕوایه‌دام هه‌رگیز له‌به‌ر جیاوازی شوناسی حیزبو خێڵو گروپه‌کان، شوناسی نه‌ته‌وه به‌پله‌دوو له‌دوای شوناسی حیزب یان خێڵه‌وه نه‌ده‌هاتو جه‌سته‌ی نه‌ته‌وه له‌په‌راوێزی جه‌سته‌ی حیزبدا دانه‌نراو به‌رژه‌وه‌ندیه‌کانی حیزب له‌سه‌ره‌وه‌ی لیستی به‌رنامه‌و ستراتیژی حیزبی کوردیدا نه‌ده‌بوو.

وه‌ک پێشتریش ئاماژه‌م پێ‌دا پرۆسه عه‌قڵانیه‌کان به‌رله هه‌موو شتێک پرۆژه‌یه‌کی رۆشنبیری ده‌خوازن. گرفتی سه‌ره‌کی کۆمه‌ڵگاکه‌شمان له‌وه‌دایه که سیاسه‌ت به‌شێوه‌یه‌کی خه‌ته‌رناک هه‌یمه‌نه‌تی به‌سه‌ر هه‌موو کایه‌کانی ژیانی کۆمه‌ڵگادا کردووه، سیاسه‌تێک که پرۆسه‌ی حیزبی پیرۆزه‌و ره‌هه‌ندێکی پیرۆزیشی پێ‌به‌خشراوه.. بێگومان حیزبی کوردی نه‌ک هه‌ر ئاماده‌ی قبووڵکردنی پرۆژه‌یه‌کی ره‌خنه‌گرانه‌ی بوێری نییه، که بتوانێ گومان له‌پیرۆزی هه‌موو به‌هاو بونیادێک بکات که حیزبی کوردی خۆی یه‌کێکه له‌و بونیادانه، بگره به‌رده‌وام رێگره له‌به‌رده‌م ئه‌م پرۆژه‌یه‌شدا. به‌ئاشکراش ده‌بینین حیزبی کوردی چۆن کێشه‌ی وه‌لاتانو به‌په‌راوێزکردنی رۆشنبیری کردوته پرۆسه‌یه‌کی گرنگی خۆی.

لای ئه‌م بونیاده سیاسیه، رۆشنبیریی ده‌بێ ته‌نها له‌ناو کۆمه‌ڵێک ده‌قی مردوو و نمایشی نوکته ئامێزو پیاهه‌ڵداندا ده‌رنه‌چێت. هه‌ر بۆیه که‌سی رۆشنبیریش لای ئه‌و هه‌میشه ده‌بێ کوێخایه‌کی خه‌تخۆش یان مه‌لایه‌کی ده‌نگخۆش یان قه‌ره‌قوزێکی حازر به‌ده‌ست بێت.

هه‌ر بۆیه رۆشنبیر وه‌ک بوونه‌وه‌رێکی وروژێنه‌ری پرسیاره گوماناویه‌کانی ( چۆن ) و (بۆچی ) هه‌میشه شوناسێکی قێزه‌ونی له‌دیدی حیزبی کوردیدا هه‌یه‌و به‌ر له هه‌ر تاکێکی کۆمه‌ڵگا حیزبی کوردی شوناسی رۆشنبیر ره‌تده‌کاته‌وه؛ ره‌تکردنه‌وه‌ی شوناسی رۆشنبیر واتا ره‌تکردنه‌وه‌ی هه‌موو پرۆژه رۆشنبیریه‌کان که به‌دیدێکی تازه‌وه‌و به‌جیهانبینی‌یه‌کی جیاواز له باو خۆی ده‌رده‌خات. ئه‌م ره‌فتاره‌ی حیزبی کوردی واده‌کات خوێندنه‌وه‌ی جه‌سته‌ی کۆمه‌ڵگاو نه‌ستو مێژووی کۆمه‌ڵگا به‌پێشوازێکی ره‌خنه‌گرانه‌و به‌میتۆدێکی عه‌قڵانی نه‌ک هه‌ر کارێکی زه‌حمه‌ت بێ، بگره به‌گوناهێکی گه‌وره‌و تاوانێکی نادروستیش له‌قه‌ڵه‌م بدرێ. بێگومان ئه‌مه زیاترو زیاتر هه‌یمه‌نه‌تی ته‌قلیدیه‌ت فراوانترو به‌هێزتر ده‌کا له کۆمه‌ڵگاداو یه‌کێک له نماینده‌کانی ته‌قلیدیش بگره له‌به‌هێزترینو دیارترین نماینده‌ی ته‌قلیدیه‌تن که زۆربه‌ی زۆری دیدگا کۆن خوازه‌کان له‌وه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرن، هزری ئایینی‌یه‌که له‌کۆمه‌ڵگای ئێمه‌دا ئیسلام رۆڵی ئه‌و ئایینه ده‌بینێ. لێره‌وه جێی خۆیه‌تی به‌خێرایی چاوێک به‌گوتاری ئیسلامیدا، روونتر بڵێم ئیسلامی سیاسی ده‌فه‌ره‌که‌ماندا بخشێنینو هاوکات که‌مێک له‌ستراتیژی

ـلی ئیسلامی رامێنینو بزانین ئەمان وەک نمایشکەرێکی تری سەر شانۆی سیاسی کوردی بەچ شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ چەمکی شوناس، شوناسی کوردیدا دەکەن. من لەو باوەڕەدام کە هیچ باڵێکی سیاسی دەقەرەکەمان هێندەی باڵە ئیسلامییەکان بەوردیو بەمیتۆد ئیش بۆ شوناسەکەیان ناکەن. ئەگەر حیزبەکانی دی بەپێی پێداویستی زاتیو سروشتی بونیادی حیزبو بەهای حیزب ئیش لەسەر شوناسی کوردی بکەن بەو شێوەیەی کە ئاماژەمان پێدا. ئەوا ئیسلامیستەکانی کوردستان دەقاودەق بەپێی ئایدۆلۆژیەتێکی دیارو ستراتیژێکی بەرنامە بۆ دارێژراو کاری بۆ دەکەن. ئەگەرچی رەهەندە ئایینیەکە هەمیشە لەبەرچاوەو زۆر بەزەقی بەگوتارەکانیانەوە دیارەو ئەمەش بۆ ئیسلامی سیاسی زۆر ئاساییە. بەڵام میتۆدی ئیش کردنیان جیاوازە لە حیزبی کوردی کە زیاتر وەک پەرچەکدار ستراتیژیان دیاری دەکەن. بەڵام لای ئیسلامی سیاسی ستراتیژ بەر لە هەر شتێک دیاریکراوەو تەکتیکە سیاسیەکانن هەمیشە لەگۆڕانو جێگۆڕێکیو پۆشاک گۆڕیندان نەک ستراتیژ وەک لای حیزبی کوردی دەردەکەوێت. بەپێویستی نازانم میکانیزمی عەقڵی سیاسی ئەم گوتارە بێنینە بەربارس چونکە زۆر لە گوتاری سیاسی حیزبە کوردیەکانی دی ئاشکراترو ڕوونترەو پێویستیش ناکات خۆمان بەسەلماندنی ستراتیژی (تکفیر)ەوە خەریک بکەین لەم گوتارەدا، چونکە سەروبنی گوتاری ئیسلامی سیاسی لە (تکفیر) و (تقدیس)دا تقووم بووە. سەرەتا ئەوەش شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەم گوتارە کەدێت بە کۆمەڵێک وەڵامی ئامادەکراوو حاشا هەڵگرنەوە دێت. ئەویش هاوشان لەگەڵ ئەو نەگۆڕانە (ثوابت)دا کەلە هزری ئایینیدا چەسپیوون کە تێکڕا سروشتێکی پیرۆزیان هەیەو هیچ گومانو تەنانەت پرسیارێکیش قبوول ناکەن. چونکە بەپێی قەناعەتی ئایینی هزری ئینسان ئەو شەرەفەی پێنەدراوە کە توانای پرسیارکردنی هەبێ لە نەگۆڕەکانی ئایین کە کۆمەڵێک نهێنی یەزدانینو تەنها وەڵام لای پەروەردگار خۆیەتیو بەس. ئەگەر چی سەرەتا واهەست دەکرێت کە عەقڵیەتی ئەمانو حیزبی کوردی یەک سروشتیان هەبێ، راستتر بڵێم نەعەقڵانیەتی گوتاری ئەمانو گوتاری حیزبی کوردی لەیەک ڕەهەنددوە ناڕاستە بکرێن. بەڵام لەڕاستیدا ناڕاستەی ستراتیژیان جیاوازە. ئەگەر چی لەهەردوو باردا شوناسی کوردی قوربانیەکی هەمیشەییە بەڵام لەهەردوو حاڵەتەکەدا بەیەک نید سەیر ناکرێت.

ئیش کردنی ئیسلامیەکانی کوردستان لەسەر شوناسی کوردی گواستنەوەی ئەو شوناسەیە لە قەیرانێکەوە بۆ قەیرانێکی گەورەترو لەپەراوێزێکەوە بۆ پەراوێزێکی نوێتر. چونکە لای ئەوان شوناس بەر لە هەموو شتێک شوناسی ئیسلامەو کەسێک بەر لەوەی هەرچییەک بێو هەر شوناسێکی هەبێ شوناسی ئیسلام یان غەیرە. ئیسلام شوناسی سەرەکیەتی. واتە شوناسی ئیسلام یان شوناسی ئەنتی ئیسلام ئەگەرچی زۆر

جار دەوترێ شوناسی ئیسلام هێڵێکی ڕاستو چەپ بەسەر شوناسی نەتەوەییدا ناهێنێو قەوارەی نەتەوە دەتوانێ لەناو قەوارەی گەورەی ماڵی ئیسلامدا پارێزراوبێتو ئیسلام خۆی دان بەبوونی جیاوازییەکانی ناو بونیادی خۆیدا دەنێو (إنا خلقناکم شعوبا وقبائل، لتعارفوا) بەبەڵگەی ئەم بۆچوونە دەهێننەوە. بەڵام ئەم حەقیقەتە ناسڕێتەوە کە شوناسی کوردی لەسایەی شوناسی ئیسلامیدا هەمیشە لە پەراوێزدایە، واتە شوناسی دووەمی تاکەکانەو قەوارەی نەتەوەش لە پەراوێزی قەوارەی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدایەو بە وابەستەبوونیەوە لە هەموو کایە ئابووری سیاسیو ئیدارییەکانەوە بەڕێوە دەچێ.

ئەگەر بەر لە بەئیسلامبوونی (أسلمة) کورد شوناسی کوردی بەتایبەت لەسەردەمی میدییەکاندا مانابەکی هەبووبێ، ئەوا بەباڵکێشانی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی بەسەر ناوچەکەداو موسڵمان بوونی کورد ئەو شوناسە خراوەتە پەراوێزەوەو ئیدی شوناسی کوردی بووە بەشێکی بچووک لە شوناسی ئیسلامو تاکی کورد بەو ئاراستەیە پەروەردەکراوە کە بەر لە هەموو شتێک خۆی بە موسڵمانو هاولاتیەکی دڵسۆزی قەوارەی ئیسلامی بزانێو ئەرکی پاراستنو بەرگریکردن لەو شوناسەو قەوارە ئاینیە ببێتە فەرزێکی ڕەهاو لەوێشەوە ببێتە ئەرکێکی ئەخلاقی سەرشانی ئەو تاکە. ئەو هەموو ناوە گەورانەی کە لە هەموو بوارەکانی سیاسیو سەربازیو فەرهەنگیو فیکریدا کە بەرەگەز کورد بوونو تەنهاوتەنها خزمەتی کلتوورو شارستانیو قەوارەی (ئیسلامی-عەرەبی)یان کردووە بەڵگەیەکی زیندووی ئەو بۆچوونەی سەرەوەن.

لەڕاستیدا هیچ نەتەوەیەکی موسڵمان هێندەی کورد ئامادەنەبووە شوناسی خۆی بکاتە قوربانی ئەو شوناسە ئاینییەی کە (ئەوی دی) هێناویەتی. بۆیە ئەم ئامادەبوونەی کورد بۆ وەرگرتنی ئەو شوناسە بەو شێوە ڕەهاو گشتگیرە کە لەبەرامبەریدا شوناسی نەتەوەیی خۆی بچەپێنێ پرسیاری زۆر هەڵدەگرێ. چونکە نەتەوە هەبووە وەک تورکو فارس جگە لەعەرەب نەک هەر شوناسەکەیان نەکردۆتە قوربانی شوناسە ئاینیەکە. بەڵکو ئەو شوناسەشیان لەبەرژەوەندی شوناسی نەتەوەییان بەکار هێناوە. بۆیە جێی خۆیەتی بپرسین ئایا بۆچی لەناو هەموو ئەم نەتەوانەدا کورد نەیتوانیوە سوود لەو شوناسە ئاینە وەرگرێ؟ تۆبڵێی کێشەی نەبوونی قەوارە ڕێگربوویێ یان فاکتەری دەروونیو کۆمەلایەتیش ڕۆڵی خۆی لەم لایەنەوە بینیبود؟ کێشەی سەرەکی- بەبڕوای من- لەم بوارەدا لەوەدایە کە ئامادەبوونی شوناسە ئاینیەکە لە هزری کۆمەڵگادا نا ئامادبوونی شوناسە نەتەوەییەکە بسەپێنێ. ئەگەر وانەبا، ئەدی بۆ لەگەڵ شکستهێنانی شوناسی ئیسلامیداو ڕمانی قەوارەی ئیسلامی (دەوڵەتی عوسمانی)دا دیسانەوە شوناسی کوردی تووشی قەیران هاتەوە؟ ئەگەرچی

ئەمجارەیان دەقاودەق قەیرانێکی سیاسی بوو بەڵام ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لەوەوپێش شوناسی کوردی لەسایەی شوناسی ئیسلامیدا ئامادەبوونێکی فیعلی نەبووە؟ واتە شوناسێکی سەربەخۆنەبووە کە توانستی پاراستنی تایبەتمەندێتی خۆیو جیاوازیەکانی خۆی هەبووبێ لەناو بونیادە ئایینیەکەدا.

بەڕاستی ئەگەرچی ئیسلامی سیاسی ڕێگرو ئەنتی زۆری هەیە بەڵام ئەم ستراتیژەیان لە کوردستاندا بەکارێکی زۆر گران نابینم تا نەتوانن ئەنجامی بدەن. چونکە لەلایەکەوە لەم بارودۆخەداو لە ئاکامی شکستی بەردەوامی حیزبە قەومیەکان دەبینین بە ئاشکرا هەستی نەتەوەیی لەپاشەکشەدایەو چەپەکانی کوردستانیش زۆر لەوە لاوازترن بتوانن ئەو بۆشاییە قۆرخ بکەن، لەلایەکی ترەوە ئیسلامیستەکان لەسەر وەتەری حەساسی کۆمەڵگای کوردی ئیش دەکەن. ئەوان چاک دەزانن ئەستی کوردی چۆن سێناخە لەئەریو ئەرێکانی ئایین.. دەزانن ئایین چۆن ئەخشەی کامڵو گشتگیری بۆ بەها ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگاکە داناوە. بۆیە زیاتر کاری ئەوان لەم بوارەدا لەسەر ئەو چەمکانەیە کە لەو کایەیەدا دەخولێنەوەو بەمەش لە گەورەترین دەروازەوە خۆیان دەکەن بەناو کۆمەڵگای کوردیدا، کۆمەڵگایەک کە تیایدا عەقڵانیەت گەورەترین تاوانباری گومراو ئەفرین لێکراوە. پێویست ناکات ئەوە بسەلمێنین کە لە کۆمەڵگایەکی لەم بابەتەدا هەردەبێ پیرۆزترین شوناس شوناسی ئایینی بێ. کە شوناسێکی یەزدانیە.

بەقەناعەتی من ئەوانەی کە ئیسلامیستەکان لەناو کۆمەڵگای کوردیدا بەڕێگریان بزانن لەبەردەم پیادەکردنی ئەم ستراتیژەیاندا، بەر لە هەموو کەس (ئەگەر نەڵێم بەتەنها) ئەو بوونەوەرە گومانکەرە پرسیار وروژێنەرەیە کە جگەلەمان بەر نەفرەتی حیزبی کوردیش کەوتووە. چونکە ڕۆشنبیان بەر لەهەر کێشەیەک کێشەیان لەگەڵ هەموو بونیادێکی پیرۆزدا هەیە چونە ئەوان دەوێرن گومان لەو پیرۆزیە بکەنو بگرە بشڵێن: (نا)..

لێرەدا وەنەبێ مەبەستم لەوەبێ کەکاری ڕۆشنبیر لەم لایەنەوە تەنها پاراستنێکی کوێرانەو بەرگریکردنێکی ڕەهایانەبێت لەشوناسی نەتەوەییو خودی ئەم شوناسە بەبەهایەکی پیرۆز بزانێ. نەخێر.. هەرگیز. چونکە مامەڵەی ڕۆشنبیر لەگەڵ هەموو چەمکو دیاردەکاندا مامەڵەیەکی عەقڵانیەو دیدی ئەم دیدێکی ڕەخنەگرانەیەو، لە هەموو خوێندنەوەیەکیدا بۆ جەستەی ئەم شوناسە بوێرانە دەست دەخاتە سەر برینەکانو ئازاری شوناسەکە دەدات. خودی چەمکی شوناسیش دەقاودەق ڕۆشنبیریەو بەر لە هەموو کایەیەک پرۆسەیەکی ڕۆشنبیریی دەخوازێت. پرۆسەیەکی هەمەلایەنەی پەیوەندیدار بەهەموو کایە کۆمەڵایەتیو مەعریفیو شارستانیو فەرهەنگیەکانەوە؛

بێگومان رەهەندە سیاسییەکەی شوناسیش کە لەبوونی تەوارەدا مانای فیعلی خۆی هەیە. ئەویش بەبێ کایە رۆشنبیرییەکە زیاتر وەک نوکتەیکی سیاسی دێتە پێش چاو.

بێگومان پرۆسەی رۆشنبیریی لە کۆمەڵگای کوردیدا وێڕای رۆڵی سلبیانەی حیزبی کوردیو باڵە ئیسلامییەکان کارێکی گرانەو نەفەسێکی درێژی ئەوێ. وەک لەوەوپێش ئاماژەم پێدا بەبێ ئەم پرۆسەیە زەحمەتە بتوانرێ دەستنیشانی شوێنی ... سیاوی شوناسی کوردیو خاڵە هێزو لاوازەکانی بکرێت بەشێوەیەک کە مانایەک بۆ ئەو بچووکیو پەراوێزییەی بدۆزرێتەوەو تیایدا ئەو ئیرادەیە دەستەبەر بکرێ کە راستگۆیانە خودی پێ بخوێنرێتەوە. تا ئەو بوێریەش دەستەبەر نەکرێ کە لەگەڵ خوددا راستگۆبین زەحمەتە فۆبیای ئەوی دی بەرمان بدات. تا لەخوێندنەوەماندا ئازاری جەستەی کلتووریو کۆمەڵایەتی خۆمان نەدەین، زەحمەتە لەناو پەراوێزی ئەوی دیدا هەست بە ئازار دانمان بکەین.

عەقڵی سیاسی کوردیش گەر ئامادەی قبووڵکردنی ئەو پرۆسەیەی هەبێ. ئەبێ رازی بێت هەموو بەها نەگۆڕو پیرۆزەکانی ناو هەستو نەستی کۆمەڵگای کوردی بخرێنە ژێر مایکرۆسکۆبێکی رەخنەگری واوە کە هیچ جەستەیەکی سەرسڵایدەکەی بەپیرۆز نەنرخێنرێو لەسەروو رەخنەوە نەبێت.

ئەگەر وابێ. دەبێ حیزبی کوردی ئامادەی قبووڵکردنی گومانو تەنانەت بەدرۆخستنەوەش بێت کە لەدەوری ئەو تەونە پیرۆزە بوروژێنرێن کە جەستەی بتەکانی ناو هزری ئینسانی کوردیان تەنیوەو لەپێش هەمووشیانەوە بتەجوانو بەهەیبەتو پاکو پیرۆزەکانی ناو پەرستگاکانی حیزبی کوردی.. راستتر بڵێم ناو حیزبی پەرستگا.

تا لەوێوە ئەو جورئەتە دەستەبەر بکات فێری خوێندنەوە رامانو تێفکرینی عەقڵانی بێت. خوێندنەوەی جەستەو بەهاو دیاردەو بونیادەکان بەدیدێکی نوێگرانەو دوور لە میکانیزمی تەقلیدیەت. هەر لە خوێندنەوەی جەستەی خۆیەوە تا جەستەی ئەوی دیو بونیادی نەتەوەش.. لە شوناسی خۆیەوە بۆ شوناسی تاکەکانو لەوێوەش شوناسی نەتەوە. دەنا حیزبی کوردی هەر لە شێوەی ئەو مەرقەدە پیرۆزدا دەمێنێتەوە کە لەناو قسنەکەیدا هەموو شتەکان ئەگەر چی پیرۆزیش بن، بەڵام مردوون.. مردوو......

یەکێک لەو تەرمە پیرۆزانەش تەرمی شوناسە.. شوناس......

# عەلمانیەت و ئیسلام

د.حسن حنفي د. محمد عابد الجابري
جورج طرابيشي

و: شوان ئەحمەد

د. حسن حنفي

## ئیسلام پێویستی بە عەلمانیەتێکی خۆرئاوایی نیە.

عەلمانیەت زاراوەیەکی بە عەرەبی کراوە نەک زاراوەیەکی عەرەبی ڕەسەن بێت، عەلمانیەت لە ( Secularism ) وەرگیراوە کە دەچێتەوە سەر زاراوەی ( Saeculum )ی لاتینی و مانای سەردەم دەگەیەنێت. کەواتە عەلمانیەت زاراوەیەکە سەر بەژیواری خۆرئاوایەو پێویستەتاوتوێ بکرێت تا ئەو خەڵکانەی بانگهێشتی عەلمانیەت دەکەن لێی تێ بگەن، وەلەهەمان کاتدا عەلمانیەت ڕووبەڕووی توندترین بەرهەڵستی دەبێتەوە، لەلایەن لایەنگرانی ڕەسەنایتیەوە ئەوانەی سەرلەبەر هەموو شتەهاتووەکانی جیهانی دەرەوە ڕەت دەکەنەوە. عەلمانیەت لە خۆرئاوادا مانای جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت، دەسەلاتی ئاینی لە دەسەلاتی سیاسی دەگەیەنێت. ئەمەش تەنها ڕێگا چارەیەک بوو بۆ بەرەوپێشچوونی گەلانی ئەورووپی پاش ئەوەی کڵێسا دەستی بەسەر دەولەت دا گرت، وەململانێ و کێشمەکێش لەنێوان پاپاکانی ڕۆما و لەنێوان ئیمپراتۆر و پادشاکان لە ولاتە ئەورووپیەکان دا سەری هەڵدا. بۆ یەکەمجار پاپاکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، پاشان لە ساتە وەختی شۆڕشی فەرەنسی یەوە جڵەو کەوتە دەستی پادشاکان. چارەسەری ئەم کێشەیەش جیاکردنەوەی نێوان ئەو دوو دەسەلاتە بوو، کڵێسا بۆ کاروباری ئاینی و، دەولەتیش بۆ کاروباری دنیایی. بەم جۆرەش گەڕانەوە سەر وتەکەی مەسیح (بیدەن بە قەیسەرئەوەی کەهی قەیسەرە، بیدەن بە یەزدانیش ئەوەی کەهی یەزدانە ). کەواتە ئەوەی لە سەردەمی نوێ دا ڕووی دا سەبارەت بە جیاکردنەوەی دەسەلاتی ڕوحی لە دەسەلاتی زەمەنی بۆ خۆی گەڕانەوەبوو بەرەو ناوەڕۆکی سەرەتاکانی بیر و باوەڕی مەسیحیەت. لە شارستانیەتی خۆرئاوادا عەلمانیەت بووە بەشێکی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی و، یاسا و دەستووڕە ئەورووپیەکانی لەسەر دارێژرا، ئیتر نەئاینی ڕەسمی دەولەت دەمێنێ و، نە سەرۆک دەولەت ئاینی دەبێت وەک یەکێک لە مەرجەکانی سەرۆکایەتی، وەنە یاسایەکی کڵێسایی لەگۆڕێ دایە تا پەیوەندی نێوان کەسەکان ڕێکبخات وەک یاساکانی ڕەگەزنامەو تاوان. وەنە خوێندنی ئاینی هەیە لە خوێندنگاکان داو، نە بانگهێشت و ستایشی ئاینیش لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا دەبیسترێ. لەگەڵ ئەوەشدا دوای سەرکەوتنی پادشاکان بەسەر پاپاکان دا، کڵێسە

خرایە خزمەتی جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتەوە. بەم جۆرە کڵێسا دەبێتە دەسوێژێک بۆ قۆناغی کۆلۆنیالی و، کۆلۆنیالیەت بە تەبشیردوە گرێ دەدرێت و، تەبشیر بە کۆلۆنیالیەتەوە دەلکێت. میللەتانی غەیرە ئەورووپی سەرەتا بەوشێوەیە دەستەمۆدەکران کە بیروباوەڕی ئاینی و نیشتمانی و ناوچەیان بە مەسیحیەتی خۆرئاوایی بگۆڕنو لایەنگرتنی خۆرئاوا لە دەرەونیاندا بچێننو لەسەرچاوەی خۆیان هەڵیان کەنن. لێرەوە بڕوادلری بە بیروباوەڕی ئاینی خۆرئاوا بۆ لایەنگیری سیاسیانەی خۆرئاوا دەگۆڕێت. کۆلۆنیالیەت لە ڕووی مادیو سەربازیەوە پشتگیری لە بزوتنەوە تەبشیرییەکان دەکرد. لەبەر ئەوەی تەبشیر ڕێگاخۆشکەرێک بوو بۆی و. هەروەها بەرژەوەندییەکانیشیان پێکەوە دەگونجا. لە دواییدا ئەمە بووە مایەی گۆڕانی چەند کلێسیەکی نیشتمانی لەپێناو ئایینی نیشتمانی و بۆ بەرگریکردن لە سەربەخۆیی نیشتمانی میللەتان، وەک ئەوەی لە کلێسای ڕەش پێستەکان ولاتەیەککگرتووەکانی ئەمریکا( مارتن لوتەر کینگ )وەلە باشووری ئەفریقا (قەشە توتو )دا بەرچاو دەکەوێت.
ئەمە بابەتێکە کارمان بەسەر یەوە نی‌یە، لەو ڕووەوەی کە ئەمە مێژوویەکی ئەورووپی یەتی یە. بەلام کاتێک جیهانبینەکانی ڕۆشنبیری خۆرئاوا بەناومان دا بلاوبوونەوە بەخۆمان ئاشنابووین و. دەستمان بەوە کرد گوزارشت لە هیواو ئامانجەکانمان بکەین، بەو چەمکانە داکۆکیمان لە مافەکانی دەکرد کە بە نێوانمان دا بلاو بوونەوە. چەمکەکانی لەوێنەی -عەلمانیەت و لیبرالیەت-کە یەکێک لەهۆکارەکانی پێشکەوتنی خۆرئاوابوون. وەمادامەکێ یەک پێشکەوتن هەیە و، میللەتانیش هەموو وەکو یەکن و، یاسای مێژووش هەر یەک شتە، ئەوا بێ گومان داکۆکی کردن لەو چەمکانە و دەست بەردار نەبوونیان و بانگەواز کردن بۆیان، بۆ خۆی دەبێتە مایەی پێشکەوتن و بەرەو پێشەوەچوونی کۆمەلگای ئێمەش. ئەمە بەبێ هیچ لەبەرچاوگرتنێکی تایبەتمەندێتی میللەتان و قۆناغە جیاجیاکانی مێژوو و ئەو قۆناغەی کە کۆمەلگاکان پێیدا تێ‌ی تێدەپەڕن و، هەروەها نەبوونی یەک جۆر لە شێوازی پێشکەوتن و بەرەو پێشچوون. وەلە ڕاستیدا ئەمە بۆخۆی سستی و دەستەوستانی ئێمەدەگەیەنێت نەدۆزینەوەی ڕێچکایەکی نوێ بۆ بەرەو پێشەوە چوون لە هەناوی واقیع و لەنێو توانست و بیر و دەسکەوتەکانی ئەو میللەتانەدا و، وەلەنێو سەنگ و قورسایی مێژوویان دا.

عەلمانیەکانی ولاتی ئێمە هەر لە ((شبلی شمیل و، یەعقوب سەروف و، فەرەح ئەنتوان و، نیکۆلا حەداد و، سەلامە موسا و، وەلیەدین یەکن و، لویس عەوەز ))و چەندانی تر بەمانا خۆرئاواییەکەی بانگهێشتی عەلمانیەت دەکەن، جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، ئایین بۆ یەزدان و نیشتمان بۆ هەمووان. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئەوانە هەموویان دیان بوون، زۆربەشیا لە دیانەکانی ولاتی شام بون، کە لایەنگری ژیواری

خۆرئاوا بوون و، نەوەک ئایین و نەوەک شارستانیەتیش ناچنەوە سەر ئیسلام و پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نیە، هەمووشیان لە خوێندنگا بیانیەکان و لەسەر دەستی تەبشیریەکان پەروەردە کراون. بۆیە لە بانگەوازەکانیان دا بۆ پێشکەوتن و بەرەو پێش بردنی ولات، خواستنی نمونەی خۆرئاوایان بەلاوە پەسند بوو. لەم رووەوەش چەند موسڵمانێک شوێنپێیان هەڵگرتن، وەک ((قاسم ئەمین)) لە بانگەوازەکانی بۆ (ئازاد کردنی ئافرەت) و (ئافرەتی نوێ) و ((عەلی عەبدولڕەزاق)) لە (ئیسلام و بنچینەکانی حوکمڕانی) و ((خالد محەمەد خالد)) لەسەرتای دەست پێکردنیدا، بەر لەوەی لە هەشتاکان دا بداتەوە سەر پێکەوە گرێدانەوەی سەرلەنوێی هەردوو دەسەلاتەکە لە (ئایینن و دەوڵەت)دا، وە ((ئیسماعیل مەزهەر)) لە بانگهێشتکردنی دا بۆ -داروینیزم- بەر لەوەی لە شەستەکان دا هەڵگەڕێتەوە بۆ (هەمیشە ئیسلام) و ((زەکی نەجیب مەحمود)) بەر لەوەی لە حەفتاکان گۆڕانی بەسەردا بێت بەتایبەت لە کاتی (نوێکردنەوەی هزری عەرەبی)دا، ئەگەر چی هەتا ئێستاش هەر بیری زانستی خۆرئاوا پێوەری نوێبوونەوە و تازەگەریە لەلای، وە ((فۆاد زەکەریا))و زۆربەی زۆری مارکسیە تەقلیدیەکان کەنیوەی یەکەمی ئەو تیزەی ((مارکس))یا وەرگرتبوو کەدەڵێت (ئایین ئەفیونی گەلانە) و ولزیان لەو نیوەی تری هێنابوو کە (هاواری مەینەتبار و چەوساوانە).

ئەمەش وای لە بزوتنەوە ئیسلامیکان کرد تەواو عەلمانیەت رەتکەنەوەو، بە خۆرئاوا بوونیەوە ببەستنەوە بەوەی پرۆسەیەکی وا دووانەی کۆلۆنیالی و تەبشیر لەخۆ دەگرێت و، دەست گرتن بە ئیسلامیەوە کە نێوانی ئایین و دنیا پێکەوە دەبەستێت. وەدرووشمی (حکومڕانی کردن) بەپێی ئەو ئایەتە بەرزکرایەوە (ومن لم یحکم بما انزل الله فأولئك هم الکافرون) ئەوانەی داواکاریەکانی ئیمان رەتدەکەنەوە. وەدووڕووەکان کە بەقسە ئیمانیان پەسەندەو وەک کردەوە وەلاوەی دەنێن. کەواتە هەڵەی یەکەم، گواستنەوەی عەلمانیەتی خۆرئاوایی، کاردانەوەکە هەڵەی دووەمی دروست کرد، ئەویش حوکمڕانی یە. وەکۆی هەردوو هەڵەکە نابێتە ڕاستی. ئەوەی بەرەو رووی ئێمە دەبێتەوە ئەوەدیە چۆن بتوانین ئامانجەکانی بەرەی عەلمانیەکان جێبەجێ بکەین، لەو ئازادی و پێشکەوتنەی کۆمەڵگاکانمان چاویان لێ بڕیووە، وەلەهەمان کات دا چۆن بتوانین داواکاریەکانی دەستەی دووەمیش دەستەبەربکەین، کە بریتی یە لە پراکتیزە کردنی شەریعەتی ئیسلامی، بۆ رێگەگرتن لە دوو فاقیەتی نێوان دونیاو ئایین، نێوان کارو بروا، نێوان شەریعەت و عەقیدە؟

ئەمە کارێکی ئاسانە، لەبەر ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی شەریعەتێکی وەزعی یە، مەبەستی جێبەجێ کردنی بەرژەوەندی گشتی یە. شەریعەت لەسەرتاوە شتە زەرورەکانی داناوە، دوای ئەو پێداویستی یەکان و، چاکسازی. پێداویستیە زەرورەکان

پێنجەم: پارێزگاری کردنی ئایین و، ژیان و، عەقڵ و، شەرەف و، سەروەت و سامان، ئەمانەش بریتین لە سەرچاوەکان و پێکهێنەرەکانی ژیان. ئایین بریتییە لەو حەقیقەتە بابەتیەی لە حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ بەدوورە، وەژیانی مرۆڤایەتی وەک بەهایەک لە خۆی دا، وەعەقڵ کە بەبێ بوونی ئەو هیچ ڕاسپاردن و لێپرسینەوەک نابێت، وەشەرەف کە بەبێ ئەو مرۆڤ چ ڕێز و حورمەتێکی نابێت و، سامان کە مانەوە و بەردەوامی ژیان مسۆگەر دەکات. ئەمە ئەو پێنج پێداویستی یەیە کە عەلمانیەکان داکۆکی لێ دەکەن بەڵام ئەمان ئەوانە لە ژیولری خۆرئاوا دەخوازن نەک لە شەریعەتی ئیسلامی. ئەوی وەردەگرن ئەوەک لەمن، تەقلیدە و نەک ئەفراندن و داهێنان. ئەوەشی عەلمانیەکان سڵی لێ دەکەن یاساکانی سزادان و، ئەو بەربەست و سنوورانەیەتی کە دایدەنێت. لەبەرامبەر ئەم نارەزاییەی علمانیەکان دا ئیسلامیەکان وک پەرچە کردارێک بەرگری لەو ڕێسایانە دەکەن. لە ڕاستی دا ئەمەش قەیرانێکەو بەرنجامەکەشی کەرتبوونی ڕیزی نیشتمانی یەو، جەنگی نێوان براکانە. ناکامی ئەمەش ئەو باوەڕەیە کە لە هۆشیاری نەتەوەیمان دا چەسپیوە و ڕەگی دا کوتاوە، گوایا گروهێک نەبێت سەرجەم دەستەو تاقمە کانی دی لە ئاگر دان. هەروەها وەڕسبوونی عەلمانیەکان لە شەریعەتی ئیسلامی بەوەی کەمترین بوار بۆ ئازادی خەڵکی نامێڵێتەوە. بەڵام ئەم هەستکردنە بەد حاڵی بوونێکی تێدایە لە شەریعەت واتە وەک ئەوەی شەریعەت بۆ ڕێگەگرتن و تاپۆکردنی شتەکان هاتبێت، نەک بۆ تێرکردنی حەز و ئارەزووەکان و دابینکردنی پێداویستیەکان و ڕێگەدان بەوەی ووزەکانی مرۆڤ هەست بە سروشت بکەن. ئەحکامەکانی شەریعەت پێنجن: (الواجب) ئەو شتەیە کەمرۆڤ بەپێی سروشتی خۆیی‌و لە پێداویستیەکی ناوەکی‌یەوە ئەنجامی دەدات وەک ئەنجامدانی کارەکان لەئان و ساتی خۆیان دا. (المحرم) هەروەها ئەمەش ئەو شتانەیە کە مرۆڤ لە سروشتی خۆیەوەو پابەند بە پێداویستی ناوەکی خۆیەوە دەستیان لێ دەکێشێتەوە وەک دەست بردن بۆ شتە حەرامکراوەکان. (المندوب) ئەوەیە کە مرۆڤ بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی پێی هەڵدەستێت گەر خۆی مەیلی هەبێ و توانای جێبەجێکردنیانی هەبێت. (المکروه) بەهەمان شێوە ئەمەش ئەو شتانە دەگرێتەوە کە مرۆ بە مەبەستی بەرکەماڵ بوون لەڕوی ئەخلاقیەوە خۆیان لێ دەپارێزێت و قەرەیان ناکەوێت. بەڵام (المباح-ڕێپێدراو) ئەو چالاکی یە سروشتی یەیە کە لە دەرەوەی چوارچێوەی بڕیارە ڕووکەشەکانە. کردەیەکی خۆڕسکانەیە و گوزارشت لە خواستی سروشتیانەی مرۆڤ دەکات بۆ چاکەکردن، کاری بێگەرد و مندالانە. بۆیە ئەو پێنج حوکمەی شەریعەت بەم جۆرە و بەم تێگەیشتنە سروشتیانەی بۆ خۆی باس لە چالاکیە سروشتی و خۆڕسکەکانی مرۆڤ ددکات وەک ئەوەی عەلمانیەکان دەیانەوێت لە ددرەوەی سنوورە ڕووکەشەکانی حەلاڵ و حەرام کە

لەدەرەوەوەدا سەپاون. پرانیسپە گشتییەکان هی شەریعەتن، فیقه لەوەوە سەرچاوە دەگریت. پرانیسپە گشتییەکان جێگیر و نەگۆڕنو بۆ مەبەستی پاراستنی مەبەستەکانی شەریعەتە بەلام فیقه ئەوا بەپێی گۆڕانی پێداویستی و بەرژەوەندیەکان گۆڕانی بەسەردا دێت.

وەئەگەر پێشینانمان بەپێی پێداویستی و بارودۆخی خۆیان فیقهی تایبەت بەخۆیان لە شەریعەت هەڵهێنجابێت. ئەوا ئێمەش لەبارمان دایە لەبەرامبەر پێداویستیەکانمانو بەپێی بارودۆخی خۆمانو بەرژەوەندیەکانمان کە ئەوە بۆ ئەوە قۆناغ بە قۆناغ گۆڕانی بەسەر دا دێت، فیقهێک بێنینە ئاراوە. ئیسلام لە ناوەڕۆکی دا نابینێکی عەلمانیە، بۆیە هیچ پێویستی بە عەلمانیەتێکی زیاتر نیە لە ژێواری خۆرئاواوە وەرگیرابێت. بەڵکو ئەوە دزاکەوتنی ئێمەیە لەوی دی کە ئیسلامی کردۆتە کهنوتو دەسەڵاتێکی ئایینی و ڕێ و ڕەسم و چەند سروت وسزادان و کۆسپ و بەربەستێک، هەتا خەڵکی بڕستیان لەبەر بڕاو روویان لە عەلمانیەتی خۆرئاوایی کرد بەوەی عەقلانیەت و لیبرالیەت و ئازادی و دیموکراسیەت و پێشکەوتن دەنوێنێت. کەواتە کەمو کوڕیەکان لە خۆمان دایەو لە کەسی تردا نیە، لەوەدایە لاسایی خەڵکی تر دەکینەوە نەک لەوەی شوێن داهێنان و ئەفراندنی خودی خۆمان بکەوین.

د. محمد عابد الجابري

## ئیسلام کلێسایەک نیە تا لە دەوڵەتی جیابکەینەوە

جارێکی دی دەرفەتی ئەوەم بۆ دەرەخسێت تا بۆچوونی خۆم لەمەڕ یەکێک لەو مەسەلانە دەربڕم کەزیاد لە بابەتەکانی تر جێگای مشتومڕە لە هزری عەربی نوێو هاوچەرخدا. من پێشتر باسێکم لە ژێر سەردێڕی (لەبری عەلمانیەت: دیموکراسیەت و عەقلانیەت) لە گۆڤاری (الیوم السابع. ژمارە-٢٢٤-بەرواری ٢٢-٨-١٩٨٨)دا بلاوکردەوە. لەوێدا ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کەدروشمی (عەلمانیەت) بۆ یەکەمین جار لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا لەلوبنان بەرزکرایەوە، ئەویش لەپێناو دەربڕینی رای خۆیان بۆ ڕزگار بوون و سەربەخۆیی لە خەلافەتی عوسمانی، یان بەلانی کەمەوە بۆ داواکردنی دیموکراسیەت و ڕێزگرتنی مافی کەمە نەتەوایەتیەکان... لە کۆتایی ئەو وتارەدا گەیشتمە ئەم دەرئەنجامەی لای خوارەوە.

وتم: (مەسەلەی عەلمانیەت لە جیهانی عەرەبیدا دزۆنە مەسەلەیەکە- بەو مانایەی عەلمانیەت گوزارشت لە چەند پێداویستی یەک دەکات کە ناوەڕۆکیان لەگەڵ پێداویستی یەکانی دیدا نایەنەوە: بۆیە پێویستمان بە دیموکراسیەتێک کە ڕێزی مافی کەمە

نەتەوەکان بگرێ، وەپێویستی بە مومارەسەکردنی سیاسەت بە شێوازێکی عەقڵانی لە ڕاستی‌دا پێداویستی بابەتیانەن، ئەمانە داواکاری شیاوو پێویستن لە جیهانی عەرەبی‌دا بەڵام مەعقولیەتو پێداویستی‌و بگرە مەشروعیەتی خۆشی لەدەست دەدات کاتێک بە دروشمێکی تەماوی و بە گرێ و گۆڵی وەک دروشمی عەلمانیەت گوزارشی لێوە دەکرێت... بەڕای من پێویستە دروشمی عەلمانیەت لەفەرهەنگی بیری عەربی دەربهێنرێ و دروشمی دیموکراسیەتو عەقڵانیەتی لە جێ‌دا دابنرێت. لەبەر ئەوەی دیموکراسیەت و عەقڵانیەت تەواو گوزارشت لە پێداویستی‌یەکانی کۆمەڵگای عەرەبی دەکەن: دیموکراسیەت بەمانای پاراستنی مافەکان، مافی تاکەکەس و دەستە جەمعیش. عەقڵانیەتیش بەمانای مومارەسەکردنی سیاسەت لەڕێی گەڕانەوە بۆ عەقڵ و پێوەدانگە لۆژیکی و ئەخلاقیەکانەوە، نەک مومارەسەکردنی لە ڕێگای ئارەزوو و دەمارگیری و ڕاڕایی یەوە). پاشان باسیشم لەوە کرد کە: (نە دیموکراسیەت و نە عەقڵانیەت. مانای ڕەتکردنەوەی ئیسلام ناگەیەنێ. نەخێر. خواستنی ئەو بابەتیەکان داوامان لێ دەکات بڵێین گەر بێتو عەرەب بە ڕاستی کەرەستەی ئیسلام-بن. ئەوا ئیسلام بریتی‌یە لە ڕۆحی عەرەب. وەپێداویستی سەیرکردنی ئیسلام وەک پایەگایەکی بنەڕەتی بوونی عەرەبی لێرەدایە: ئیسلامی ڕۆحی بەلای موسڵمانانی عەرەبەوە، وەئیسلامی شارستانی بەلای هەموو عەرەبەوە. موسڵمانو غەیرە موسڵمان).

ئەوە کۆی ئەو شتانە بوو کە من لەوو وتاردی سەرەوەدا باسم لێیەوە کردبوو. بۆیە بە پێویستم زانی لێرەشدا ئاماژەی پێ بدەم، چونکە لەوێ‌دا واتە لە گۆڤاری (الیوم السابع)دا باسەکە ئاڕاستەی ئەو عەرەبە هاوچەرخانە کرابوو کە بانگهێشتیان بۆ (عەلمانیەت)دەکرد، لەوانە بیرمەندە ناسیۆنالیستەکان و لیبرالی و مارکسیەکان. بەڵام لێرەدا و لە زنجیرەی ئەم وتووێژەدا، لەبنەمادا باسەکە ئاڕاستەی بەرهەڵستکارانی (عەلمانیەت) دەکرێت، لە سەلەفیەکان و هاوشێوەکانیان. هەر شوێنەو قسەی خۆی هەیە. بۆیە لەو بۆ چوونەوە دەست پێ دەکەم کە -برام حەسەن- لە بەرایی دوا چاپتەری گوتارەکەتدا ددرت برێبوو، تۆلەوێ‌دا نووسیووتەو دەڵێیت: (لە ناوەڕۆکدا ئیسلام ئاینێکی عەلمانیە، هەر بۆیە پێویستی بە عەلمانیەتێکی زیاتر نیە، عەلمانیەتێک کە لە ژێواری خۆرئاواوە هاتبێ) ناچارم لێرەدا بڵێم: ئەگەر چی من لەگەڵ ئەوەی کە تۆ دەتەوێت بیڵێیت ناکۆک نیم بەڵام پێم وایە شێوازی دەربڕینەکەت لە جێی خۆی دانیە. بە بۆچوونی من ئەو دەستەواژەیەی کە تۆ بەکارت بردووە (ئیسلام ئاینێکی عەلمانی‌یە) هیچ جۆرە جیاوازیەکی لە دەستەواژەکانی تری لە وێنەی (ئیسلام ئاینێکی سەرمایەداری) یە یان (ئیسلام ئاینێکی لیبرالی)یە هتد... نیە. ئەم دەستەواژانەو هاوشێوکانی چارەسەری گرفتە کە ناکەن و بەرەو لێککەیشتنمان نابەن.

بە بڕوای من گرفتی سەرەکی لە (فۆرمی دەوڵـەت) دایە، بۆیە پێویستە بە ڕوونی و سادەیی و بەو زمانەی لە چوارچێوەی ئەو ناچێتە دەرەوە، سەودا سەری لەگەڵ ئەم گرفتەدا بکەین... تایبەت بەم مەسەلەیە لێرەدا چوختەی بۆچوونەکانی خۆم دەخەمە ڕوو:

1: من لام وایە ئیسلام ئایین و دنیایە، وەدامەزراندنی دەوڵەت لە ساتەوەختی پێغەمبەرەوە (د.خ) بووەو لەسەردەمی (ئەبوبەکر و عومەر)یشدا ئەم دەوڵەتە پایەکانی خۆی پتەوتر کردووە. کەواتە ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت ئیسلام ئایینە نەک دەوڵەت، بەبڕوای من بۆچوونێکە فڕی بەسەر مێژووەوە نیە.

2: من تەواو دڵنیام لەوەی ئیسلام، لە یەک کاتدا بریتی‌یە لە ئایین و دەوڵەت، بەڵام ئیسلام نە بە دەقێکی قورئانی وەنەبە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ئەو شێوازەی دیاری نەکردووە کەپێویستە دەوڵەتی لەسەر بێت بەڵکو لەم ڕووەوە مەسەلەکەی بۆ ئیجتیهادی موسڵمانان جێ هێشتووە، چونکە ئەمەش لە ڕەگەزی ئەو مەسەلانەیە کە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر دەیگرێتەوە کاتێک دەڵێت: (أنتم أدرى بشؤون دنياكم) بەڵگەش بۆ ئەمە ڕێکەوتنی سەحابیەکانە لە (سقفية بني ساعدة) دوای مشتومڕێکی زۆر گەشتنەئەوەی ((ئەبوبەکر)) هەڵبژێرن، هەروەها ساغ نەبوونەوەی خەلیفەکانی ڕاشدین لەسەر ئەوەی چ کەسێک هەڵبژێرن تا جێگایان بگرێتەوە، بۆ ئەمە ((ئەبوبەکر)) ڕاوێژی بە سەحابیەکان کردوو، بە ڕەزامەندی ئەوان (عومەری کوڕی خەتاب)ی دانا، لەدوایدا کارەکە بۆ (دەستەی شورا) بەجێ‌هێڵرا ئەوانیش شەش لەو گەورە سەحابیانەبوون کە لەو سەردەمەدا نوێنەرایەتی ئاراستەکانی ڕای گشتیان دەکرد. پاش مشتومڕێکی زۆر گەیشتنە ئەوەی (عوسمان)بۆ خەلیفایەتی دەستنیشان کەن. جیاوازی بیرو ڕای سەحابیەکان و ناکۆک بوونیان زیاتر لە سەردەمی فیتنەو ئەو گرژی و ئاڵۆزیانەدا بوو کە لەسەردەمی (عوسمان)دا ڕوویان دا، وەدوای کوشتنی (عوسمان)یش جیابوونەوەو، شەڕی (جەمەل) و (صفين) لەسەر ئەم مەسەلەیە بوو مەسەلەی ڕێبەر. کە بۆخۆی مەسەلەیەکی بەگرێ و گۆڵە و موسڵمانان لەسەری تەبا نین.

3: دوای جەنگی (صفين)، لەنێوان (عەلی) و (مەعاویە)دا ڕاو بۆچوون لەمەڕ چۆنیەتی ئەوەی پێویستە حوکمڕانی لە ئیسلامدا چۆن بێت سەری هەڵدا: شیعە دەڵێت: پێویستە خەلافەت تایبەت بێت بەنەوەکانی (عەلی)... خەوارجەکانیش، سەرەتا کردیانە مافێکی، هەموو عەرەبێکی ئازاد، ئینجا دوای ئەوەی گروهێک لە مەوالیەکان دایانەپاڵیان ئەو مافەیان بە هەموو موسڵمانێکی دادپەروەر ڕەوابینی. بەڵام (مەعاویە) دەوڵەتی سیاسەتی بونیادناو بۆ ئەمەش گەورە سەحابیەکان دەنگی خۆیان دایە لەوانە

(حەسەن و حسێن و ئیبن عەباس و ئیبن زوبێر) و چەندانی تر، سەرەڕای زۆربەی زۆری موسڵمانانیش.

4: موسڵمانان لەسەر ئەوە کۆک و تەبان کە خەلافەت-سی-ساڵێک درێژەی کێشا و پاشان بۆ (پادشایەتیەکی ستەمکار) یان (شاهنشایەتێکی سیاسی) هەڵگەڕایەوە. وەسەرجەم (ئەهلی سونە) کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم گۆڕانکاریە لە خەلافەتی پێغەمبەرەوە بۆ (پادشایەتیەکی سیاسی) ڕەتکردنەوەی کارێک بوو لە تواناداا نەبوو. وە هەندێک وا لەو ڕووداوەیان دەڕوانی کە کارێکە بەپێی دەربڕینی (ئیبن خەلدون) گەشەو (سروشتی ئاوا کاری ئینسانی) دەیخوازێت. وە کەسێکی وەک (ئەبوبەکر ئیبن عەرەبی) جیاوازی لە نێوان دەولەتی خەلافەت، سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین و. (دەولەتی سیاسە)تی کردووە کە لەساتەوەختی (مەعاویە)وە هاتۆتە ئارا... واتە دەکرێت بڵێین دەولەتی سەردەمی پێغەمبەر و یاوەرانی دەولەتی فتوحات بووە: سەرکردە سەربازیەکان کە لەهەمان کات پێشەوانی ئاینیش بوون لە ترۆپکی هەرمەکەدا بوون و. خەڵکیان بۆ ئیسلام بانگهێشت دەکرد. وەلە ڕیزی خوارەوەی دا سەرجەم خەڵکی بوو کە هەموویان جەنگاوەربوون، واتا سەراپای تیر و خێڵە عەرەبیەکان بۆ فتوحات تەیار کرابوون. بەمجۆرە جیاوازیەک نەبوو لە نێوان شتێکدا کەناوی (کۆمەڵگای سیاسی)بێ. مەبەستم داهو دەزگاکانی دەولەتە بەهەموو جۆرەکانیەوە، وەلە نێوان شتێک کە ناوی (کۆمەڵگای مەدەنی)بێت، زانایان و پارتەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان و زۆربەی خەڵکی. بەلام لە سەردەمی (مەعاویە)دا ئەم دەولەتی فتوحاتە هەڵگەڕایەوە بۆ دەولەتێکی (شاهنشایی سیاسی): دەولەتێک کە لە نێوانیدا میرو پادشاکان لە زانایان و جەنگاوەر لە ڕەشەخەڵکی جوێ بوونەوە. لێرەدا (کۆمەڵگایەکی سیاسی) بەدەر کەوت کە لە بنەمادا لە میر و جەنگاوەران پێکدێت، وە (کۆمەڵگایەکی مەدەنی) لە زانایان و خەڵک و خوا... بەبڕوای من-بەردەوام بوونی بارودۆخ وەک ڕابردوو کارێک بوو شیاونەبوو. لەبەر ئەوەی گەر کار بەو شێوەیەی ڕابردوو بەڕێوەبچوایە. دەبوو سەرجەم (زانایان) کە ژمارەیان ڕوو لە زیادی بوو پەیوەندی بە میر و پادشاکانەوە بکەن تا لەگەڵیاندا یەک سەرکردایەتی پێکبێنن. وەک نمونەی ئەو سەرکردایەتیەی لەسەر دەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی ڕاشدین دا هەبوو، هەروەها ئەوەشی دەخواست کە کۆی موسڵمانان، عەرەب و غەیری عەرەب، لەهەموو جێ و شوێنێکدا پەیوەندی بەو جەنگاوەرانەوە بکەن کە سەرگەرمی فتوحات بوون. ژمارەی زانایان لە بواری خوێندن و حەدیس و تەفسیر و فیقهو زمانەوانی و... هتد، زۆر زیادی کرد بۆیە دەبوو لە پادشاو ئەمیرەکان جوێ ببنەوە. هەروەها ژمارەی موسڵمانانیش، لە خۆرهەلات و لە خۆرئاوا. زۆر زیادی کرد، بۆیە پێویست بوو ژمارەیەکی کەمیان ببنە جەنگاوەرو، ڕێژەی زۆریشیان

وەک خەڵکێکی ئاسایی بمیننەوەو کار بۆ کۆمەڵگاکەیان بکەن وەک پیشەی کشتوکاڵ و پیشەسازی و... هتد. کەواتە جوێ بوونەوەی زانایان لە پاشاکان و خەڵکی لە جەنگاوەران کارێکی حەتمی بوو. ئەمە لەلایەک و، لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەو پەرەسەندن و بەرەو پێش چوونەی ڕوویدا، ((مەعاویە)) لەباری دا نەبوو - گەر بیشی ویستایە - بەشێوەی ((ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان)) ڕێبەری خەڵکی بکات. لەبەر ئەوەی ئەوان فەرمان‌داری کۆمەڵگای - زانایان/ پادشایان و جەنگاوەران/ کۆی خەڵکی بوون، بەڵام (مەعاویە)و، ئەوانەشی لەدوی هاتن ئیتر ئەمە لەسەردەمی ئەمەوی‌دا بوو‌بێ یاخود سەردەمەکانی دوایی، لەسەر کۆمەڵێکەوە بوون کە لە پادشاو جەنگاوەران، وەلە زانایان و خەڵک و خوا پێکهاتبوو. ((مەعاویە)) لە گوتارێکی‌دا بۆ دانیشتوانی (مەدینە) کاتێک بۆ یەکەمجار پاش سەرکەوتنی سەردانی کردن شتێکی لەم جۆرەی باس کرد، کاتێک پێی ووتن هەوڵمدا خۆم ناچار کەم تا بەشوێن پێی ((ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان))دا برۆم. بەڵام زۆر بەتوندی دەست بەرداری ئەوەبوو‌م، پاشان ووتی: (بۆیە ڕێگایەکم گرتەبەر کە بەرژەوەندی بۆ من و بۆ ئێوەش تێدایە). وە ((مەعاویە))، وەک دەزانرێت. سەحابی بووە وەیەکێک بووە لەوانەی-وەحی- بۆ پێغەمبەر (د.خ) نووسیوەتەوە، هەروەها لە سەردەمی ((عومەرو عوسمان))یش‌دا لێپرسراوی وڵاتی شام بووە. ئەوانەشی ((مەعاویە)) لە مەدینەدا قسەی بۆ کردن و گوێ بیستی ووتەکانی بوون لە سەحابی‌و شوێن کەوتووان بوون. هەمووشیان قسەکانیان پێ پەسەند بوو چونکە هیچ شتێکی وایان تێدا بەدی نەدەکرد کە بەپێچەوانەی ئایین بێت. پێی وتن من لەسەر بنەمای سوود و بەرژەوەندی بەڕێوەتان دەبەم، وەناتوانم بە هەمان پێ ودانگی ((ئەبوبەکر و عومەر)) ڕێنوێنیتان بکەم. هەمووان ئەوەیان لێوەرگرت و بەلایەنەوە پەسەند بوو، موسڵمانان سەرجەم خەوراجی لێ‌بەدەرکە-کە کەمینەیەک بوون- ڕایان لەسەر دروستی ولایەتەکەی بوو وەهەموو دەنگی خۆیان پێ‌بەخشی تەنانەت ((حەسەن و حسێن))یش. وەئەو ساڵەش وەک دەزانرێت ناونرا ساڵی جەماعە (عام الجماعه).

ئەم واقعە مێژوویی یەە، بەشێکە لە ئیسلام لەبەر ئەوەی واقعێکە موسڵمانان بۆ خۆیان تەنانەت گەورە سەحابیەکانیش بڕیاریان لەسەر داوە و ڕایان لەسەری بووە. وەمادامەکێ هیچ تێکستێکی شەرعی، لە قورئان یاخود حەدیش لەبەر دەست دانیە. فۆرمی حوکمڕانی و شێواز و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی و دام و دەزگاکانی هتد... دیاری بکات. ئەوا ئەوەی بەدەست موسڵمانانەوە دەمێنێتەوە بریتی یە لە مێژووی خۆیان. ئەو ئەزموونە مێژوویی یەی نەتەوەی عەرەبی و ئیسلامی، ئەویش ئەزمونێکی درێژ خایەن و دەوڵەمەندەو خەلیفەکانی ڕاشدینی تیادا هەڵکەوتووە، وەک چۆن ((مەعاویە و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و هارونەڕەشید و مەئـمون))و چەندانی تری لە خورمەلات و

خۆرئاوادا بە خۆوە بینیووە. وە حوکمڕانی خەلیفەکانی ڕاشدین وەک بەرزترین نمونەی فەرمان ڕەوایەتی لە ئیسلامدا دەمێنێتەوەو، لەو بڕوایەشدام بتوانرێت سەر لەنوێ وەکو خۆی بەدەست بهێنرێتەوەو بەرجەستە بکرێتەوە. لەبەر ئەوەی یەکێک لەو مەرجانەی پێویستە تێیدا بێت دروست بوونی (دەوڵەتی فەتح) ە، کە تێیدا پادشاو زاناکان یەک دەستەبن و جەنگاوەران و خەڵک و خواش یەک دەستە، ئەمەش بۆ خۆی کارێکی چاوەڕوان نەکراوە هەر هیچ نەبێت لە ئایندەیەکی نزیکدا. لە ساتەوەختی ئێستادا. تەنها دامەزراندنی دەوڵەت نەبێت لەسەر بنەمای سوود و بەرژەوەندی، چ شتێکی دی شیاو نییە، بەڵام نەک بەو جۆرەی ((مەعاویە)) کە لە حوکمڕانیەکەیدا پشتی بە خێڵەکەی خۆی و ئەوانە بەستبوو کە هاوپەیمانی بوون و لەگەڵیدا ڕێککەوتبوون. بەڵکو بەو جۆرەی کە سەردەمەکەمان دەیخوازێت، بە ڕێگایەک مەبەستی بەشداری پێکردنی هەموو نەتەوە بێت لە دەست نیشان کردنی کەسی فەرمانڕەواو چاودێری کردنیان بەپێی یاساو پێودانگە یاسایی و دەستوریەکان.

لە ئیسلامدا شێوازی دەوڵەت لەو شتانە نیە کە ئیسلام شوێن و ڕێی بۆ دانابێت. بەڵکو لەو کارانەیە کە بۆ ئیجتیهادی موسڵمانانی جێهێڵاوە، تا بەخۆیان بە پێی سوودو بەرژەوەندی و بەپێی پێودانگی هەر سەردەمێک دەستکاری بکەن و مامەڵەی لەتەکدا بکەن. کەواتە ئەو بۆ چوونەی کە دەڵێت (ئیسلام ئاینێکی عەلمانی)یە بەلای منەوە هیچ جیاوازیەکی لەو وتەیە نیە کەدەڵێت (ئیسلام ئاینێکی عەلمانی)نییە. بۆیە عەلمانیەت بەمانای جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت جێی خۆی نیە لە ئیسلامدا. لەبەر ئەوەی ئیسلام کلێسای تێدا نیە تا لە دەوڵەت جوێ بێتەوە. بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوە بێت زانایان لە میرو پادشاکان و جەنگاوەران لە خەڵک و خوا جیا بکرێتەوە. ئەوەی لەمڕۆدا بە جیا کردنەوەی ئاین لە سیاسەت و ڕێگەگرتن لە سوپا بەوەی قەرەی پارتە سیاسیەکان بکەوێت باسی لێوە دەکەین، ئەوا ئەمە ئەوەیە کە بەفیعلی لە ساتەوەختی ((مەعاویە)) وە ڕووی داوە، وەک چۆن بینیمان. وەهەر ئەمەشە بۆ خۆی کە بەشێکی گەورەو گرنگ لە ئەزموونی مێژووی ئومەتی ئیسلامی پێکدێنێت.

جورج طرابیشی

(١)

## ئەنتلجنسیای عەرەبی و مانگرتن لە بیرکردنەوە

ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەی لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (الیوم السابع) بینیمان لە نێوان (بیرمەندی خۆرئاوای عەرەبی) و (بیرمەندی خۆرهەڵاتی عەرەبی)دا، نمونەیەک بوو لەو

ئەنتلجنسیایەی ڕەتی ئەوە دەکاتەوە بەڕۆڵی خۆی هەڵبستێ، واتە ئەنتلجنسیایەک کە لەحاڵەتی مانگرتندایە لە تێفکرین.

وەزنجیرەی سێیەمی ئەم باسە، لەسەر (عەلمانیەت و ئیسلام) نمونەیەکی زەقی ئەوەیە کە دەشێت پێی بگوترێت حاڵەتی مانگرتن لە بیرکردنەوە. سەرەتا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ووشەی (ڕووبەڕووبوونەوە) بەلای ئێمەوە لێرەدا لەجێی خۆیدا نیە، چونکە ناکرێ دوو بیرمەند لەبەرامبەر یەکدابن، لەکاتێکدا لە بناغەوەو وەلەوەشدا کە پەیوەندی بەهەڵوێست وەرگرتن لە عەلمانیەت هەیە، بەلانی کەمەوە لەسەری تەبان، بگرەکۆکیش لەبەرامبەریدا. یەکێکیان بەو بیانووە دەست بەرداری عەلمانیەت دەبێت کە (ئیسلام کڵێسایەک نیە تالە دەوڵەتی جیابکەینەوە) سەردێڕی باسەکەی ((د. محمد عابد الجابري)) وا دەڵێت، دووەمیشیان دەستی لێ دەشوات بە بیانووی ئەوەی کە (ئیسلام پێویستی بە عەلمانیەتێکی خۆرئاوایی نیە) وەک ئەوەی سەردێڕی باسەکەی ((د.حسن حنفي)) دەیڵێت؟

لە واقعدا ناونیشانی هەردوو باسەکە بەشێوەیەکی تایبەت بڕێکی زۆر لە (بیرنەکردنەوە) لە خۆ دەگرێت. بابە مانشێتی باسەکەی ((د.محمد عابد الجابري)) دەست پێ بکەین. چونکە ئەم سەردێڕە لە بونیادی خۆیدا بەتایبەتی ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ لۆژێکی وێنەیی هەڵدەگرێت. وەدەشێت، بە گەڕانەوە بۆ ڕێسا زێڕینە ئەرستۆییەکە، پێکهاتەی لۆژیکە شاردراوەکەی بەمجۆرەی لای خوارەوە دا بڕێژینەوە:

عەلمانیەت بەمانای جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت دێت. ئیسلام کڵێسای تێدانیە... ئیسلام پێویستی بە عەلمانیەت نیە. وەڕووکەشێتی ئەم لۆژیکە ((جابری)) بەخۆی لە کۆتایی باسەکەیدا بەم وتەیەی کورتی دەکاتەوە: (عەلمانیەت بەمانای جیاکردنەوەی ئاینین لە دەوڵەت مەسەلەیەکی ساختەیە لە ئیسلامدا. لەبەر ئەوەی ئیسلام کڵێسای تێدا نیە تا لە دەوڵەت جوێ ببێتەوە یاخود دەوڵەت لەوی جوێ ببێتەوە).

### چەند پێشەکیەکی نابەجێ

وەک چۆن لەهەموو لۆژیکێکی وێنەییدا، ئاوەهاش پرۆسەی پەی پێ بردن نابەکامی دەسەلمێنرێت و، هەروەها بەتاڵیشی لە (بیرکردنەوە) ئاشکرا دەبێت. گەر توانرا کەڵێنێک بکرێتە پێشەکیە گەورەکەی، یان پێشەکیە گچکەکەی، بۆ خۆسازدان لە کەڵێنکردنە بەرەنجامەکەشی. بەم جۆرە بەڵگەی ((جابری)) لەهەر سێلاکەیەوە بواری کەڵێن تێکردنی هەیە: لە پێشەکیە گەورەکەی و، لە پێشەکیە گچکەکەی و،

لەبەرەنجامەکەشی‌دا وەکو یەک. بەلام لەبارەی پێشەکیە گەورەکەیەوە، با بەراشکاوانە بڵێین کە لەسەر فێڵێکی ڕووکەشانە دامەزراوە: چونکە ڕاست نیە پێناسەی عەلمانیەت بەوە بکەین کەوا (جیاکردنەوەی کڵێسایە لە دەوڵەت) لەبەر ئەوەی کڵێسا بریتی‌یە لە یەکێک لە حاڵەتەکانی ئەو گشتەی کە ئایینە. بۆیە کاتێک پێشەکیەکی گەورە بونیاد دەنێیت، پێویست وایە، وەک ئەوەی زانستی لۆژیک پێمان دەڵێت، لەرێگای گشتێکەو بێت کە لەهەمووان سەرووتر بێت. بەلام بۆچی ((جابری)) ئەوەی هەڵبژارد تا گشتێک کە ئایینە بەتەنها بۆ یەکێک لە بەشەکانی خۆی بگێڕێتەوە، واتا کڵێسا؟ وەلامەکە فرە ئاسایی یە: لەبەر ئەوەی گەر ((جابری)) دادگایی یە عەقلیەکەی لە گشتێکی زۆر بەرز و بالاوە بونیاد بنایەت ئەوا ئەو دەرەنجامەی لە کیس دەچوو کە خۆی دەیویست و دادگاییەکەش بەپێویست ئەم فۆرمەی خوارەوەی وەردەگرت: عەلمانیەت جیاکردنەوەی ئایینە لە دەوڵەت. ئیسلام ئایینە، کەواتە ئیسلام جیابوونەوەی لە دەوڵەت پێ پەسەندە. بەلام بەوەی ((جابری)) پێش وەخت ئەو دەرەنجامە دەزانێت کە دەیەوێت پێی بگات و، وەبەوەی ئەو هەر لە بنەڕەتەوە ئەو پەی بردنە عەقلیەی تەنها بۆ ئەوە بووە کە بیکاتە پاساوێکی پێش وەختانەی ئەو هەوڵەی لەو ڕوودوە، ئەوا هیچ دەرفەتێکی تری لە بەردەمدا نەبوو، تا ئەو بەڵگەهێنانەوەیەی پێ هاوسەنگ بکات، جگەلەوەی هەستێ بە گەمەکردن بە مانای عەلمانیەت و بستێک یاخود دوو بست لەواتا زۆر بەرفراوانەکەی دووری دەخاتەوە تاوای لێبکات تەنها مانای (جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت) بگەیەنێت، نەک (جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت).

بەلام با پێشەکیە گەورەکەو هەرچی ئەو گرژیانەشی لەسەر ئاستی پێناسەو چەمکەکان بە دوایدا دێن بخەینە لایەک و، بێینە سەر ئەو پێشەکیە بچکۆلەیەی، بەسروشتی خۆی، بەوە ناسراوە کە زیاتر پەیوەندی بە واقع و بە مەعریفەی واقعەوە هەیە. گەر ((جابری)) ئەوەی هەڵبژاردبێ کە پێناسەی عەلمانیەت بەوە بکات بریتی‌یەلە (جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت) لەبەر ئەوەیە کە بۆخۆی پێش وەخت دەزانێت، وەلەوەش ئاگادارە کە خوێنەرانیشی دەزانن بەوەی (ئیسلام کڵێسای تێدانیە). وەئێمە گومانمان لەود نیە و، هیچ عاقڵێکیش ناشێت گومان لەوە بکات کە (ئیسلام کڵێسای تێدا نیە)وەچۆن کڵێسا لە ئیسلام دادەبێت. کاتێت ئەو ئیسلامە، بەلام کڵێسا وەک پێناساندن بریتی‌یە لە دەزگایەکی مەسیحیەت؟

بەلام باواز لە پێناسەکان بهێنین و، بێینە سەر جێکەوتەکان، ئەمیش هەنگاوێکە پێش وەخت پاساوی خۆی هەیە لەبەر ئەوەی ئێمە، لەم قۆناغەدا، وتوێژ لەسەر ئەو چۆنایەتیە ددکەینە کە((جابری)) پێشەکیە بچکۆلەکەی پێ بونیاد ناوە کە پەیوەندی -وەک لە

هەموو پیشەکیە بچوکەکاندا- بە جێکەوتەکانەوە هەیە زیاد لەوەی پەیوەندی بە پرانیسپەکانەوە هەبێت.

## لە ئیسلامدا دەسەلاتێکی ئاینی هەیە

بەڵێ، بێ گومان، لە ئیسلامدا کلێسا نیە، بەلام دەسەلاتێکی ئایینی هەیە. کهنوتی تێدا نیە، بەڵام وەک هەموو ئایینێک پیاوانی ئایینی تێدایە. وەپیاوانی ئایینی لە ئیسلامدا کاهن نین، بەلام کار وپیشەیان وەک هەر پیاوێکی ئایینی، بەرێوەبردنی کاروباری ئاینیە. وەزۆربەی زۆریان. خۆیان بۆ ئەم پیشەیە تەرخان کردووە، وەراستە کارو پیشەی ئەمان، وەک ئەوە نیە کە لەکاتۆلیکیەت دایە، تا ببنە ناوەندێک لە نێوان مرۆڤ و یەزداندا، بەلام ناکرێت دەستبەرداری ئەوانە بێت ودک ناوەندێک لە نێوان ئادەمیزاد و کاروباری ئایینیەکەیدا. وەرەنگە ناکۆکیەک لەمەڕ پێناسەکردنی رۆڵی پیاوانی ئایین لە ئیسلامدا رووبداتو، رەنگە ناکۆکیەکەش بەتایبەت لە سەر ئەم ناو لێنانە بێت (پیاوانی ئایین)، بەلام نابێت ناکۆکی لەسەر واقعی مێژوویی بونی ئەوان رووبدات: لەبەرئەوەی ئەوانە هەن و بەبەردەوامیش هەبوون، بۆیە هیچ شتێکی وەها نی‌یە بروامان پێ‌بێنێ کە ئەوانە بونیان نامێنێ: ئاینێک نی‌یە بەبێ پیاوانی ئایین.

کەواتە لە ئیسلامدا نە کلێسا هەیە و، نەکهنوت، بەلام دەسەلاتی ئایینی تێدایە. راستە ئەم دەسەلاتە وەک ئەوەی لە کاتۆلیکیەتیشدا هەیە پارێزراو نی‌یەو، خاوەنی بونیادێکی پلەپلەیی (بەدوایەکدا هاتوو) نی‌یە وەک لە کلێسا دا هەیە(جێ‌ی خۆیەتی بڵێین ئەوەی لەم رووەوە بەسەر ئیسلامی سونی دا دەسەپێت ئیسلامی شیعە ناگرێتەوە لەبەر ئەودی وەک دەزانرێت پیاوانی ئایینی ئەوان هەرەمیەتی تایبەتی خۆیان هەیە). بەلام چاوێریو بەدوادایەکهاتن دوو مەرجی پێکهێنەری دەسەلاتی ئایینی نین. نمونەشمان بۆ ئەمە پرۆتستانیەتە. چونکە دەسەلاتی ئایینی لە پرۆتستانیەتدا لە هەڵە بە دوور نی‌یە (پارێزراو نی‌یە) و. بونیادێکی هەرەمیشی نیە، بەلام ئەمەش رێ لەوە ناگرێت کە دەسەلاتێکی ئایینی بێت، هەروەها رێ لە پراکتیزەکردنی عەلمانیەت ناگرێت لەو دەولەتانەدا کە زۆریان پرۆتستانتین، هەروەها لەو دەولەتانەشدا کەرێژەی زۆریان کاتۆلیکن. بێگومان، عەلمانیەت بە مانای سڕینەوەی دەسەلاتی ئایینی نایەت، بەلکو تەنها مانای جیاکردنەوەی دەسەلاتی ئاینی لە دەسەلاتی سیاسی و رێگرتن لە دەستێوەردانی دەسەلاتی ئایینی لە بواری سیاسی‌دا دەگەیەنێ]، وەک چۆن رێگەش لە دەستێوەردانی دەسەلاتی سیاسی بۆ نێو کاروباری ئایینی دەگرێت. رەنگە لەم رۆکەدا ئەم پێداویستی‌یە بۆ جیاکردنەوەی هەردوو دەسەلاتی زەمەنی و روحی لە کۆمەڵگا

عەرەبیە ئیسلامیەکان‌دا زیاد لە کۆمەڵگاکانی تر خۆی بسەپێنێ. هەموو ئەوە دەزانین دەسەڵاتی ئایینی لە کۆمەڵگا عەرەبی‌یە ئیسلامیەکان‌دا بە ئاستێک گەورەکراوە لەگەڵیدا خەریکە، وەک چۆن وایشە، بۆ دەسەڵاتێکی سیاسی بگۆڕێت وەببێتە دەسەڵاتێکی سیاسی، بەتایبەتی لەو قۆناغە مێژوویەدا کە لەسەر ئاستێکی بەرفراوان کار بۆ بەسیاسی‌کردنی ئیسلام دەکرێت و پیاوانی ئایینیش، لەم نێوەندەدا پۆلی سەرکردە و ڕێنومایکەری سیاسیانە دەبینن. هەروەها هەمووشمان ئەوە دەزانین کە دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵگا عەرەبی یە ئیسلامیەکان‌دا، لە هەوڵی‌دا بۆ ئەوەی ئەو بەرگە شەرعیەتە بەبەری خۆی‌دا بکات کە لەدەستی‌داوە، هەوڵی ئەوە دەدات بە پۆشینی شەرعیەتی ئایینی و ئایدۆلۆژیای ئایینی پەردە بەسەر بێ‌شەرعیەتی و بێ‌جەماوەری خۆی دا بدات و بەوە خۆی داپۆشێت. لە کۆمەڵگایەکی لەم جۆرە، کە تیای‌دا بەردەوام کار بۆ بە ئایینی کردنی سیاسەت و بە سیاسی‌کردنی ئایین دەکرێت، (بیرمەندی خۆرئاوای عەرەبی) دێت بۆ ئەوەی بڵێت مادامەکێ ئیسلام (کلێسای تێدانی‌یە) ئەوا پێویست بە عەلمانیەت ناکات!

بێ گومان بابەتی پەسەند نەکردنیش بە تەنها ووتەزاکە ناگرێتەوە، لەبەر ئەوە نی‌یە کە ئیسلام (کلێسای تێدانی‌یە)، بەڵکو بەتەنها لەبەر گۆڕینی ئەم ووتەزایەیە بۆ پێشەکیەکی بچکۆلە بە بەڵگە هێنانەوەیەکی ڕوکەش‌دا بەمەبەستی ئەوەی بەشێوەیەکی پێش وەختانە و، نرخە لۆژیکیەکەشی هەر چۆنێک بێت ئەوە بسەلمێنێت کە عەلمانیەت پێویست نی‌یە. بۆ ئەوەی بە تەواوەتی درک بە نابەکامێتی ئەو دەرەنجامە بکەین کە ((جابری)) پێ‌ی دەگات، لە هەردوو پێشەکیەکەی‌دا، هێندە بەسە کە بیرمەندێکی لەوێنەی ((طه حسین)) بەیاد بهێنینەوە، کاتێک ئەو لەهەمان پێشەکیەوە (ئیسلام کلێسای تێدانیە) دەرەنجامێکی تری وەدەست هێنا کە تەواو پێچەوانەی ئەوەی ((جابری)) بوو. لە کتێبی (ئایندەی ڕۆناکبیری لە میسر)دا ((طه حسین)) گەشتە ئەو باوەڕەی کە دەڵێت: مادامەکێ لە ئیسلام‌دا کلێسا و کهنوت نیە و، ئەو چینە دابڕاوەی تێدا دروست نەبووە کە بەرژەوەندی لە زاڵ بوونی ئایین دابێت بەسەر کۆمەڵدا. ئەوا جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت بەلای موسڵمانانەوە ئاسانتر دەبێت وەک لە مەسیحیەکان، وەلە میسردا ئاسانترە لە ئەوروپا، ئەو ئەوروپایەی هەموو دەزانن چەند تووشی گرفت هات و ئەونرخەش چەند گران بوو کە دای لەپای ئەو جیاکردنەوە، بەمەش گرەوی لەبواری مەدەنیەت و شارستانیەت‌دا بردەوە. لە واقع دا گەر بێتو بەراوردێک لەنێوان ئەو بۆچوونەی ((جابری)) دا بکەین بەوەی ئیسلام پێویستی بە عەلمانیەت نی‌یە، لەوەوەی کە عەلمانیەت بریتی‌یە لەجیاکردنەوەی کلێسا لە دەوڵەت و ئیسلامیش کلێسای تێدا نی‌یە، وە لەنێوان بۆچوونی سەلەفیەکان دا کە هەمان شتە، ئەوا ئێمە بەبێ

دوو دڵـی ڕاسـتەوخۆیی سـەلەفیەکان و پەنانـەبردنیان بـۆ چـاوڕاوی لۆژیکانـەمان پێپەسـەندترە...لەبەر ئەوەی ئەوان بەڵگـە هێنانەوەکـەیان بـەم شـێوەیە چـێ دەکـەن: عەلمانیەت مانای جیاکردنەوەی ئـایین لـە دەوڵـەت دەگەیـەنێت کەواتـە ئیسـلام قبوڵـی عەلمانیەت ناکات.

وەناشکرایە کـە بەڵگـە هێنانـەوەی سـەلەفیەکان لـە ڕووی لۆژیکیـەوە لـە بەڵگـە داریەکەی ((جابری)) بەهێزترە، لەبەر ئەوەی هی سەلەفیەکان بـەلانی کەمـەوە لەسـەر پێشەکیەکی گەورەی ڕاست و دروست دامەزراوە، لە کاتێکدا خـاڵی لاوازی لـە پێشـەکیە بچووکـە کەیدایـە. بـەمجۆرە کـاتێک ((جابری)). پێویسـتی زیـاتری بـە چـەک وتفـاقی لۆژیکـی دەبێـت بـۆ پاڵپشـتی کردنـی ووتەزاکـەی لەمـەڕ ئـەوەی ئیسـلام پێویسـتی بـە عەلمانیەت نی‌یە، ئەوا پەنا دەباتە بـەر لۆژیکی سـەلەفیەکان. بـەلام جگـە لـە پێشـەکیە بچووکەکە چیتر وەرناگرێت، واتە بەڵگە لاوازەکەیان هەڵدەبژێرێت. بۆیە بـە یـەک ووشـە دەڵێت: (من تەواو دڵنیام کە ئیسلام لە یەک کاتدا بریتەیە لە ئایین و دەوڵەت).

بەلام ئەوەی ((جابری)) لیێ بێدەنگ دەبێت جیێ بیرهێنانەوەیە کە ((جابری)) یەکێکە لەو پسپۆڕە دیارانەی سەر گۆڕەپانی فیکری عەرەبی لە زانستی بێدەنگ بـووندا ئەوەیە کە خاوەنی ئەم ووتەزایە ((حەسـەن بەنا))ی دامەزرێنەری بزوتنەوەی (ئیخوانی مسلمین)ە. چونکە بەر لە ((حەسەن بەنا)) هیچ کەسێک لە گۆڕەپانی فیکری عـەرەبی دا ئەوەی ڕانەگەیاندووە کە ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، قورئان و شمشـێرە، وەگـەر کـەس بـەر لـە ((حەسـەن بـەنا)) ئـەوەی نـەوتبوە لەبـەر ئەوەیـە کـە ووتەزاکـەی بەوڕادەیـە بەڵگەنەویست نی‌یە.کە ((جابری)) وای بۆ دەچێت، واتە بە ڕادەیەک بێدەنگی لـەناوی ئـەو کەسـە بکـەیت کـە ووتویـەتی، چـۆن دەتوانـین دەربـارەی ئیسـلام بڵێـین ئـایین و دەوڵەتە، لەگەڵ ئەوەی خودی وشەی (دەوڵەت) بەو مانایە بەکار نەهێنراوە کە لـەمڕۆدا بەکار دەهێنرێت،تەنها لە ساتەوەختێکی زۆر نزیکـدا نـەبێت، وەبەتایبـەت لـە سـەردەمی ڕینیسانس دا؟ چۆن بڕوا بـەوە بهێنین کـە ئیسـلام ئـایین و دەوڵەتـە. لەگـەڵ ئـەوەیدا ووشـەی (دەوڵەت) بۆ تەنها جارێکیش لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە؟

## بەدوور لە لۆژیکی وێنەیی

ئێمەش نامانەوێت بەهەمان شێوە بکەوینە نـاو لۆژیکێکـی ڕووکەشـەوە، بـەلام نـابێت هیچ کەسێکیش لەوە غافڵ بێت کە سەرجەم ئایەتە قورئانیـەکان ئیسـلامیان تـەنها وەک ئایینێک ناوبردووە، هەر لە ئایەتی (19) وە لە سورەتی (ال عمران): (ان الدین عند اللـه

الاسلام)، تا ئایەتی (3) لە سورەتی (المائدة): (الیوم اکملت لکم دینکم و اتممت علیکم نعمتي ورضیت لکم الاسلام دینا).

بێ گومان ((جابری)) لێرەدا دەتوانێت بەوە وەڵام بداتەوە کە (ئەو بۆچوونەی دەڵێت ئیسلام ئایینە نەک دەوڵەت بەۆچوونێکە بێئاگا لە مێژوو) بەڵام مێژوو بەبێ هیچ پێچ و پەنایەک مێژووە، ئێمەش دەربارەی ئیسلامی ئایین دەدوێین نەک مێژوو، لەبەر ئەوەی ئیسلامی مێژوو وەک هەموو شتێکی مێژوویی- لە دروستکراوی ئادەمیزادە و شایەنی تێپەڕاندنەو، وەک ئیسلامی ئایین هیچ هێزێکی ناچار کردنی نیە. وەڕاستە کە (ئەزموونی مێژوویی ئومەتی عەرەبی ئیسلامی ئەزموونێکی بەرفراوانو بەبرشتە، بەڵام هەڵقوڵاوی ئەزموونێکی مێژووییە، لەکاتێکدا ئایین وەک پێناسە مێژوو فەراموش دەکات و تێی دەپەڕێنێت. وەئەگەر ئەوەمان لەبەرچاو گرت کەئەوەی موسڵمانان لە مێژوودا کردویانە خۆیان بەرپرسن لێی، نەک ئیسلام، ئەوا لەم حاڵەتەدا بەهەمان شێوە عەلمانیەت بەمانای ڕزگارکردنی ئایین دێت لە قوورسایی مێژوو، سەر لەنوێ گێڕانەوەیەتی بۆ چاوگە ڕوحیەکەی خۆی. گەر ئێستا ئایین و مێژوومان بەجێهێشت و هاتینە سەر واقعی هاوچەرخ - ئەمەش چواچێوەیەکی مەرجەعی وەهایە کە لەو کەمتر نیە- دەبینین ((جابری)) تەنانەت دەستبەرداری ئەوەش دەبێت ئاماژە بۆ ئەم واقعە بکات- بەوەی (مەسەلەی عەلمانیەت لە جیهانی عەرەبیدا مەسەلەیەکی ساختەیە، بەمانای ئەوەی گوزارشت لە چەند شتێک دەکات لەگەڵ ئەو پێداویستیانەدا ناگونجێن... بۆیە پێویستە دروشمی عەلمانیەت لە فەرهەنگی فیکری عەرەبی دوور بخرێتەوە و هەردوو دروشمی دیموکراسیەت و عەقڵانیەتی لەجێدابنرێت، لەبەر ئەوەی ئەم دوو چەمکە گوزارشتێکی تەواو لە پێداویستیەکانی کۆمەڵگای عەرەبی دەکەن) لە ڕاستیدا بەدەگمەن ڕێ دەکەوێت لە تێکستێکی ئاوەهادا بڕێکی زۆر لە بەڵگەو نمونە کۆ ببنەوە لەسەر ئەوەی ناومان نا (حاڵەتی مانگرتن لە تێفکرین) وەئەمەیە کە لە بەشی دووەمی ئەم وتارەدا دێینە سەری و تاوتوێی دەکەین.

## جورج طرابيشي

(٢)

## بەڵگەکانی مانگرتن لە بیرکردنەوە لە لای ئەنتاجنسیای عەرەبی

لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا ئاماژەمان بۆ ئەو ژمارە زۆرە کرد لەو بەڵگەو نمونانە لە دەقێکی تێکچڕژاودا ی، بە (حاڵەتی مانگرتن لە بیرکردنەوەمان) ناو برد، وا لێرەدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە یەکلای دەکەینەوە:

1- دەق، لەجیاتی بیرکردنەوە، لەگەڵ ئامرازەکانی فیکرا، کە چەند ووتەزاو تێگەیەکن، مومارەسەی جۆرێک لەگەمەی چاوبەستن دەکات: ئەو ڕایدەگەیێنێ کە هەندێک پێداویستی لە جیهانی عەرەبی دا هەن ڕەنگە پراکتیزەکردنی عەلمانیەت بخوازێت، بەڵام چاکتر وایە لەبری (عەلمانیەت) دروشمی (عەقلانیەت و دیموکراسیەت) بەکار بهێنرێت.

2- وەدەق، لەبری تێفکرین، مومارەسەی جۆرێک لە تاپۆ کردنی بیرکردنەوە دەکات: بۆیە وا پێویستە زۆر بە ڕاشکاوانە (دروشمی عەلمانیەت لە فەرهەنگی هزری عەرەبی) دوور بخرێتەوە. وەئەوی جێی سەرسوڕمانە لێرەدا ئەوەیە کە ئەم بانگەوازە بۆ دوورخستنەوەی ئەو زاراوە بەدە، لە لێکۆڵەرەوەی یەکێک لە دادگاکانی پشکنینەوە دەرنەچووە، بەڵکو لەبیرمەندێکەوەیە کە ئەرکی وەک مزرڤانێک ئەوەیە - تا لە توانای دابێت- فەرهەنگی بیر بەرفراوان بکات. نەک بەر تەسکی بکاتەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەمە لە بیرمەندێکی قوتابخانەی ئەبستمۆلۆژیەوە دەرچووە.

3- دەق، لەبری تێفکرین، مومارەسەی جۆرێک لە خۆبەدرۆ خستنەوە دەکات لە بیر کردنەوەدا. ئەو هیچی تر نادۆزێتەوە تا تەشەری پێ لەمەسەلەی عەلمانیەت بدات لە جیهانی عەرەبیدا تەنها ئەوە نەبێت کە ئەمە (مەسەلەیەکی ساختەیە) لە کاتێکدا خاوەن دەق خۆی، لە کتێبەکەیدا دەربارەی (گوتاری عەرەبی هاوچەرخ) ساڵی 1982 دەرچوو، لەوێدا ڕەخنەیەکی ئاراستەی- کە بەبڕوای ئێمە ئەم ڕەخنەیەی لەجێی خۆی دابوو- ((بورهان غلیون)) کرد، لەبەر ئەوەی ((بورهان غلیون)) لە کتێبەکەیدا (المسألة الطائفية ومشكلة الاقليات) حوکمی ئەوەی دابوو بەسەر (ئیشکالیەتی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت لەبیری عەرەبی هاوچەرخ دا، بەوەی ئیشکالیەتێکی دروست کراوەو لە ڕۆژئاواوە گواسترلوەتەوە). لەبەر ئەوە داوای کردبوو کە بە ئیشکالیەتێکی گونجاو تر بگۆڕدرێت، ئەویش ئیشکالیەتی (پەیوەندی سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگایە بە دەوڵەتەوە) واتا ئیشکالیەتی دیموکراسیەت. ئەوکات ((جابری)) ڕەخنەی خۆی لە ((غلیون)) بە پرسیارێک دووپات کردەوە کە دەڵێت: (ئەی ئایا ناتوانین بسەلمێنین کە ئیشکالیەتی دیموکراسیەتیش بۆخۆی - گەر لە هەمان لۆژیکەوە دەستمان پێکرد و هەمان ڕێچکەمان گرتەبەر- ئیشکالیەتێکی دروست کراوە و لە خۆرئاواوە وەرگیراوە)[1] ؟ پاشان گەیشتە دەرەنجامێک تا بڵێت: (بڕیاردان بەسەر ئیشکالیەتی جیا کردنەوەی ئایین لە دەوڵەت لە ئیشتمانی عەرەبیدا بەوەی مەسەلەیێکی ساختەیە، بەگەڕانەوە بۆ ئەوەی گرفتی ڕاستەقینە گرفتی عەلمانیەت نیە،

---

(1) محمد عابد الجابري: الخطاب العربي المعاصر، دار الطليعة الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٥، ص ٧٦

بەڵکو گرفتی دیموکراسیەتە بەمانای گوزرەکردنە بەنێو هەمان ئیشکالیەتدا بەرەو ڕوویەکی دی لە ڕووەکانی، ئەوەک سڕینەوەی بێت یاخود تێپەڕاندنیو بازدان بێت بەسەریدا... وەلەو ڕێگەنەبستمۆلۆژیەوەی کە لێوەی دەڕوانینیە شتەکان دەڵێین: (گەر نادروستیەک یاخود باش بەکارنەهێنانێک لەم یان لەو زاراوەدا هەبێت لە گوتاری سیاسی عەرەبی نوێو هاوچەرخدا، ئەمە ناگە ڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو ئیشکالیەتەی گوزارشتی لێوە دەکرێت (هەڵبەستراوە لەلای ئێمەوە، لە خۆرئاواوە گوازراوەتەوە). چونکە ئیشکالیەتەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە گەر ئەم ناو یان ئەو ناویشی لێ بنێین... بە بڕوای ئێمە. گەر لێرەدا نارێکی و بەدحاڵی بوونێک هەبێت، ئەوا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لێکپچڕانی پەیوەندی ڕاستەخۆی نێوان فیکر و بابەتەکەی، نێوان وتراوی گوتار و ناوەڕۆکەکەی. لە ئەدەبیاتی ڕابوونخوازی عەرەبی تازەو هاوچەرخدا[٢]. لەم حاڵەتەدا، هێندە بەسە، کاتێک دەبینین ((جابری)) لە ساڵی ١٩٨٨ دا ١٨٠ پلەک لە هەڵوێستی ساڵی ١٩٨٢ی دەگۆڕێت و، بۆ خۆی دەنگی لێ هەڵدەبڕێت تا بەوە تەشەرلە مەسەلەی عەلمانیەت بدات لە نیشتمانی عەرەبیدا کە دروزنە مەسەلەیەکە؟ ئایا هێندە بەسە کە بڵێین ((جابری)) بێپەردەو ڕاشکاوانە خۆی بەدرۆ دەخاتەوە، یان پێویستە ئەوەشی سەربار بخەین کە ئەم ناکۆکیەی لەگەڵ خودی خۆیدا سەبارەت بەوەی ئیشکالیەتی عەلمانیەت ووتەزایەکی ساختەیە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (ئەمانی پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان فیکر و بابەتەکەی، نێوان درکێنەدراوی گوتارو ناوەڕۆکەکەی)؟

٤- دەق لەبری بیرکردنەوە، مومارەسەی جۆرێک لە تەریک کردنو بڕینو پەرت کردنی چەمکەکان دەکات. ئەو دەیەوێت بە هەردوو دروشمی عەقلانیەت و دیموکراسیەت دەستبەداری دروشمی عەلمانیەت بێت. بەم جۆرەش نوێ گەری دەگۆڕێت بۆ بازاڕێکی وورده واڵەو هەر چیەکمان بوێت- بەکەمترین نرخ- دەیکڕین.

لە ڕاستیدا دوورخستنەوەی عەلمانیەت لە لایەن ((جابری)) یەوە بە کارو کردەوەی ئەو کەسە دەچێت کە بیەوێت کورسی نوێگەری لەسەر دوو پێ ڕابگرێت لەبری سیان یان چوار... کارەکەش لای ((د. حسن حنفي)) یش هەمان شتە، (ئیسلام پێویستی بە عەلمانیەتێکی خۆرئاوایی نیە). بەڵام گەر بێتو لێی بپرسین ئەم ناهەقیە بۆ لە بڵاوکردنەوەی لیستەکانی نوێگەریدا، بۆچی ئەوەی هەڵبژاردووە کە بەتەنها لیستی عەلمانیەت بڵاوبکاتەوە، بەبێ لیستی دیموکراسیەت یاخود لیستی عەقلانیەت بۆ نمونە. ڕەنگە وەڵامی ئەوە بێت، وەک ئەوەی بەسەردێڕی باسەکەیەوە دیارە، (لەبەر ئەوەی

---

[٢] المصدر نفسه، ص ٩٢.

عەلمانیەت لەخۆرئاواوە بۆ ئێمە گوێزراوەتەوە). بەڵام لەم حاڵەتەدا ناکرێت ئێمەش ئەو وەڵامەی بدەینەوە کە ((جابری)) وەڵامی ((بورهان غلیون))ی پێ دایەوە: ئاخۆ دیموکراسیەتیش-وەک بە ناوەکەی دیارە- ئەویش هەر لە خۆرئاواوە بە ئێمە نەگەیشتووە؟ وەئەگەر دەرچوون لە خۆرئاواوە بەسبێت بۆ ئەوەی ڕەتی بکەینەوە، کەواتە بۆچی -لەگەڵ عەلمانیەت-دا نەک هەر دیموکراسیەتو عەقلانیەت بە تەنها، بەڵکو چەمکەکانی لە وێنەی ناسیۆنالیستی و سۆسیالیزم و چەپ و ڕاستیش ڕەتنەکەینەوە، ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ((حسن حنفي)) بۆ خۆی خاوەنی پڕۆژەی (چەپی ئیسلامی)یە. گەر وابێت دەبێت ئازادی و ڕۆشنەگەری و مافی ئافرەتان و تەنانەت مافی مرۆڤیش ڕەتکەینەوە؟

وەڕدنگە لەم ڕووەوە سەلەفیە پەتیەکان لە ڕووی لۆژیکیەوە زیاتر کۆکراوەتر و یەکانگیرترین لەخاوەنی پڕۆژەی چەپی ئیسلامی، کاتێک ئەوان بەبێ بولاردن هەرچیەک لە خۆرئاوا وەبێت ڕەتی دەکەنەوە. باشترین نمونەش لەسەر ئەم هەڵوێستەی سەلەفیەکان قسەی ((عطا طايل))ە لەبەر دەم دادوەرە میسریەکانیدا، لە وەڵامیدا بۆ پرسیارێکی ئەوان سەبارەت بە هەڵوێستی گروهەکەی لە مەسەلەی دیموکراسیەت. (ئەم ووشەیە -دیموکراسیەت-فڕی بەسەر ئیسلامەوە نیە. لەبەر ئەوەی دیموکراسیەت بریتی یەلەوەی گەل خۆی حکومڕانی خۆی بکات، بەمجۆرەش ئەنجومەنی گەل دەتوانێت بڕیار لەسەر هەرشتێک دەربکات کە لە گەڵ ڕای زۆرینەدابێت بەبێ گەڕانەوە بۆ قورئان... کەواتە ئەم چەمکی دیموکراسیەتە بەلای موسڵمانانەوە پەسەند نیەو ڕەت دەکرێتەوە، وەتەنها قورئان نەبێت کە کتێبی یەزدانە هیچ پەیڕەو پڕۆگرامێکی دیمان نابێت (إن الحكم إلا لله). ڕەنگە گەر ((حنفي)) بە تەنها مومارەسەی جۆرێک لە بیرکردنەوەی نامەنتیقی بکردایە، ئاسایی بوایە. ئەو هەڵوێستەشمان بەبەڵگەیەکی تر لە بەڵگەکانی مانگرتنی ئەنتلجنسیای عەرەبی لە بیرکردنەوە دابنایەت. بەڵام ئەو ئەمەش تێدەپەڕێنێ بە هەموو مەترسیەکانیەوە- بۆ مومارەسەکردنی ئەوەی کە دەکرێت لە گە ((جۆرج قرم))دا بە (ڕۆشنبیری ئاشووب نانەوەی) ناو بەرین، بەواتای ڕۆشنبیری جۆشدان و هاندانی گیانی تایفەگەری- بۆیە یەک ڕاست دەڵێت: (عەلمانیەکانی لای ئێمە هەر لە - شبلی شومێل و یەعقوب سەروف و فەرەح ئەنتوان و نیکۆلا حەداد و سەلامە موسا و وەلیەدین یکن و- کە بەهەڵە پەستێنراوەتەوە نێو مەسیحیەکانەوە- وەلویس عەوەز و چەندانی تر، بەمانا خۆرئاوایی یەکەی جاڕ بۆ عەلمانیەت دەدەن، جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، ئایین بۆ یەزدان و نیشتمان بۆ هەمووان. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە هەموویان لە مەسیحیەکانن و زۆربەشیان لە مەسیحیەکانی وڵاتی شامن، کە

وەلاتی شارستانیەتیان بۆ خۆرئاوا بووە، چونکە ئەوان چ وەک ئایین یان وەک شارستانیەت ناچنەوە سەر ئیسلام و پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نی‌یە ).

وەلەبەر ئەوەی کارەکە بۆخۆی، مایەی شەرمەزاریە، تا بچینە نێو باس و خواسێکەوە لەمەڕ (ڕۆشنبیری ئاشوب نانەوە )وە، بۆیە بە هێنانەوەی ووشەیەکی (( مکرم عبید ))ی -قبتیە- وە دەوەستین، کە بۆ خۆی ئەمینداری گشتی گەورەترین حیزبی جەماوەری میسری بووە ( حیزبی وەفد )، تا بڵێین گەر بێتو کە مینەی مەسیحی عەرەبی بەرەچەڵەک مەسیحی بێت ئەوا وەک شارستانیەت ئیسلامیە. وەبەوەی من خۆم یەکێکم لە ئەندامەکانی ئەو کەمینەیە، جێی خۆیەتی باسی ئەوە بکەم کە ئەو تونێشەبەرە روناکبیریەی ڕۆڵی گەورەی لە دروستکردن و پێکهاتەی فیکری مندا هەبوو لە قۆناغی هەرزەکاریمدا لە ڕۆمانەکانی (( جرجی زیدان )) سەبارەت بە مێژووی ئیسلام و لەعەبقەریە ئیسلامیەکانی (( عەقاد ))ەوە وەرمگرتووەو بە چنگم کەوتووە. ڕەنگە لەم ڕووەوە (( جابری )) بە ویژدانتر بێت ( سەرەڕای ئەوەی کەمینەی مەسیحیەت لە مەغریبدا هیچ بوونێکی نیە )، کاتێک دەڵێت ڕابوون خوازی عەرەبی ( ئیتر موسڵمان بووبێت یان مەسیحی ) هەستێکی زۆری بەوە هەبوو، کە ئیسلام وەک شارستانیەتو وەک ڕوناکبیریو زمانو نەریتو خوو ورەفتارو جیهانبینی، بەشێکی سەرەکیە لە شوناسەکەی، وەلەبەر ئەوە بۆ تەنها ساتێک دوو دڵ نەبووە لەوەی هەوڵبدات لەپێناو بووژاندنەوەی زمانی عەرەبی، زمانی قورئان و، زیندووکردنەوەی ئەدەبیاتی عەرەبی و، سەرلە نوێ نووسینەوەی مێژووی ئیسلام و، بەدیار خستنی دەسکەوت و ڕۆڵە دیار و بەرچاوەکانی شارستانیەتی ئیسلامی[٣].

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناچار دەبین دەستو برد بکەوینە کێشمە کێشەوە لەگەڵ (( جابری ))داو لەگەڵی‌دا ناکۆک بین کاتێک ئەویش بەهەمان شێوە لە سۆسیۆلۆژیاو ئامانجداریەکی ( مەسیحیانە ) دەگەڕێت بۆ دروشمی عەلمانیەت، وەپێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە دروشمی عەلمانیەت (بۆ یەکەمجار لە لوبنان. ڕەنگە لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا. بەرزکراوەتەوە. ئەویش بە مەبەستی داواکاری بۆ جیابوونەوە لە خەلافەتی عوسمانی و وەرگرتنی سەربەخۆیی، یان بە لانی کەمەوە بۆ داواکردنی دیموکراسیەت و ڕێزگرتن لە مافی کەمینەکان )، وەکاتێک (لیبرالی عەرەبی لە ناوەڕاستی سەدەی پێشوودا داوای جیاکردنەوەی دەسەلاتی ڕۆحی لە دەسەلاتی مەدەنی دەکرد لە ڕاستی‌دا مەبەستی ئەوە نەبوو ئایین لە دەوڵەت جیا بکاتەوە... بەڵکو یەکێک لە مەبەستەکانی ئەوەبوو قەوارەی عەرەبی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، جیابکاتەوە، یاخود ڕزگاری بکات و سەربەخۆیی خۆی بەدەست بێنێت )، وەئێمە گەر بێتو

[٣] الخطاب العربي المعاصر-ص ٧٩.

بگەڕێینەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو. وەلەوێدا لە شوناسی لیبرالی عەرەبی بگەڕێین لە ڕووی ئایینی و کۆمەلایەتیەوە، ئەوا دەبینین کە زۆربەی ئەو پیاوە منەوەرانە سەر بە کەمایەتیە ئایینیەکانن، بە شێوەیەکی تایبەتیش مەسیحیە عەرەبەکانن)، وەئەوەی (لیبرالی عەرەبی دەیوویست لە بەرزکردنەوەی دروشمی عەلمانیەت لەو کاتەدا جیاکردنەوەی ئایین نەبوو لە دەولەت بەو شێوەیەی کە لە ئەوروپادا ڕوویدا)، بەلکو (مەبەست لێی بانگهێشت بوو بۆ دەولەتێکی نەتەوەیی عەرەبی، لە دژی جامعەی ئیسلامی، یان داواکردن بە دامەزراندنی دەولەتی ناوچەیی، دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی[1]).

وەبە بێ ئەوەی بچینە نێو مشتومڕێکی دوور و درێژەوە لە بەرامبەر ئەم بۆچوونەی ((جابری))دا، ئەم چەند تێبینیەی لای خوارەوە دەخەینە ڕوو:

١- گەر ڕاست بێت دروشمی عەلمانیەت لەلایەن زۆرینەی مەسیحیەکانەوە بەرزکرابێتەوە. ئەوە لەبەر ئەوە نیە کە بە تەنها مەسیحیە، بەلکو لەبەر ئەوەیە کە زۆربەی ڕابوەین خوازەکانی عەرەب لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا مەسیحی بوون. ئەوەی بۆ دروشمی عەلمانیەت ڕاستە سەرجەم دروشمەکانی تری سەردەمی ڕینیسانس دەگرێتەوە: هەموو ئەو دروشمانە لەلایەن زۆربەی زۆری مەسیحیەکانەوە بەرز کرایەوە. بەلام ئەم حەقیقیەتە سۆسیۆلۆژیە ناکاتە ئەوەی دروشمی عەلمانیەت ببێتە دروشمێکی مەسیحی، چونکە ئەگینا لەوە ناگەین کە هەندێک لە دیارترین ڕابوونخوازە موسلمانەکانیش بەهەمان شێوە ئەو دروشمەیان بەرز کردۆتەود هەر لە ((کەواکبی و قاسم ئەمین و ئەحمەد لطفي سەید و عەلی عەبدولڕەزاق و طە حسێنو ئیسماعیل مەزهەرەوە تا زەکی نەجیب مەحمود و خالد محەمەد خالد و فؤاد زەکەریا و محەمەد ئەرگون).

٢-گەر ڕاست بێت هەندێک لەو ڕابوونخوازە مەسیحیە عەرەبانەی بانگەشەی عەلمانیەتیان دەکرد لەوانە بووبێتن کە داوای جیابوونەوەیان لە دەولەتی عوسمانی کردبێ، ئەوا لەبەرامبەردا هەندێکی تر لەوانە لایەنگری خەلافەتی عوسمانی بوون و لەوانەبوون بانگەوازی چاکسازیان لەنێو چوارچێوەی جامعەی عوسمانیو ئیسلامیدا دەکرد. نمونەی ئەمانەش ((بطرس بوستانيو سەلیم بوستانی))بوون، کتێبەکەی ((سەلیم بوستانی)) (عبرة وذكرى) لەم ڕووەوە پرۆگرامی کارێک بوو بۆ چاکردنی بارو دۆخی دەولەتی عوسمانی و هێشتنەوەی بەیەکگرتووی لەڕێی چاکردن و دەست پێداهێنانەوەیەوە. وەهەروەها پێویستە لەم ڕووەوە، باسی ((ئەدیب ئیسحاق))یش بکەین. کە بڕوای بەبوونی سێ جامیعە هەبوو لە یەکتکات دا:جامیعەی عەرەبی و. جامیعەی عوسمانی و. جامیعەی خۆرهەلات. وەک چۆن لەنێو ڕابوونخوازە مەسیحیە عەرەبەکاندا کەسانێک هەبوون کە دژ بە جامیعەی ئیسلامی بوون لەنێو ڕابوونخوازە عەرەبە موسلمانە کانیشدا نمونەی لەم جۆرە هەبوون. لەوانە ((ئەحمەد لوتفی سەید)) کە پێی وابوو (نەتەوەی ئیسلامی نەتەوەیەکی ڕاستەقینە نیە و ئەو بۆ چوونەشی دەلێت خاکی ئیسلام نیشتمانی هەموو موسلمانێکە بۆ خۆی بیرۆکەیەکی کۆلۆنیالیانەیەو تەنها ئەو نەتەوە

[1] المصدر نفسه-ص ٩٣ و ٧٣.

کۆلۆنیالیانە سوودی لێ دەبینن کە سوورن لەسەر بەرفراوانکردنی پانتایی زەوی و زارەکانیان و برەو دان بە دەسەڵاتی خۆیان). ئەو تەنانەت بیرۆکەی یەکیەتی ئیسلامیشی وەک هێزێکی سیاسی سەیر نەدەکرد، بەڵکو وەک تارماییەک لێی دەڕوانی، تارماییەک کە بەریتانیەکان بەمەبەستی وروژاندنی هەستی ئەورووپی خولقاندویانە دژ بە بزووتنەوەی نەتەوەیی لە میسردا).

٣-ڕەنگە گەورەترین هەڵەیەک- ((جابری)) کردبێتی ئەو گرێدانە میکانیکیەیەتی لەنێوان ئاستی گوزەرانیان دا وەک کەمایەتیەکی ئاینی کەپێویستی بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی پەیوەندیەکانی خۆیەتی لەگەڵ زۆرینەی موسڵماناندا. ڕاستە ئەم خواستە لە بۆتەی بیرکردنەوەی ئەوان بەدوور نەبووە، بەڵام بەرەو پیرچوونیان بۆ عەلمانیەت هەر بۆ ئەوە نەبووە کە بۆ ئەوەی شوێنو ڕێی خۆیان وەک کەمایەتیەکی مەسیحی لەبەرامبەر زۆرینەی موسڵماناندا ڕێکبخەنەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەندی بەباروودۆخی تائیفی خۆیانەوە هەبووە. لەو پێداویستییەوە بووە کە لەو کاتەدا هاتە ئارا بۆسەرلە نوێ ڕێکخستنەوەی پەیوەندی خۆیان وەک دەستەبژێرێکی ڕابوونخواز بە تایفەکانیانەوە بە شێوەیەکی تایبەت. بە واتایەکی دی عەلمانیەتی ئەوان پەیوەندی بە باروودۆخی خۆیانەوە هەبوو لە نێو تایفەکانی خۆیاندا بەرلەوەی ڕەنگدانەوەی باروودۆخێکی دەرەکی بێت. دەکرێت لەگەڵ ((ئەلبرت حورانی))دا بڵێین عەلمانیەتی ئەوان بریتی بووە لە هەوڵدانێک (بۆ قوتار بوون لە قەفەزی تایفە ئاینییە کلۆمدراوەکانیان)[*]و. دەربازبوون لە هەیمەنەت و باڵادەستی - ئەکلیرۆس - بەسەر خواست و چارەنووسی ئەم تایفانەوە. هەر ئەمەشە وادەکات (لە وسینەکانیان دا ئاقارێکی دژ بە ئەکلیرۆس- واتا پیاوانی ئاینی مەسیحی بەدی دەکەین- کە شتی وای لەلای موسڵمانە هاوسەردەمەکانی خۆیان بەدی ناکەین)[1]. تەنانەت هیچ یەک لەو ڕابوونخوازانە لە جێهێشتنی تایفەکەی خۆی نەدەوەستایەوە تاوەکو ببێتە پرۆتستانتی بەحوکمی ئەوەی لەوێدا کەشێکی ئازادانەی هام ئاوەندی بۆ دەرەخسا. بۆ نموونە ((بطرس بوستاني)) یەکێک بوو لە وانە. بگرە ((فارس شدیاق)) یش کەوەک ئەو مارۆنیەکی کۆن و ناودار بوو هەمان هەڵوێست وەردەگرێت، واتە پاش بە پرۆتستانتی بوونی دەبێتە ئیسلام و ناوی خۆی دەکات بە ((ئەحمەد)) ئەویش لەترسی تایفە سەرەکیەکەی خۆی کە پەتریرکەکەی بڕیاری بەگرتنی ((ئەسعەد))ی برای دابوو لەگەڵ لە سێدارەدانی لەبەر ئەوەی ئەویش بەهەمان شێوە بووبووە پرۆتستانتی.

٤- گەر عەلمانیەت (بەنزیکی لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا) لە خۆرئاواوە گوازرابێتەوە، ئەوا تەنها لەڕێی بە خۆرئاوایی کردن و لاسایی کردنەوەیەکی توتیانەوە نەبووە، بەڵکو خودی ئەم گواستنەوەیە بۆ خۆی خواستێکی ناوچەیی لە خۆیدا هەڵگرتبوو، مەسەلەی ڕووداوە تایفیەکان لە (جبل لبنان ساڵی ١٨٤٠و کتشرو برە تایەفیەکان لە بەیروت و دیمەشق ساڵی ١٨٦٠. وەلەبری بەستنەوەی عەلمانیەت بەخۆرئاوایی کردنەوە (وەک ئەوەی حەسەن

---

[*] ألبرت حوراني: الفكر العربي في عصر النهضة، دار (النهار) الطبعة الرابعة، بيروت، ص ٢١٨.

[1] المصدر نفسه، ص ١٣٤.

حەنەفی بەشێوەیەکی تایبەتی پێی هەڵدەستێ)، دەبا بڵێین ڕەنگە پێچەوانەی ئەوە ڕاست بێ. چونکە لە میسر و سوریا و، بەدوای داگیرکاری هەریەک لە ئینگلیز و فەرەنسا، دەستپێشخەری بەرزکردنەوەی دروشمی عەلمانیەت لەلایەن ئیشتمان پەروەر ناسۆسیالیستەکانەوە بوو. موسڵمان و مەسیحی وەک یەک) ئەویش وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ هەوڵی کۆلۆنیالە خۆرئاواییەکان کەدەیان ویست تۆووی دووبەرەکی بچێنن و مەسەلە مەزهەبیەکان بکەنە (مەسەلەیەکی تایفی) تاببێتە هاوشانێک بۆ (مەسەلەی کۆلۆنیالیەت) و پاساو بۆ ئەو هەوڵانە بێنێتەوە و پاڵپشتیشی لێ بکات.

وەک دەرئەنجامێک لە کۆتاییدا دەڵێین: ((جابری)) لە (پێگە ئەبستمۆلۆژیە)کەی خۆیەوە، تێبینی ئەوەی کرد کە گوتاری عەرەبی هاوچەرخ نوقمی نێو ئایدۆلۆژیایەو. زەمەنێکی وەستاو وشێوە مردووی هەیە. لەبەر ئەوەی وا بۆ سەدەو نیوێک دەچێت هەمان پرسیار دەکات و لەبەرامبەریشدا هەمان وەڵام دەداتەوە، بەم جۆرە ئێمە بۆ خۆمان سەرنجی ئەوە دەدەین کە کاتێک ((جابری)) خۆیشی دەبێتە یەکێک لەوانەی مومارەسەی (گوتاری عەرەبی هاوچەرخ) دەکات. ئەوا نەک بەتەنها مومارەسەی ئەو کارەی دەکات وەک ئەوەی لە پێگە ئەبستمۆلۆژیەکەیەوە بگەڕێتەوە سەر پێگەیەکی ئایدۆلۆژی، بۆچوونەکانی سەبارەت بە ئیشکالیەتی عەلمانیەت ئەوە بەدەر دەخەن. بگرە هەروەها لە زەمەنە وەستاوە دووبارە بووەکەیەوە دەکشێتەوە بۆ زەمەنە پاشەکشێ کەرەکەی ڕووەو دواوە: گەر ((جابری)) سەبارەت بە عەلمانیەت. هەمان ئەو پرسیارانە گەڵاڵەدەکات کە ڕابوونخوازە عەرەبەکان گەڵاڵەیان کردبوو، ئەوا ئەو وەڵامانەی کەهی ئەو پرسیارانەی پێ دەداتەوە کەمتر پێشکەوتووترن یاخود تەنانەت زۆر دواکەوتووترن لەوانەی ئەو ڕابوونخوازانە وەڵامیان پێ دابووەوە.

(کۆتایی)

سەرچاوە:

بڕوانە:- العلمانية و الاسلام

- د. حسن حنفي: الاسلام لايحتاج الى علمانية غربية، ص ٤٢-٤٥.
- د. محمد عابد الجابري: الاسلام ليس كنيسة كي نفصله عن الدولة، ص ٤٥-٤٩.
- جورج طرابيشي: (١) الانتلجنسيا العربية والاضراب عن التفكير. ص ١٣٦- ١٤٠.
- جورج طرابيشي: (٢) دلائل الاضراب عن التفكير لدى الانتلجنسيا العربية. ص ١٤١-١٤٦.
- حوار المشرق والمغرب- تليه سلسلة الردود والمناقشات- تقديم: جلول فيصل، دار توبقال للنشر- دار البيضاء- الطبعة الاولى، ١٩٩٠.

# توێژینەوەیەکی گەمارۆدراو

## لە باردی (ئیسلامیزمی موحەممەدی)یەوە[*]

(بەشی یەکەم)

نووسینی: سەربەست نەبی
وەرگێڕانی: ئازاد محمد عبد الله

• لە ئۆرشەلیمەوە بۆ کەعبە:

مارکس دەپرسێ: (بۆچی هەمیشە مێـژووی رۆژهـەلات، وەک مێژوویـەکی دینیـی خـۆ دەنوێنێ؟)[1] و بەوتنێکی دی، بۆچی مێژووی گۆڕانکارییە واقیعیەکان هەمیشە فۆرمێکـی دینی وەرگرتووە؟ دەشکرێ لەم لایەنەوەو، بەشێوەیەکی تایبەتی ئـەو پرسیارە ئیزافـە بکەین؛ بۆچی لە نێو ئەو هەزاران بانگەشەکار و پێغەمبـەر و کاهین و مژدەدەرانـەی کـە لەو سەردەم و زەمانەدا، ئـەو بیابـانی عەرەبی‌یـەیان تـژی کردبـوو لـە بانگەشـە دینـی و لاهوتییەکانیان، بۆچی لەنێو هەموو ئەوانەدا، بەتـەنیا ئیسلامیزمی موحەممـەد- رەنگـە راستتریش وابێ بڵێین دامەزرێنەرانی ئیسلام- سەرکەوتنیان لە هەوڵـەکانیاندا بەدەست هێنـا؟ بۆچـی (ئیســلامیزمی موحەممــەدی) بـە دیـاریکردن ســەرکەوتن و بردنــەوەی (لەمەیدانی ئەو شەڕە داروینییەدا بردەوە، کە بەڕاستی شەڕێک بو لـە پێنـاوی مانـەوەی فکـر و بیرو بـاوەڕدا؟)[2] کـە ئەمــەی دوایی‌یــان تــەعبیری (ئــەنگلز)ەو ئێمـە لـێرەدا خواستوومانە. هـەتاکو ئێسـتاش، ئـەو پرسـیارانەی پێشـوو، بایـەخ و گرنگیــی خویــان لەدەست نەداوە، چ لەسەر ئاستی توێژینەوە لە رووداوە دینییـەکانی مێـژووی رۆژهـەلات بە شێوەیەکی گشتی و سەرتاپاگیری و، چ لەسەر ئاستی بابەتی توێژینەوە زانستی‌یەکان بە شێوەیەکی تایبەتی.

هەر بـەم ئاڕاسـتەیەدا، د.طیب تیزینی لـە توێژینەوەکـەیدا لـەبارەی گیروگرفتـەکانی مێـژووی دینـی هــەردوو؛ یەهودییـەت و مەسیحیەتەوە، لـەکۆتای بەشـی سـێ‌یەمی ئــەو توێژینەوەیەدا، گێشتۆتە ئەو ئەنجامەی کـە رەگ و ریشـەی لـە مێژینـەی نـەش و نمـا و پەرەسەندن و پێگەیشتنی هەردووکیان واتا یەهودییەت و مەسیحیەت روون بکاتەوە، لـە توێژینەوەکەشدا پێ لەسەر دیالەکتێکی واتە جەدەلی گشتی و تایبــەتی و فـەردی، شـتە لەبـەر چـاو و بەرجەسـتەکان، پێشـینەو دواتـری هـەردوو دیاردەکە، دادەگرێ. لـەبواری پشـکنین و گـەڕانیش بـە دوی پرۆسێسـی رووداوەکـەدا لـەڕووی ئاقـاری مێژوویــی و کۆمەلایەتی و کلتوورییەوە. دەست دەکاتە ئیش کردن و توێژینەوە لەو دیاردە دینی‌یەی

کە دواتر هاتە ئاراوە (واتا: ئیسلامیزمی موحەممەدی) کە لەکاتی ئێستادا و- بەپێی قسەی خۆی؛ (تیزینی) دنیای گرتۆتەوەو بۆتە مایەی سەرقاڵبوونی خەڵک پێوەی.[2]

لە دوا حیساب بۆکردنیشا، توێژینەوەی ئەم مەسەلەیە دەبێتە پێداویستی‌یەکی هەنووکەیی و، دەبێتە هەوڵدانێک بۆبەرهەمهێنانی مەعریفەیەک دەرهەق بە ئێستا لە بەشێکی گرنگ و بەبایەخی گرفت و کێشەکانیدا بە هەردوو لۆژیکی جیاوازیی و لەیەک چوونەوە.

توێژینەوەکەی (طیب تیزینی)، توێژینەوەیەکە دەربارەی یەکێک لە سەختترین قۆناغی پڕگرفتی مێژوویی‌یە، لەسایەی بارودۆخێکدا کە لەڕووی گرفت و ئاڵۆزیی و سەختییەوە بەهەموو دەرئەنجام و ئیفرازاتی سیاسی و زیهنییەوە، هیچی کەمتر نیە لەوانی پێشوو. بەتایبەتیش کەسی توێژەرەوە واتا (د.طیب تیزینی)و هەروەها- بابەتی توێژینەوەکەش- دەستی بۆبابەتێک بردووە و لەپانتایی مەوزوعێکی وادا کاردەکات کە حەرامترین و ئاڵۆزترین مەوزوعی نێو کایە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئێستایە. هەروەک خۆیشی دەڵێ: (باسکردنی کێشەکە بە گەمارۆدراوی)، واتا توێژینەوەکە بەسەرجەمی ئەو کلتوورە سیاسی و کۆمەڵایەتییە گەمارۆ دراوە کە خۆی لە هەندەسەی شتە حەرامکراوەکان و کێڵگەکانی کوفر کردن و لوغمەکانی ریسوا کردندا دەنوێنێ و هەموو ئەو هەندەسەو کێڵگەو لوغمانەش لەلایەن عەقڵێکەوە ئامادە دەکرێن و دەچێنرێن کە (لەناو خۆیدا، خۆی قفڵ داوە) بەبیانووی طەهرانیەت و پیرۆزییەوەو، بەم دوایی‌یەش دەستی کردۆتە فراوان بوون و پەلوپۆهاویشتن. لەنێو ئەم جێکەوتەیەدا. دەکرێ دوو گرێی سەرەکی لەیەکتر جیابکرێنەوە کە هەریەکەیان بانگەشەی ئینتیماکردن بۆ ئیسلامیزم دەکات.. یەکەمیان لە پادگایەکی (موقع)ێکی تیۆریی شارستانییەتەوە ئەو بانگەشەیە دەکات و، ئەوەی تریان لە پادگایەکی (نامێژوویی و ناکەلتوورییەوە) کە دوورە لە جیهانبینی‌یەکی رەخنەیی زانستی‌یەوە، بەڵکو لەبۆچوونێکی میتافیزیکیی سکونیی واوە کە پشت بە خیتابێکی گەردوونیی گشتگیر و رەها دەبەستێ و پێی وایە کە (باو باپیران-باوک- هیچی نەهێشتۆتەوە یان هیچ پانتایی‌یەکی نەهێشتۆتەوە بۆنەوەکانی دواتر قسەی تێدا بکەن)- الأسلاف لم يتركوا شيئاً للأخلاف- بەواتا(هەمو مەعریفە و زانیاری ئەم سەردەم و چەرخەمان لە پانتایی‌یەکانی رابردوودا هەن و وەکی تریش لەوەوە خوازراون و بەزمانی ئێستا تەعبیریان لێدەکرێ]... هەر بۆیەشە شتێک نەماوەتەوە کە کلتووری رابردوو دەستی بۆ نەبردبێ)[4] هەروەها کتێبە ئاسمانییەکانیش. هەرچی ئەوەی دوایی‌یانە، واتا کتێبی ئاسمانی. حەسارێکی پۆڵاینی بە کۆمەڵێک حەرام و پێشینەی ئەخلاقی و چەندین

حەقیقەتی عەقیدە ئامێزی وای بۆ دروست کراوە کە ببێتە مایەی خولقاندنی لەمپەر و ڕێگر لەبەردەم هەڵوێستەکانی دژ بە خۆیدا. سەرەنجامیش ئەو شووراو حەسارە دەبنە هۆی زیندانی کردنی عەقڵ و ولزیپێهێنانی - تەنانەت لەسەر ئاستی بیرکردنەوەی ئیسلامیزمیش- (هەروەها دەبێتە هۆی سەپاندنی جۆرێک لە حاڵەتی چەوساندنەوە و زەوتکردنی فیکریی بەسەر هەمووانداـ هەروەها ئەو حەسارە- بەهەمان شێوە و بگرە بەشێوەیەکی باڵا دەست- باڵ دەکێشێ بەسەر ئەو زانا و نووسەرە ئیسلامیانەشی کە خاوەنی بۆچوونی عەقلی و رەخنەیین)[٥]، هەر لێرەشەوە دەرگا بەڕووی توێژینەوەدا کلۆم دەدرێ لەیەکەم چرکەساتی وروژاندنی پرسیارەکانیەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت.

جیاوازی لەوەی باسمان کرد، توێژەرێکی وەک (د.طیب تیزینی) لە توێژینەوەکەیدا پەنا دەباتە بەر دەقەکانی ئیسلامیزم خۆی و، بەتایبەتیش دەقەکانی قورئان، ئەویش بەمەبەستی ڕەتوهێنانیان لە ناوەوە و هێنانە سەرباری ئەو دەقانە بۆ ئەوەی هەر بە زمانی خۆیان ئیقرار و ئیعتیراف بە مەشروعیەتی پرۆژەیەکی وەها بکەن و جاڕیشی بۆ بدەن [مەبەست لە پرۆژەی رەخنە گرتنە لە عەقلی ئیسلامیزم- وەرگێڕ-]. لەو دید و بۆچوونەوەی کەوەها هەڵوێستێک یەکێکە لە خوێندنەوە چاوەڕوانکراوەکانی سەر بە ئیسلامیزم و شێوازێکە لە شێوازە جۆراوجۆرە چاوەڕوانکراوەکانی پرۆسەی بیرکردنەوەی دینی- ئیسلامی ئێستا)[٦]. ئەم جۆرە پرۆسەیەش- بە بۆچوونی ئەو- دەبێتە سەرپێچی کردنێکی ڕاشکاوانەی فکرەی ناوەندیی- مەرکەزیی- قورئان کە لە بنەرەتدا بایەخ بە ڕێزگرتنی (بۆچوونی بەرامبەر-الرأي الآخر) دەدات. (لا إكراه في الدين) و (قل الحق من ربكم، فمن شاء فليؤمن و من شاء فليكفر) و هەروەها (لو شاء ربّك لآمن مَن في الأرض جميعاً. أفأنت تكره الناس جميعاً حتى يكونوا مؤمنين)... هتد.

ئەو جۆرە لۆژیکەی لەسەر ڕەتکردنەوەی ئیعتیراف کردن بەوەی دی (الأعتراف بالآخر) لەڕووی جیاوازیی بیروڕاو بۆچوونەوە بنیات دەنرێ و لەنێو سڕینەوەو بەتەکفیر لە قەڵەمدانی ئەوی دی دا ئیش دەکات و لە پادگای سەپاندن و چەسپاندنی (کامڵ بوونی رەها)ی (من-الانا)وە سەرچاوە دەگرێ، وەها لۆژیکێ بە دەروازەیەکی بنەڕەتیی دادەنرێ بۆ هەڵایسانی قەیرانی فکری (سەلەفیزمی رەها)، ئەم جۆرە قەیرانەش بەشێکە لە قەیرانی قووڵ و رەگاژۆی فکری عەرەبی کە بۆ خۆی بەرئەنجامی بارودۆخی ئێستای کۆمەڵگەی عەرەبی و ئەو قەیرانە ئاڵۆزەیە کە ئەو باروبۆخەی تێکەوتووە. هەر لێرەوە؛ (هەر توێژینەوەیەکی رەخنەیی کە تیشک بخاتە سەر لانی کەمی مێژووی دین- کە مێژووی سەرەتای ئیسلامیزمیش دەگرێتەوە-، ناکرێ وەک پرۆسەیەکی جددی

ڕەخنە گرتن بچێتە ژێر باروحەساری ئەو هەموو دەست بەسەرداگرتنەوە )[7] و ناکرێ مل بۆ ئەو هەموو ڕووبەڕووبوونەوەیە بدات. بەڵکو دەبێ و پێویستە ئەوە ڕەت بکاتەوە کە بچێتە ژێر باری هەل و مەرجێکی زیهنیی کلتووریی و، ئەو بارودۆخە سیاسی و کۆمەلایەتییەی کە باوەو لە ئارادایە، چوونکە ئەو ڕەتکردنەوەیە خۆی لە خۆیدا بڕینی دیواری حەسارەکەیە و سەرەتایەکە بۆ تێپەڕاندنی ئەو بارودۆخەشی کە باسمان کرد.

لەسەر بنەمای ئەم میتۆدە مەنهەجییەی ڕەخنەگرتن، توێژەری ناوبراو، هەموو ئەو خاڵانە ڕوون دەکاتەوە کە دەبنە هۆی لادان و ڕامالینی مەنهەجییەت و لە دەست بەسەرداگرتنی مێژووەوە سەرچاوە دەگرن و هەوڵی جۆرە جلەوکردنێکی لایەنی کۆمەلایەتی و کلتووریی کایەی دینی ئەدەن ئەویش بەمەبەستی بە دۆگماهێشتنەوەی ئەو کایەیە.. بە کورتی، ئەو خاڵانەش بریتین لە:

١. خۆدزینەوە لە ئیقرارکردن بە دیالەکتیکیی نێوان ( دال ) و ( مەدلول )، واتا: فیکر و واقیع.

٢. دامالینی فکر، یان ڕووتکردنەوەی فیکر لە گشت گەورەکانی خۆی. واتا ئاقارە کۆمەلایەتی و مێژووی و کلتووریی و ئاقارە بونیادییەکانی.

٣. نەفی کردنی دیالەکتیکی ( جەدەلی ) ناوەوە و دەرەوە و پشت گوێ خستنی پەیوەندی نێوانیان.

٤. لێک هەلاوێردن، یان جیاکردنەوەی میتافیزیکی لە ڕوانینە کلتووری ئیسلامیزمدا. لەنێوان هەردوو زاراوەی ( گۆڕان- التغيير ) کە لێرەدا مەبەست لە ( بدعە )یەو، زاراوەی ( تازەکردنەوە ) وەک بانگەشەیەک بۆ ئیشکردن لەسەر بنەڕەتی ناوەڕۆکە شەرعییەکەی ئیسلامیزم [واتا گەڕانەوە بۆ ئەسلی ئیسلامیزم- وەرگێڕ].

٥.. ڕیسواکردن و سڕینەوەی ( ئەوی دی- الاخر ) بەپێی لۆژیکی ( شوناس )ێکی نەگۆڕ و چەسپاو گونجاو، لێرەوە بە دیدێکەوە دەڕوانێتە ئەوی دی، ئەویش بەوەی کە نامۆ و گومان لێکراوە و دەکەوێتە دەرەوەی جوغزی بارودۆخە ئەسلییەکەوە ( هەر لە ئاکامی ئەو شێوازە دیدو بۆچوونیشەوە. دەقی ئەسڵیی ئیسلامیزم وەک بونیاتێکی داخراو لەسەر خۆی دەرکەوت. بونیاتێکی وا کە چەسپاندنو سەلماندنی خۆی لە خودی خۆیەوە هەڵدەهێنجێو، پاشان ئەو باوەڕە هاتە ئاراوە کە ( ئیسلامیزم خۆی، خۆی دەناسێنێ ) بە شێوەیەک کە پێناسەکەر و پێناسەکراو لەڕووی بونیات و ئەرکەکانیانەوە بەتەواوی جووت دەبن.. بەوەش هەر بوونێکی پاش خۆی کە هەوڵی خوێندنەوەی بدات. دووچاری ڕامالینو سڕینەوە دەبێ )[8] وێڕای ئەوە، دەتوانین بڵێین دەست بردن، یان کارکردن بەو ئاراستەیەدا کە باسی دنیای ( پێغەمبەرایەتی، یان پێغەمبەربوونی )

موحەممەد بکرێ- کە تەوەرەی توێژینەوەکەیە- لەڕووی دەق و بیۆگرافیای مێژوویی‌یەوە- السیرة التاریخیة- دەکرێ ئەو باسکردنە کۆمەڵێ کێشەی ئالۆزی تایبەت بە توێژینەوەو بەڵگە هێنانەوە لە کاریگەری خۆیدا بوروژێنێ. سەرباری ئەوەش، دەکرێ لەم ئاستەدا، ئاماژە بدەینە پێداویستی جیاکردنەوەی دوو سەمتی زیهنی‌ی- نسقین ذهنیین- (بەپێ بۆچوونی د.ط. تیزینی): یەکەمیان، بنەڕەتی ئیسلامیزم و بیۆگرافیای موحەممەدی- السیرة المحمدیة- کە کەسێتی‌ی موحەممەددا لە پێش دەعودی ئیسلامی و دوای دەعودا، دەردەکەوێ، بەو پێ‌یەی کۆگەیەکی مەرکەزیی خۆی و بابەتییە کە تیایدا سەرجەمی خەسڵەتە تایبەتی‌یەکان و خەسڵەتەکانی ئەو سەردەم و رۆژگارە و سەرجەمی بیروبۆچوونەکان چڕکراونەتەوە. هەروەها دەقی قورئانی و نەش و نماکردنی و پێگەیشتنی و، هەروەها دەقی حەدیس ئامێزیش. لە ئاکامیشدا، تێڕوانین لەو سێ لایەنە، بەو پێ‌یەی کە سێ دەرکەوتەی یەک بونیاتن.

هەرچی ستەمی دووەمیانە، لەو (لق و پۆ ئیسلامیزم)یەدا بەرجەستە دەبێ کە لە دوایی‌دا، وەک کۆمەڵێ لێکدانەوەی فکریی دەرکەوتن و چەند رێبازێکی فیکریی ئیسلامی‌یان پێک هێنا.

× × × ×

سەرەتا: رەخنەگرتن لە زاراوەی (جاهلیەت) بایەخێکی مەنهەجیی وەردەگرێت و دەبێتە ناوەندێ بۆ تەوەرەی توێژینەوەکە، هەروەها مەرجێکی مەعریفیی هەرە پێویست و بنەڕەتیی‌یە بۆ دامەزراندنی جیهانبینی‌یەکی زانستی.هەروەها مەرجێکی مەعریفیشە دەبێ لە کاتی دیراسەکردن و شیپکردنەوەی پرۆسەی گوێزانەوەی مێژوویی لە قۆناغی (پێش ئیسلام)ەوە بۆ (مێژووی ئیسلامیی)و گۆڕان لە ژیانی (چەند خودایی- الشرك)ەوە بۆ کۆمەڵگەی (التوحید)، لەبەر چاو بگیرێت. ئەم لەبەرچاوگرتنەش، ناتەبا و نەگونجاوە لەگەڵ ئەو وێناکردنە شێوازەی کە بە بیرکردنەوەی غەیبانیەتی میتافیزیکی پێشکەشی دەکات بەوپێ‌یەی کە گوایا ئەو گۆڕانکارییە ڕووداوێکی موعجیزەیی دانسقەو بێ‌وێنەیە و، لەسەر بناغەی لۆژیکێکی شەکڵانی تەفسیری دەکات و وای وەسف دەکات کە ئەو حاڵەتە گوێزرانەوەیە لە باروذۆخێکی (پڕ لە ماهیەتی فاسیدە بە شێوەیەکی رەها) بۆ باروذۆخێکی (پڕ لە ماهیەتی چاکەو خێر بە شێوەیەکی رەها)، کە لەنێوان هەردوو بارەکەدا نەفی و دابڕان و نەگونجان هەیە و، بەهیچ شێوەیەک ناکرێ بەردەوام بوون و بەیەکاچوونی ئەو باروذۆخە، یان هیچ پەیوەندییەکی سەبەبی لەنێوانیاندا ببینین یان وێنا (تصور)بکەین.

بە پێچەوانەی ئەوەوە و، بە شێوەیەک کە مەرجەکانی توێژینەوەی مێژوویی رەخنەگرانەی تێدا هاتبێتە دی (د. طیب تیزینی)، هاتووە ئەم پرۆسەی گوێزانەوەیە

بەوردی تاووتوێ دەکات ئەویش لە بواری جەدەلییەتی نێوان (رابوردوو و، دواتر و، بەردەوام بوون و لێک جیابوونەوەدا)، بەواتا ئیسلامیزم لەیەک کاتدا بەردەوامبوونی (جاهلیەت)ەو هاوکاتیش دابڕانە لێی، زیاتریش ئەوە دەخاتە روو کە خودی موحەممەد پێغەمبەر ئەوە لە (جاهلیەت)دا بەدی ناکات- کە هەر هیچ نەبێ لە ئیسلامەوە نزیکە- کە حاڵەتێکی پڕاوپڕی جەهالەتی دژ بە ئیسلامیزمی تێدابێ. چوونکە ئیسلامیزم لە عەدەمەوە نەهاتە دەرێ، هەروەها بە شێوەیەکی موتڵەقیش سەرەتایەک نەبوو بۆ دەستپێکردنی مێژوویەکی نوێ. پاشان ئەم روداوە و ئەو روداوە بە پێی پێویست مانای ئەو نییە کە نەفی‌یەکی گشتگیریی سەرتاپای بەر لە ئیسلام و سەردەمی (جاهیلی) بکات.

(فخیارکم في الجاهلیة خیارکم في الإسلام)[9] کە ئەمە خۆی بۆخۆی بانگەشەیەکی ئاشکراو ڕاشکاوی موحەممەدییە بۆ دەست گرتن بە پرەنسیپەکانی ئەخلاق و پێودانگەکانی جاهلیەتەوە بوو لە چوارچێوەی ڕێسا و ڕێکخستنی تازەی ئوممەتی ئیسلامیدا. هەروەها دریژە پێدانی ئەو پێودانگانە بوو لە پێکهاتەو هۆشمەندیی کۆمەڵگایەکی تازە گەشە کردوودا. هەر بۆیە (ئەو زاکیرە جاهیلی‌یەی کە پێی نایە چەرخ و سەردەمی ئیسلامەوە، هەروەک زاکیرەیەکی جاهیلی مایەوە- و ناکرێ وا بە ئاسانیی دوچاری سڕینەوە بێت، هەتا وەکو زاکیرەیەکی ئیسلامی بنج داکوتێ و پاشان ئەو زاکیرەیەی پێشوو نەفیی نەکات. ئەو نەفیی کردنەش نایەتە دی هەتا ئیسلامیزم بە شێوەیەکی عەمەلیی لە چەرخ و سەردەمی خۆیدا، مومارەسەی چەرخەکەی خۆی نەکات و نەبێتە ئەو هۆشمەندییەی کە بە شێوەی زاکیرەیەکی تازە ئیش بکات)[10]
کەواتە دەکرێ بڵێین، وەک گریمانە، پەیوەندیەکی سەبەبی لەنێوان (دەقی قورئانیی) و (دەقی جاهیلی)دا هەبووە کە دەکارێ پانتایی و لایەنە رۆشنبیریی و کلتوورییەکانی ئەو دەقە جاهیلیە لە ناوەوەی دەقی ئیسلامی خۆیدا پەی پێ ببرێ و بدۆزرێتەوە. گەر وانەبوایە. چۆن تەفسیری دەقی [دخول (الناس في دین الله افواجاً)] بکەین ئەگەر ئەوان لە زمانی ئەو خیتابە تازەیە نەگەیشتبایە کە لە یەک کاتدا وەک دەق و پەیام کەوتە بەر دیدیان و نەخوازەلا ئەوان پێشتر ئینتیمایەکیان بۆ کایە رۆشنبیرییەکەی جاهیلیەت هەبووە، کە رۆشنبیرییەکی تەواو جیاواز بوو لە هی دوای خۆی...؟)[11] ئەو پەیوەندییە سەبەبی‌یەش خۆی لەو ڕێچکەیەدا دۆزیوەتەوە کە ئیسلامیزم کۆمەڵێ رەگەز و عورف و سرووت (طقوس)و بیروباوەڕی لە ژیانەکەی پێشووەوە وەرگرت و موتوربەی کردن و هەندێ گۆڕانکاری تێدا بەرپاکرد و سەر لە نوێ بەپێی لۆژیک و شێوازێکی نوێ، بنیاتی نانەوە و، پاشان ئەرک و پەیامێکی تازەی لە چوارچێوەی جیهانە تازەکەدا پێ بەخشین. ئەرکی گرنگی ئیسلامیزمیش لێرەوە سەرچاوە دەگرێ کە (غائیبێک) یان

( غانیبێکی شاراوە ) بدۆزێتەو و هەوڵی لەنوێ بیناکردنەوەی بدات بەمەبەستی گەڕان و دۆزینەوەو پەی بردن بەسەرجەمی رەگەزە عەقیدەییەکان و ویناکردنە فکرییەکان و سەرجەمی ئەو پێشینە کۆمەڵایەتیانەی کەڕێ خۆشکەری دەرکەوتن و نەش و نمای ئیسلام بووە، هەروەها شێوازی ئەو پەیوەندییە مێژوویی و کلتوورییەی کە لەنێوان ئیسلام و سەرجەمی بیروباوەڕو پێودانگ و عورف و عاداتی پێش خۆیدا، هەبوون )[١٢] پاشتریش لە بەرگێکی ئیسلامیدا خرانە روو. هەروەک ویناکردنەکانی رۆژی ئاخیرەت و زیندووبوونەوە و قیامەت و مەسەلەی ( التوحید ) یان ( الوحدانیة ) و تێکچڕژانی هەمو ئەوانە لەگەڵ ( چەند خودایی- الشرک )دا و هەروەها باقی رۆژوگرتن و نوێژ و و زەکات. وێڕای پێودانگ و عورفی وەک تۆڵەسەندنەوەو پێودانگە قەبەلییەکانی تریش... هتد.

× × × × ×

شوێنی سەرەتا، مەککە بوو.. پاشان مەککە بووە ( ماڵی پیرۆزی خوا ).. مەکە لە سایەی جێکەوتی ئابووری و دینی و سیاسیی خۆیدا، رۆڵێکی وەزیفیی گەورەی بینی لە رێگە خۆشکردن بۆ سەرهەڵدانی موحەممەد و ئیسلامیزم. هەروەها سەرجەمی خەسڵەتە جیۆگرافیی- مەناخییەکانی کە تایبەت بوون بە نیوچە دورگەی عەرەب و مەککەشیان گرتبۆوە، بە شێوەیەکی جەوهەریی بە شداربیەکی کاریگەریان هەبوو لە سەرهەڵدانی هەل و مەرجە بنەڕەتییەکانی نۆژینی ( الإنبعاث )ی ئیسلامیزمی موحەممەدیدا. لەم بارەیەوە. ( مارکس ) بۆ ( ئەنگلز ) دەنووسیو دەڵێ: ( لە زەمەنی موحەممەددا، رێگای بازرگانیی. لە ئەوروپاوە. بەزۆریی بەرەو ئاسیا وەرچەرخا. هەروەها شارەکانی نیوچە دورگەی عەرەبی کە لەوەو بەر بەشدارییەکی گەورەی بازرگانییان لەگەڵ هینددا دەکرد، لەرووی بازرگانییەوە دووچاری دارمان هاتبوون، ئەمەش تەکانێکی گەورەی بەخشییە ئەو- مەبەستی ( موحەممەدە ).. لە وەڵامی نامەکەی ( مارکسدا )، ( ئەنگلز ) ئەوە ئیزافە دەکات و دەڵێ: ( لە راستیدا نەبوونی موڵکایەتی تایبەتیی بۆ زەوی و زار دەبێتە بناغەی هەموو دیاردەکان لە رۆژهەڵاتدا، ( تورکیا، وڵاتی فارس، هندستان هەر ئەمەش بووەتە کلیلی راستەقینەی فردەوسی رۆژهەڵاتی ).. ( ئەوە بنەمایەکە بۆ تێگەیشتن لە سەرتاپای رۆژهەڵات و، هەر لەوێشەوە مێژووە سیاسی و دینی یەکەی رۆژهەڵات دەست پێدەکات ).

بەڵام بۆچی گەلانی رۆژهەڵاتی، بە شێوەیەکی سەرەکی نەگەیشتوونەتە موڵکایەتی تایبەتی بۆ زەوی و زار و، تەنانەت بۆ مەڵکایەتیی دەرەبەگایەتیش؟ من وای بۆ دەچم کە هۆی ئەوە بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئاو و هەوا و سروشتی خاک، بە تایبەتیش بۆ ئەو پشتێنە سەحراییە فراوانەی ( شریط الصحراء ) کە لە سەحرای

گەورەوە دریژ دەبێتەوە و بە دوورگەی عەرەبی و ولاتی فارس و هیند و ولاتی ئەتەردا تێدەپەڕێ تاوەکو دەگاتە ئەوسەری ولاتی نەجد لە ئاسیادا[12]...

بێگومان ئەم حالەتەش، تەفسیری ئەو گۆڕانکارییە قووڵ و رەگاژۆیە دەکات کە لە بواری ئابووری و کۆمەلایەتیدا و لە سەدەی شەشەمدا رووی دا و هەر ئەو گۆڕانەش لەپشت سەرهەلدانی مەدەنیەتی (مەککە)وەیە وەک ئاڵتەرناتیڤێکی گەورەی ئابووری و بازرگانی، وێڕای ئەوەی کە مەلبەندێکی عیبادەتی دینی بوو (قورئان خۆی وا وەسفی مەککەی کردووە کە :(واد غير ذي زرع )/ ابراهيم، ٣٧/ لێرەوە بازرگانی شاخوێنبەری ژیان بوو تێیدا).

هەروەها خودی قورئان خۆیشی تەعبیری لەم جۆرە بایەخ پێدانە کردووە، ئەویش بە پێکەوە گرێدانی هەردوو رەهەندی جیۆگرافی و بازرگانیی بە رەهەندی عیبادەتەوە لەرووی وەزیفی و بونیاتیشەوە[14] وەک پێکەوە گرێدان و پەیوەندییەکی پاشکۆیانە (تابعية). ئەو تەعبیرکردنەش لە سورەتی قورەیش دا هاتووە: (لإيلاف قريش، إيلافيهم رحلة الشتاء و الصيف، فليعبدوا ربّ هذا البيت، الذي أطعمهم من جوع وآمنهم من خوف).

ئەم گۆڕانکارییە بووە هۆی زیاتر چەسپاندنی دەسەلاتی (ئۆرۆستۆکراتیەتی مەککەیی). کەڵەکەبوونی سەروەت و سامان هاتە ئارلوە، لە بەرامبەریشدا درزێکی قووڵ و جیاوازییەکی لەبەرچاو کەوتە نێوان دەستەو توێژە کۆمەلایەتیەکانەوە، ئەمەش ئارێکی وای کرد کە سەرەتاکانی لە دەورخڕبوونەوەی چینایەتی بێتە ئاراوە لەسەر حیسابی ئەو بونیاتە خزمایەتی خێڵەکییەی کە لە ناوەوەی خۆیدا دەستی کردبووە لێک ترازاندن. لەگەڵ ئەم خڕبوونەوە چینایەتییەدا، دیاردەی (کۆیلایەتی) یان (کۆیلەکان) هاتە گۆڕێ کە شان بە شانی فراوان بوون و پەرەسەندنی بزاوتی ئابووریی و سیستەمی ڕیبازەکانی دا (المرابأة) ژمارەی کۆیلەکانیش لە زیادبوون دا بوو، بە جۆرێ کە بوونە مادەیەک یان شمەکێ بۆ بازرگانی و سەوداکردن و ئاڵوگۆڕ هەروەها تاکو رادەیەکی زۆریش کەرەسەیەکی زیندوو بوون بۆ مەسەلەی بەرهەمهێنان. زۆربەی ئەو کۆیلانە، بەخت رەشییان لەوە دابوو کە لە ئەنجامی نەداریی و بێتوانایییان لە دانەوەی قەرزی سووخۆر و ریباکاراندا دەبوونە نێچیری کۆیلایەتی و وەکی تر دەبوونە کۆیلەی خاوەن قەرز. کورتەی مەبەست ئەوەیە: ئەم جیهانە تازەیە یان- ئەم باروبۆخە نوێیە- لە مەناوی ژیانی*دەشتەکی- البداوە- و لە بواری پرۆسەیەکی مێژوویی کەڵەکەبوونی دارایی و شمەکەوە هاتە دەرێ، لەگەڵ خۆشیدا چەندین شێوازی نوێی بیرکردنەوە و چەندین بیروباوەڕ و پەیوەندی مرۆیی هێنایە ئاراوە.

لە کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمدا، مەکە جێگەوتێکی مەرکەزی وەرگرت لەڕووی ئالوویزی شمەک و بیروباوەڕ (المعتقدات) و فیکرەوە. چەندین خاوەن کۆیلە و دەسەلات داری قورەیشی پەیدابوون و هەرچی جلەو و دەسەلاتەکانی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی و حقوقی و دینی هەیە گرتە دەست خۆیان، بەو پێیەی کە ئەوان دەمراست و بەرپرسی کاروباری موقەددەساتی (کەعبە)ن، بەمەش ناووک و کرۆکی دامەزراوێکی دەولەتیی ئۆرۆستۆکراتییان پێک هێنا کە لەسەرەوەی بزاوتە بازرگانییەکەدا رابوەستێ و، ئەم تەداسەتە ئەرک و کاروبارەکانی رێخستن و راگرتنی بارودۆخەکە رابپەڕێنێ. ئەم دەسەلاتە، بەرەبەرە لە پەیوەندییە واقیعیەکانی خۆی دوورکەوتەوە و لێیان جیابووەوەو بەرەو خۆبەگەورەتر راگرتن چوو بەو پێیەی ئەم دەسەلاتە درێژکردنەوەو بەردەوامبوونی تەداسەتە مێژوویەکەی (سامیزم)ە- السامیة- لەرێگەی پیادەکردنێکی فیعلیەوە -بە تەعبیری مارکس-.

پاشان هەر خودی ئەم دەسەلاتە، بیروباوەڕەکانی خۆی و وای لە خەلکی دەگەیاند کە بەتەنها ئەو بیروباوەڕانە لەڕووی کەونیەوە راست و دروستن و لەتەک بەرژەوەندیی هەمووانیدا دەگونجێن. لێرەوە (د. طیب تیزینی) هەوڵ دەدات ئەو جووت بوون و تەبایی بوونە وەزیفی و بونیاتیە بدۆزێتەوە کە لەنێوان یاسا و پەیوەندییە ئابوورییە باوەکان (بازرگانی و بازاڕ) لەلایەک و، سیستمی عەقیدەیی (پەرستنی بتەکان) لەلایەکی ترەوە؛ هەبووە. (بت پەرستی لەلای مەککەییەکان، بیروباوەڕێکی هێندە چەسپیو بوو لەژیانیاندا، بەبارتەقای چەسپینی بەرژەوەندییەکانیان بوو)[١٥]. بۆ ئەو مەبەستەش- بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆربەی ئیسلامییەکانەوە- ئەو ریوایەتەی- إبن الكلبي- دێنێتەوە کە لە (کتاب الاصنام)دا باسی پەیوەندیی دواتری خودی پێغەمبەر خۆی بەبت پەرستییەوە دەکات: (وقد بلغت أن رسول الله (ص) ذكرها يوما فقال: لقد أهديت للعزّة شاة عفراء وأنا على دين قومي)[١٦] ئەم جووت بوونە وەزیفییەی نێوان لایەنی سیاسی و، لایەنی ئابووری پێکەوە کارێکی وای کرد کە (قودسیەتی دین، یان موقەددەسی دینی وا خۆی بنوێنێ و دەربکەوێ کە دەروازەیەی بۆ سەرجەم چالاکییە بەشەرییەکان و، هاوکاتیش ئەو دابەشکردنە شوێنکاتییەی کە بە (الأشهر الحرام) ناوازە کراوە، پیرۆزیی و حەصانەتێکی دینی وای پێبەخشیوە)[١] کە لەڕووی راگرتن و رێکخستنەوە لە سەرووی چالاکییە ماددی و مەعنەوییەکانی ترەوە بێ. لە یەکێک لە رەهەندە دەلالیەکانی خۆشیەوە ئەم حالەتە بووە هۆی گەشەکردنی مەککە و ئەو هەژموون و دەسەلاتەی کە دەسەلاتدارە قورەیشییەکان لەڕووی سیاسی- ئابووری و بیروباوەڕەوە بەسەر ئەوانی

دیکەدا پەیدایان کردبوو. لە بەرامبەریشدا، خۆبەدەستەوەدان و مل کەچکردنێکی بەردەوام لەلایەن عەرەبەوە بۆ دەسەڵاتدارانی مەککە دەنوێنرا، ئەو مەککەیەی کەوا کەعبەی پیرۆزی لە ئامێز گرتبوو.

ئەم بارودۆخە، لەپاش تێشکان و سەرنەکەوتنی شاڵاوی داگیرکردنی حەبەشەکان زیاتر چەسپی و بنجی داکوتا (شاڵاوی حەبەشەکان لە ساڵی ٥٧٠/ عام الفیل دا بوو.. کەوتنەوەی کتوپڕی نەخۆشیی ئاوڵە هەر لەو ساڵەدا لە دورگەی عەرەبیدا، هۆیەکی سەرەکی بوو لە شکست هێنانی حەملەکەی (أبرهة الحبشي)دا، کە دواتر ئەو شکستە بە پێی بونیاتی بیروبیاوەڕی باوی ئەو کاتە وا لێکدرایەوە کە ئەوەندە ئەفرەتێکی ئاسمانییە و بەر هەموو ئەو ئاژاوەچی و پیاوخراپانە دەکەوێ کە دەیانەوێ (ماڵی پیرۆز- البیت المقدّس) راماڵ بکەن- بەتەعبیری (طیب تیزینی).

دوای ئەو تێک شکانەی حەبەشیەکان، دەسەڵاتدارانی قوڕەیشی لە مەککەدا، ئەستێرەیان زیاتر دەرەوشایەوە و ئیتر لەوە بەدوا وەک زمان حاڵی عەرەب و (هبل) ی خواوەندو، پارێزگارانی کەعبە دەرکەوتن. لێرەدا پێویستە ئەوە لەبەر چاو بگیرێ کە : (فرە خواوەندیی* کە ژمارەیان یەکسان بوو بە ژمارەی قەبەلیەکان و وتراوە ژمارەیان گەیشتۆتە (٣٦٥)بت) بەرەبەرە دەستی کردە پووکانەوە، ئەوەش بۆخۆی سەرەتایەک بوو بۆ دەرکەوتنی ئاسۆی- تەوحیدی ئیلاهی-. ئەم حاڵەتەش رەنگدانەوەی سەرهەڵدانی ئەزعەی یەک بوونی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی بوو)[١٧] لەهەمان کاتیشدا. ئەم حاڵەتە، بێتوانایی دیاردەی فرەخواوەندیی و فرە بت پەرستێتی دەرخست لە بەرامبەر بەجێهێنانی پێداویستییەکانی پەرەسەندنی دوا تردا، ئەو پەرەسەندنەی دواتریش بریتیبوو لە پێداویستیی خوڵقاندنی دەسەڵاتێکی ناوەندیی دا کە هەل و مەرجی لەبار بڕەخسێنی بۆ گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی. لێرەوە. دیاردەی فرە خواوەندیی، بووە لەمپەرێک لەبەردەم ئەم پێشکەوتن و پەرەسەندنەدا، تاکو وای لێهات بە ناچاری رێگا چۆڵ بکات بۆ دیاردەی (تەوحید). بەو پێیەی دیاردەیەکی ناوەکی و، هەمان کاتیش دەرەکییە.

لەم باردیەوە، بایەخی ئەوە توێژینەوەیە بەرجەستە دەبێ کە لەبارەی سروشتی سەرهەڵدانو بوون و ئایندەی چاوەڕوانکراو و پێداویستیەکانی تەجەلیاتو درەوشانەوە تەوحیدییە گەورەکانی نێو دورگەی عەرەبییەوە، ئەنجام دەدرێ.. وەک یەهودیەت و نەصرانیەت و زەردەشتیەت و... هتد و هەر درەوشانەوەیەکی دیکەی تەوحیدیی ئەو کات و سەردەمە.. [سەرنجی وەرگێر: ئەم جۆرە درەوشانەوانە، سەرچاوە بنەڕەتیەکەیان دوورگەی عەرەبیی نەبووە وەک نووسەر وای دەبینێ- وەرگێڕ] (د.طیب تیزینی). لە جیاکردنەوەو هەڵاوێرکردنی نێوان (بونیات) و (وەزیفە)دا، دەگاتە ئەوەی

پێ لەوە بنێ کەوا: (بەتەنها، بەرزکردنەوە و هەڵگرتنی دروشمێکی فیکریی- دینی کە لەسەر دوو جۆر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی بەرجەست کراودا ڕەنگی دابێتەوە، بەس نیە بۆ ئەوەی لە یەک چوون و لە یەکترا نواندنێکی ماهیەت ئامێز لەنێوانیاندا بێتە ئاراوە. چوونکە وەها دروشمێک تەنها لەیەک ئاست و یەک دەربڕینـدا تەعبیر لە خۆی ناکات، بەڵکو لە چەندین ئاست و دارشتە و ئیحتیمالاتی جۆر بە جۆر و جیاوازدا و، بە شێوەیەکی کاریگەرانە یان پەراوێز ئاسا، تەعبیر لە خۆی دەکات. پاشان وەک لایەنە گشتگیرییەکەش. ئەوەندە بەس نیە کە بڵێین سەرجەمی ئەو بۆچوون و وێناکردنانەی کە لەبارەی تەوحیدی خواوەندییەوە- التوحيد الربّوي- لە مەککەدا لە ئارادا بوون. سەرجەمی ئەو بۆچوون و وێناکردنانە، ڕێک لەگەڵ هەمان میتۆدی تەوحیددا یەک دەگرنەوە کە لە شوێنانی دیکەی وەک بیزەنطە و فارس شوێنانی دیکەدا لە گۆڕێدا بوون)[18]. لێرەوە، مایەی بایەخ پێدان و گرنگیە بە دیدێکی قووڵەوە بڕوانێتە ئەو میتۆدەی کە لە دەرەوەی مەککەوە هاتووە، بۆنموونە با ئەو میتۆدە کە وەک دیانەتێکی تەوحیدیی لە ئارادابووە (ئەصرانیەت) وەربگرین، ئەو کاتەی ئەصرانیەت هاتووە، یان پێشتر هەبووە بەپێی کۆمەڵێ پێداویستی ناوەوە و هەل و مەرجی ڕێکخستنی کۆمەڵگە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، مەبەست (بارودۆخی عەرەبی جەزیرەیە)، ئەو مامەڵە کردنەی دواتری ئیسلامیزمیش لەتەک ئەصرانیەتدا لە ڕێگەی پرۆسەیەکی دیالەکتیکی و موتوربەکردن و پێتاندنی کلتووریی- عەقیدەیی یەوە لەم کایە شوێنییەدا- الحقل المكاني- کە مەبەست مەککەیە، ئەنجام دراوە. لە ئەنجامیشدا، بیرۆکەی سەرەتای- تەوحیدی ئیسلامیزم- درێژبوونەوە و بەردەوام بوونی سەرجەمی ئەو دنیایە بووە کە لە پێش خۆیداهەبوون، لە هەمان کاتیشدا درووستکردنی (دابڕان- قطيعة)ش بووە لەگەڵیاندا.

لەم ئاقارە مێژووییەدا، توێژەری ناوبراو دەست بۆ بڤەترین و حەرامترین هێز رادەکێشێ کە ئەویش ڕۆڵی -خوا-یە، چ وەک زاتێک و چ وەک مەوزوعێکیش بۆ تەوحید.. ئەو پێی وایە، خوا، هەتاوەکو سەدەی چوارەمیش، بەبەراوردکردن لەگەڵ (هُبَل) و هەرسێ پەرستراوەکەی تردا: (العزّى) و (اللات) و (مَناة)، ڕۆڵێکی ئاسەرەکیی هەبووە. هەروەها توێژەری ناوبراو، سەرجەمی ئەو گۆڕانکاییارنەی کەبەسەر لایەنە مێژوویی و زمانیی و دینییەکانی (خوا)[19] دا هاتووە، وا لێک دەداتەوە کە: (خوایەکەی موحەممەد، یان خواوەندی موحەممەدی، واریسێک یان میراتگرێکی شەرعیی ئەو گۆڕانکارییە ڕێک و ڕەوانەیە کە دووچاری خواوەندەکان بوو لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆنی عەرەبیدا و وەکی تر فکرەی (خواوەندەکان)ی لەبەریەک هەڵوەشاندەوە، ئەو فکرەیەی کە هاتاکو سەدەی حەوتەم بەردەوام بوو)[20]. ئەم-

خواوەند- ەی مەحەممەد، لەدوا رستە و لە دوا وشـەی خۆیدا و لـە مەحفەلی سـەرجەم خواوەندە سەرەکی و ناسەرەکییەکاندا- مەبەست (هبل و العزّي).. ئەوانـەی دیکەیـە- لە دوڕگەی عەرەبیدا قسەی خۆی یان مەبەستی خۆی پێشکەش کرد و رایگەیاند، ئەویش لـە رێگـەی جێبـەجێ کردنـی هـەژموون- هەیمـەنێتێکی جنسـی‌ی باوکسـالاریی و. زەبروزەنگی لاهوتیانەی کەونیـەوە، بـۆ ئـەوەی لـە ئاکامدا، جاڕی یـەک خوایـی تـاک و تەنیا- الإله الواحد (الاوحد)- بدات، ئەم جاڕدانەش دواجار تەعبیرکردنە لە بەرئـەنجامی سەرجەم ئەو گۆڕانکارییە عەقیدەیی دینی‌یە قووڵانەی کە هاوشـان و هاوزەمـانی رێبـاز و بۆچوونەکانی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی بووە.

**- رەخنـە گرتن لـە دەقـی- بیۆگرافیـەی-: موحەممـەد کـوڕی ئاسمانـە.**

**- پێغەمبەری ئەمین: لەڕاستیدا، من کوڕی ژنێک بـووم، لـە مەککەدا گۆشـتی قاورمەی دەخوارد.**

دیالەکتیکی، واتا جەدەلیەتی بزاوتی مێژوویی، بەر لـەوەی لەهەر کایەیـەکی تـردا رەنگ بداتەوە، لـە کلتوور و رووناکبیریدا رەنگ دەداتـەوە. چوونکـە چ کـەلتوور و. چ رووناکبیریش بەجیا لە واقیع و ژیانی ماددی. هیـچ ئامادەبوونێکیـان نییـە. بـەپێی ئـەم بۆچوونە یان بـەپێی ئـەم جیهانبینی‌یە، (دەقی بیۆگرافیـایی دەمـاودەم کـراو- النص السيري الموروث) دەبێتـە رێسـایەک بـۆ چلاکـی مێـژووی فیقهـی و، هـەروەها دەبێتـە تەوەرەیـەکی دامەزرێنـەر بـۆ کەڵچـەریی رەسمـی‌ی ئیسـلامیزم. ئاشـکرایە دەقـە بیۆگرافیاییەکان- النص السيري- پاش کۆچی دوایی موحەممـەد بەنزیکـەی دوو سـەدە لـە گەرمـەی ململانێی سیاسی و مەزهەبیـەکاندا بسـەریان هـەڵدا. بـەواتا سـەرەتایی تیوریزەکردن و بە ئایدۆلۆژیاکردنی ئەو دەقانە خۆیانەوە لەلایـەن دەسـەڵاتەوە. ئـەویش لە کۆک بوون و رێککەوتنێکی لەیەک کاتدا نهێنی و لە هـەمان کاتیشدا ئاشکرای نێوان هەردوو دەسەڵاتی سیاسی و فیقهییدا، کە هەردوو لایان ئەو دەقانەیان کردە پاشکۆیەکی ئـایدیۆلۆژیی سـەر بـە ـ دەوڵـەت بەمەبەسـتی بەهانـە هێنانـەوە و پاسـاودان لەلایـەک و. لەلایـەکی تریشـەوە فتـوادان بەڕاستی‌ی و مەشروعیەتی ئـەو دەسـەڵاتەی کـە هەیـە و تەسلیم بون پێی.

ئەم کلتوورە یان ئەم میراتە فیکرییە- بـە بۆچوونـی (طيب تيزيني) توانـای ئـەوەی نەبوو کە وێنە یان تابلۆیەکی دەقاودەقی ژیانی موحەممەد پێشکەش بکات یـان بەرهـەم بهێنێ. چوونکە بە شێوەیەکی گشتی ئەو کەلتوورە لـەنێو پانتـایی، یـان لـە نێـو کایـەی (دەقی نوسـراوەی دەمـاودەم کـردووداً) ئیش دەکات و، وەکـی تریش لـە ئاقـارێکی مێژووییدا کە پڕە لە غەیبانییەت و حەرام و قەدەغەدەکردن و فتوای بەپـەراوێز کـردن و ریسواکردن. ئەو دەقەو ئیجماعێکی ئایدۆلۆژی لەبارەوە وەرگیراوە.

سەرجەمی ئەو هۆکارانەی باس کران، کاریگەرییەکی وایان کرد کە پێکهاتەی ئەو تابلۆیەی یان ئەو وێنەیەی کە ئێمە باسی لێوە دەکەین- مەبەست ژیانی دەقاودەقی موحەممەدە- دووچاری جۆرێک لە ئاڵۆزکردن و زیاد لە پێویست گەورەکردن بێت. ئەوەی دیاردەی باو بو لەو تابلۆیەدا بزربوون یان بزرکردنی رووداوە مێژوویییە واقیعییەکە )بوو، ئەو بزربوون یان بزرکردنەش، لە بەرژەوەندیی چەند شێوازێکی خولقاندن و مەزنکردن و پەرچووی دینی (الإعجاز الديني) بوو، ئەوەش وای کرد زۆربەی هەرە زۆری بایەخ و راستگۆیەتی مەعریفیی و مێژوویی خۆی لە دەست بدات. ئەم حاڵەتە بە ئاشکرا لەلای زۆربەی ئەو نووسەرانەی کە بیۆگرافیای پێغەمبەریان نووسیوەتەوە، دەردەکەوێ. ئەو کاتەی بمانەوێ میکانیزمی (ئالیەتی) وێناکردنە گشتییەکەی ئەو نووسەرانە بۆ (مێژوو) تاوتوێ بکەین. سێ رێبازی سەرەکیی هەن، کە نووسەرانی بیۆگرافیای موحەممەد هەوڵی دەرخستنی ئەدەن، ئەو سێ رێبارەش: (پێشکەش کردنی، یان نمایشی حاڵەتە لەیەک چووەکان) و (ئیبرازکردنی پێشڕەوایەتیی) و (هەڵهێنجانی عیبرەت)ە. هەر لێرەشەوە، توێژەر هاتووە چەندین بەڵگەو نموونەی زیندوی لەسەرچاوە کلتوورییە بیوگرافیاکانەوە هەڵهێنجاوە و لە پێناوی رەخنەی مێژوویی. میتۆد ئامێزدا بەکاری هێناون[21] ئەو جۆرە رەخنەیەش، پێویستی بە چەندین پرۆسەی رێکخستن و میتۆدی گشتیی توێژینەوە هەیە، کە لەم خاڵانەدا کۆ دەکرێنەوە:

١- جیاوازییکردنی. یان لێک هەڵاوێردنی (ئیسلامیزمی رەسمیی) و (ئیسلامیزمی تیۆریی)و راگرتنی پەیوەندیی نێوانیان لە بواری پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتی سیاسی و، رووناکبیرییەوە.

٢- جیاوازیی کردن و لێک هەڵاوێردنی نێوان (ئیسلامیزمی میللی) و (ئیسلامیزمی فەردیی) و گەڕان بە شوێن بونیات و وەزیفەی زیهنیی و ئایدۆلۆژیی هەر یەکێک لەو ئاست و رەهەندانە لەبەر رۆشنایی باسکردنی پەیوەندییەکەی پێشوودا.

٣- جیاوازیی کردن، یان هەڵاوێردنی هەدوو بونیاتی رووکەش و راستەوخۆی ئەو کلتوورەو، بونیاتی قووڵ و رەگاژۆی هەمان کلتووردا.

٤- هێنانەوە، یان گێڕانەوەی دەقە بزربووەکان یان بزرکراوەکان، ئەویش بەهۆی شیکردنەوەی تەئویل و راڤەکردنەوە و، لەرێگەی هەڵوەشاندنەوەی دەق و، جارێکی تر بنیاتنانەوەو کردنی بە دەقێکی کۆمەڵایەتیی مێژوویی وا کە چەند خەسڵەتێکی دیاریکراوی هەبێت و جێگەی توێژینەوەی مێژوویی- زانستی بێت. بە وتنێکی تر؛ دەبێ دەق بخرێتە پاڵ ئەزموونێکی کۆمەڵایەتیی و مێژوویی وەهاوە کە بەردەوام ئەو ئەزموونە، داوای وەڵامە تیۆرییە تازەکان بکات و بیانخوازێ.

٥- قورئان، بەو پێیەی کە سەرچاوەیەکی تایبەت و خەسلەتدارە، دەکەوێتە ژێر باری دوایەمین دیاریکردنەوە...[٢٢].

پەراوێزەکانی (بەشی یەکەم):

[×] د.طيب تيزيني:- مقدمات اولية في الاسلام المحمدي الباكر (نشأة و تأسيساً)، دار دمشق. ١٩٩٤. ئەم کتێبەی (تیزینی) بەشی چوارەمی ئەو پرۆژەیەی ناوبراوە کە باسی فکری عەرەبی دەکات لەسەرەتایی سەرهەڵدانیەوە هەتاکو قۆناغی هاوچەرخ. پێشتر ئەم بەشانەی لێ بڵاوکراوەتەوە:

بەشی یەکەم:- (من التراث الى الثورة) حول نظرية مقترحة في قضية التراث العربي، دار دمشق، الطبعة الثالثة.

بەشی دووەم:- الفكر العربي في بواكيره وآفاقه الاولى، دار دمشق، ١٩٨٢.

بەشی سێیەم:- من يهوه الى الله، لە دوو بەرگەدا، دار دمشق، ١٩٨٥/ ١٩٨٦.

بەدوای (بەشی چوارەمدا)، بەشی پێنجەم دێت بەناونیشانی: (النص القرآني أمام إشكالية البنية و القراءة).

(×) قورئان.

[١] ماركس، انجلز: رسائل مختارة، ترجمة: الياس شاهين، دار التقدم، موسكو، ١٩٨٧، ص٦٧.

[٢] بڕوانە: ميشال برتران: وضعية الدين عند ماركس و انجلز، ترجمة صلاح كامل، دار الفارابي، بيروت ١٩٩٠ ص٧٤.

[٣] د.طيب تيزيني: مشروع رؤية جديدة الى الفكر العربي، من يهوه الى الله، م٢، دار دمشق ١٩٨٦، ص٤٥٢.

[٤] د.حسين مروة: النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية، دار الفارابي، بيروت ١٩٨٠، ص٥.

[٥] د. طيب تيزيني: مقدمات اولية في الاسلام المحمدي الباكر نشأة و تأسيساً، الجزء الرابع، دار دمشق ١٩٩٤، ص٢٥.

[٦] د. طيب تيزيني: مقدمات أولية (سەرچاوەی پێشوو) ص٢٢.

[٧] د. طيب تيزيني: مقدمات أولية (سەرچاوەی پێشوو) ص ٣٥.

[٨] د. طيب تيزيني: مقدمات أولية (سەرچاوەی پێشوو) ص ٣٢.

[9] صحيح البخاري، طبعه وأخرجه د. مصطفى ديب البغا، بەشی سێیەم، بیروت ١٩٨٠، ص١٢٢٤، ١٢٨٨، ١٣١٥. هەروەها هەمان سەرچاوەی پێشووی تیزینی، ص٤٧.

[10] حسێن مروة. العالم، دکروب، سعد: دراسات في الاسلام، دار الفارابي، بیروت ١٩٨١، ص٢٥.

[11] د. نصر حامد ابو زيد: دراسة في علوم القرآن، المركز الثقافي العربي، بيروت ١٩٩٠، (ص٢٤) وما تليها.

[12] د. طيب تيزيني: مقدمات أولية (سەرچاوەی پێشوو) ص٦٠.

[13] ماركس و أنجلز: رسائل مختارة (سەرچاوەی پێشوو) ص٦٧،٦٨،٦٩.

[14] بڕوانە: د. طيب تيزيني: مقدمات اولية (سەرچاوەی پێشوو) ص ٦٦.

[15] د. طيب تيزيني: مقدمات أولية (سەرچاوەی پێشوو) ص٨٣.

[16] (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ص٩١.

[17] (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ص٨٣.

[18] (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ص١١٦.

[19] (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، ص١٢٣.

[20] بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە د. طيب تيزيني: الفكر العربي في بواكيره وآفاقه الاولى، بەشی دووەم، دار دمشق ١٩٨٢. ص (٢٧٦) وەلاپەڕەکانی دوای.

[21] د.طيب تيزيني: مقدمات أولية في الاسلام المحمدي نشأة وتأسيساً، دار دمشق ١٩٩٤، ص ١٣٣.

[22] بڕوانە د.طيب تيزيني: مقدمات اولية (سەرچاوەی پێشوو) ص ١٦٤ ولاپەڕەکانی دوایی

(٢٣) ميشال برتران: وضيعة الدين عند ماركس وانجلز (سەرچاوەی پێشوو)، ص٢١.

(٢٤) بڕوانە: د. طيب تيزيني (مقدمای اولته) سەرچاوەی پێشوو ص١٦٩.

بەشی دووەمی ئەم باسە لە ژمارەی داهاتوودا بڵاودەکرێتەوە.

# جەمسەرگیری فیکری

## لەنێوان (ئیسلامی هاوچەرخ) و (بە ئیسلامی کردنی سەردەم) لەمیسردا

د.نصر حامد ابو زید

و: گوتار

لە بارو دۆخی ئێستای ژیانی ڕۆشنبیری میسری دا حالەتێکی جەمسەر گیری توندو تیژی ئاشکرا هەیە. لێرەدا جیاوازیەک هەیە کە-حالەتی ئەم جەمسەرگیریە دەخاتە ڕوو ودووپاتیشی دەکاتەوە- سەبارەت بە وەسف کردنی ئەم بارودۆخە، بۆ نمونە نوێنەرانی گوتاری ئیسلامی، وا باس لەو جەمسەرگیریە دەکەن بەوەی جەمسەرگیریەکە لە نێوان( ئیسلامیەکان ) و ( عەلمانیەکان )دا. بەلام نەیارەکانیان- کە بە عەلمانیەکان دەناسرێن-خۆیان لەم وەسف کردنە لادەدن و، لەبری ئەوە باس لە ململانێی نێوان ( دوو ڕۆشنبیری ) دەکەن: ڕۆشنبیریەکی تەقلیدی موحافیز کار لەلایەک، وەڕۆشنبیریەکی لیبرالی یان-ڕۆشنبیریەکی ڕۆشنەگەری- لەلایەکی ترەوە. وەلایەنێکی سێیەمیش هەیە هەولی ئەوە دەدات ببێتە ( ناوەندێکی ) میانڕەوو، باس لەزیان و مەترسیەکانی جەمسەرگیری دەکات، ئەو ئاکامانەش باس دەکات کە لێی دەکەوێتەوە و دەبێتە مایەی کەرت بوونێکی سیاسی و فیکری، کەرتبوونێکی واش هەڕەشە لە یەکێتی کۆمەلگا دەکات و پێکهاتەی کۆمەلایەتی گەلی میسری لەبەر یەک هەل دەوەشێنێت.

نوێنەرانی گروهی یەکەم -ئیسلامیەکان- نوسەرانی لەوێنەی ( محمد عمارە و فەهمی هوەیدی و محەمەد غەزالیین )، وەچەند بلند گۆیەکی حیزبیش گوزارشتی لێوە دەکەن لەوانە: ( ئیخوان مسلمون ) و ( پارتی کاری ئیسلامی ).

بەلام دەستەی دووەم ژمارەیان زۆرە، دیارترینیان: ( فؤاد زەکەریا و سەید یاسین ). میانڕەوەکانیش کەدەکەونە نێوان ئەو دوو جەمسەرەوە ( عبد المنعم سەعید ) لە سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیژی ڕۆژنامەی ( ئەهرام ) زمانحالیانە.

پێویستە ئەوە بلێین کە نوێنەرانی ئەو سێ بالەی ئاماژەمان پێ دان، ژمارەیان زۆر لەوە زیاترە وەک لەوەی لێرەدا ناومان هێناون، بەلام ئێمە بەو چەند ناوە دەوەستینەوە، لەبەر ئەوەی ئەوانەی ناومان هێنان ئەوانەن کە لەو دیاردەی جەمسەگیریەیان پێچاودتەوەو تاوتۆیان کردووە، هەریەکەو لە دیدو بۆچوونی فیکری تایبەتی خۆیەوە.

ئەوەشی ئێمە لێرەدا بەخستنەڕوو و شیکاریەوە باسی لێوە دەکەین پەیوەندی بەبەلگەو بەهانەی هیچ یەک لەو سێ گروهەوە نی یە، چونکە دیاردەکە لەوە ڕوون و

ئاشكرا تره تا پێویستی بەبەڵگه یاخود سەلماندن هەبێت. بەڵكو ئەم دیاردەیه سنووری ئەوەی بەزاندووه كه بەتەنها دیاردەیەكی فیكری ڕۆشنبیری بێت، وه له لێوارەكانی (شەڕێكی ناوخۆیی) نزیك بۆتەوه له نێوان ئەو دوو گروهه ناكۆكەدا، وه دەستەواژەی (شەڕی ناوخۆ)هی من نییه. بەڵكو چەمكێكه (فەهمی هوەیدی) نووسەر له ڕۆژنامەی (ئەهرام)ی (٢٣-٣-١٩٩٣)دا بەكاری هێناوه، سەبارەت به تاوتوێكردنی مەسەلەی بانگەشه كردن بۆ (بەرەیەكی نیشتمانی)، لەوێدا مەترسی خۆشی لەوەدەربڕی كه بانگەوازێكی وا ببێته ئامادەكارییەك بۆ دامەزراندنی هاوپەیمانیەتێكی عەلمانی بۆ لەڕوودا وەستانەوەی تەوژمی ئیسلامی له ساتەوەختی ئێستادا، بەبڕوای ئەو ئەمەش دەبێته (هەنگاوێك ڕووەو خۆش كردنی زەمینه بۆ شەڕی ناوخۆیی نێوان عەلمانی و ئیسلامیەكان، كه هەڕەشەی دابەشبوون له كۆمەڵگا دەكات). هەروەها بۆ زیاتر بەرفراوانكردنی تێگەی (شەڕی ناوخۆیی) پێشنیاری تر هەبوو كه (هوەیدی)پێشكەشی كرد بۆ دروست كردنی چەند ناوچەیەكی فیكری ئارام تا له توێژینەوەو لێكۆڵینەوه به دوور بێت. بۆ ئەم پێشنیارەش (عبد المنعم سەعید) له (ئەهرام) ڕەزامەندی خۆی ڕاگەیاند. له ڕاستی دا (شەڕێك) هەیه بەمانا ڕاستەقینەكەی نەك بەشێوەیەكی مەجازی، شەڕێك ئیسلام گەراكان به چەك و تفاقی (تەكفیر) و وەسف كردنی نەیارەكانیان به هەڵگەڕاوه له ئایین و (عەلمانیەت) - كه هاوتای چەمكی ئیلحادیان كردووه- ئەنجامی دەدەن و، تۆ به هەر ئیجتیهادێكیش دەوەستنەوه كەلەگەڵ دیدو بۆچوونەكانیان دا نەگونجێت. وەلەپاش تاوانباركردنی به تۆمەتی كافری و لقەكانی تری سەرەی گولله تەقاندن دێت لەلایەن باڵی سەربازی ڕەوته ئیسلامیەكانەوه. لێرەشدا ناتوانین وا بەئاسایی لەمەڕ (میانڕەویی) و (توندڕەوی) بدوێین، چونكه له سەرجەم شەرەكاندا (ڕاگەیاند)لەوەی بڵاوی دەكاتەوه ئایدۆلۆژیای كۆكردنەوەو جۆشدانی گیانی سەربازی- له كردەوەسەربازیەكانی نێو گۆڕەپانی شەڕەكان جیا نابێتەوه. لێرەدا داواكردن به دابینكردنی ناوچەی فیكری ئارام، لەڕاستی دا بۆخۆی دەبێته، بانگهێشتێك بۆ ئافەرۆزكردنی هەر جۆره بیركردنەوەو توێژینەوه و گفتوگۆیەك، لەبەر ئەوەی ئەوانەی لێرەدا ئەو جۆره بانگەوازه دەكەن ئەوانەن كه لەڕووی سەربازیەوه تەرازوی هێز له بەرژەوەندیان دایه. نەیارانی ئیسلامیەكان له لیبرالی و ڕۆشنەگران- به هەموو باڵه جیاجیا و دەستەو تاقمەكانیانەوه- هیچ باڵێكی سەربازی هاوشێوەی باڵی سەربازی ئیسلامیەكان نییه. لەبەر ئەوه زۆر جار ئیسلامیەكان هەوڵی ئەوه دەدەن تا باڵی سەربازی دەسەڵاتی سیاسی فەرمانڕەوا- دەزگاكانی ئاسایش- لەبەرامبەر باڵی سەربازی ئیسلامیەكان دابنێن. ئەوەشی زیاتر پشتگیری ئەم بۆچوونەی ئیسلامیەكان دەكات و - هەندێك مەشروعیەتی دەداتێ- نمونەی ئەو ڕۆشنبیره لیبرالیه ڕۆشنەگەرەیه كه

هەمیشە پاساو بۆ فیکری دەسەڵات دێنێتەوە، بەردەوام داکۆکی لە هەڵوێستە سیاسی و فیکریەکانی دەکات.

بەڵام ئەم شیرۆڤەکردنە لەلایەن ئیسلامیەکانەوە، هەر بۆ ئەوەیە تا ئەو دۆخە گرژی و ئاڵۆزیەی پێ بپارێزن کەڕێگا لە بەردەم شەڕێکی ناوخۆیی دا خۆش دەکات، ئەو شەڕەی لە ڕووی سەربازی یەوە جڵەوی بەڕێوەبردنی بەدەست ئیسلامیەکانەوەیە. بۆیەقسەکردن لەمەڕ (ناوچە فیکریە ئارامەکان) تەولو هاوشێوەی داواکاری ئیسرائیلی لێ دێت سەبارەت بە سنووری ئارام، ئەمە لەکاتێکدا ئیسرائیل خۆی لەڕووی سەربازیەوە باڵا دەستە‌و، خۆیشی هۆکاری سەرەکی شەڕ و مەترسی یە.

ئەگەر (شەڕ) حاڵەتێکی دیارو لەبەرچاوبێت و قوربانی خۆی هەبێت، ئەو قوربانیانەی خوێنیان ڕژاو لاشەکانیان بە چەکی ئیسلامی لە شەقامەکانی میسردا لەت و پەتکرا، وەک چۆن خوێنی قوربانیەکانی تر ڕژاو لاشەکانیان لەنێو زیندانەکان و بنکەکانی پۆلیس و لە شەقام و ڕێگاکان دا فڕێ دران، ئەو قوربانیانەی کە لایەنگری گروهە ئیسلامیەکانن. یاخود دەزگاکانی ئاسایش، دەیاندانە پاڵی گروهە تیرۆرستە ئاینیەکان. گەر کارەکە بەم جۆرە بێت. ئایا ئەم شەڕە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە لەنێوان (ئیسلامیەکان) و (عەلمانیەکان) دا ڕوودەدات، وەک ئەوەی گوتاری ئیسلامیەکان هەوڵی سەلماندن و دووپاتکردنەوەی دەدات؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە لێرەدا دەیخەینە ڕوو.

لەو ناونیشانەوەی کە بۆ ئەم ووتارەمان هەڵبژاردووە، بە ئاشکرا دیارە، کە وەڵاممان بۆ ئەم پرسیارە پێچەوانەی بۆچوونی ئیسلامیەکانە.

ململانێکە لە ناوەڕۆکدا لەسەر خاکی ئیسلام ڕوودەدات نەک لەدەرەوەی سنوورەکانی دا، لەنێوان ئەوانەدایە کە داوای (ئیسلامێکی هارچەرخ) دەکەن لەگەڵ ئەوانەی دەیانەوێت بە (ئیسلامیکردنی سەردەم) پیادە بکەن. ئەمەش کرۆکی ئەو باسەیە کە (فۆاد زەکەریا) لە ڕۆژنامەی (ئەهرام) دا نووسیویەتی لە وەڵامێکی دا بۆ ئاقاری (ناوەند)ی میانڕەو، کە (عبد المنعم سەعید) لە زمانیانەوە دوابوو.

ئەوانەی باس لە چەمکی (ناوەند) ی میانڕەو دەکەن، لەبنەمادا لەو وتەزایەی ئیسلامیەکانەوە دەست پێ دەکەن دەڵێت: ئەو ململانێیەی هەنووکە لەئارادایە ململانێ یەکە لەنێوان (عەلمانیەت) و (ئیسلام) دا. ئەمەش لە بنەڕەتەوە تێزێکی هەڵەیەو، لەو شەڕەیدا کەئاماژەمان پێ دا بەشێوەیەکی ئایدۆلۆژی پڕوپاگەندەیی بەگەڕدەخرێ و بە کاردەهێنرێت.

(عەلمانیەت) زاراوەیەکە سەرجەم بیریارە میسریەکان-تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت- خۆیان لە بەکارهێنانی لادەدەن و، هەمووان لە تێرمەکانی لەوێنەی (ڕۆشنەگەری) و (لیبرالیزم) و (بەرگری لە کۆمەڵگای مەدەنی)، و ... هتد، بەکار

دینن. وەناشێت هزر بە ئاقارێکەوە گرێ بدرێت کە ڕاستەوخۆ بانگی بۆ نەدات، تەنها بە شیکردنەوی ئەو گوتار فیکریە نەبێت بە شێوەیەکی قوڵ و بەرفراوان، بە جۆرێک کە پەردە لە ڕووی ئاستی (شاردراوەیی) و (نادیاری) و (باس لێنەکراو) هەڵبماڵێت. ئەمەش شیکارکردنێکە کە تائێستا لەلایەن هیچ یەک لە ئیسلامیەکانەوە ئەنجام نەدراوە تایبەت بە بیری نەیارەکانیان. (محەمەد عەمارە) بێ پەروا هەوڵی ئەوە دەدات تا وەسفی (عەلمانیەت) بە کتێبەکەی (ئیسلام و ئسوڵی حکومڕانی) (عەلی عبد الرەزاق) ەوە بلکێنێت، لە زنجیرە وتارێکیدا کە لە ڕۆژنامەی (الحتاه) ی لەندەنی دا بڵاوکرایەوەو، پاشان سەرلەنوێ لە ڕۆژنامەی (الشعب) ی قاهیریدا، کە زمانحاڵی پارتی کاری ئیسلامیە بڵاوکرایەوە. بەڵام ئەو میتۆدە شکاریەی کە (عەمارە) بەکاری هێنا هێندەی ئاشکرا کرد لەم کتێبەدا کە ئافەرۆزی ئەوە دەکات و ڕەتی ئەو مەسەلەیە دەکاتەوە بەوەی پێغەمبەر سەرۆکی دەوڵەت بووبێت بەمانا سیاسیەکەی.

وە داکۆکی کردنی (عەمارە) لە چەمکی (دەوڵەت) بەو جۆرەی کە پێغەمبەر لە مەدینەدا دایمەزراند، وا دەکات تێگەیشتنی (عەمارە) لە عەلمانیەت تێگەیشتنێکی شێواو و نادروست بێت، کە لەمەسەلەی (دەوڵەتی ئایینی) دا کورتدەکرێتەوە. وەئەم تێگەیشتنە- لەلایەکی دیکەوە- کرۆکی ناکۆکی نێوان ئیسلامیەکان و نەیارەکانیان بەدەر دەخات.

ئەمە کێشەیەک نیە دەربارەی (ئیسلام) وەک چۆن (عەلمانیەت) لە گۆڕانە مێژوویەکەی خۆی دا دژ بە مەسیحیەت نەبووە، بەڵکو بریتی یە لە کێشەیەک لەمەڕ تێگەیشتن لە ئیسلام و ، سەبارەت بە پەیوەندی ئایین بە دەوڵەتەوە. وەک چۆن (عەلمانیەت) لە ساتە وەختی دروستبوونی دا، بزافێکی فیکری بوو دژ بە لێکدانەوە کلێسایە ئەرسۆدەکسیە کلۆمدراوەکان بۆ مەسیحیەت، وەدژ بە دەست بەسەرا داگرتن و هەیمەنەتی ئەو بۆچوونە بوو بەسەر کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵگا دا.

ڕەتکردنەوەی پەیوەندی مێژوویی لە نێوان (ئیسلام) و (دەوڵەت) دا مەسەلەیەکی فیکری یە نەک مەسەلەیەکی ئایینی. وەرێکەوتێکی مێژوویی وای کرد، کە بۆ ماوەیەکی کورت، سەرکردایەتی ڕوحی و سیاسی لەکەسی پێغەمبەردا کۆ ببێتەوە، پاش ئەوە (قورەیش) (هەیمەنەتی) خۆی بەسەر عەرەب دا سەپاندەوە، ئەویش بە بیانوی ئەوەی پێغەمبەر لە خۆیانە، سەرەڕای ئەوەی پێغەمبەران- بەپێی ڕیوایەتێک کە دراوەتە پاڵ خودی پێغەمبەر خۆی- (میراتیان لەپاش خۆیان نیەو) کەس نابێتە میراتگریان.

سستمی حوکمڕانی لەدەوڵەتدا بەپشت بەستن بە یەکێک لەم دوو میکانیزمە بەردەوام بوو: بەلەجیاتی دانان و، بەیعەت وەرگرتن بۆ ئەو کەسەی خەلیفە لەساتەودختی دەسەڵاتیدا دەست نیشانی دەکات. وەئەم دوو پرۆسەیەش بەپێی

ڕوانگەی میراتی و بۆماوەوە ئەنجام دەدران، بێجگە لە چەند حاڵەتێکی دەگمەن کەلەبەرچاو ناگیرێت. ئەمەش بریتی یە لەمێژووی ئیسلامی: فەرمانڕەوایەتیەکی بۆماوەی ئۆتۆکراتی نەک تیۆکراتی. وەبەکاربردنی دەسەڵاتی ئەهلی فیقەو فتوکانیان لەلایەن فەرمانڕەواکانیانەوە، بۆ توند کردنی پایەکانی دەسەڵاتیان، مانای (ئیسلامیەتی) سستمی حکومڕانی ناگەیەنێت.

کاتێک (عەمارە) لەم گۆشە نیگایەوە شکست دێنێت لەوەی تۆمەتی (عەلمانیەت) بە کتێبەکەی (عەلی عبد الرەزاق) ەوە بلکێنێت، پەنا دەباتە بەر شێواندنێکی سوکو بێ مانا لە هەوڵێکیدا بۆ سەلماندنی ئەوەی کە نووسەری کتێبەکە (عەلی عبد الرەزاق) نی یە، وەپاش هەرزە گوییەکی وشکو برنگ- کە خۆی ناوی دەنێت شیکاریەکی شێواز گەرانە- دەگاتە ئەوەی بڵێت (طەحسین) لە نووسینی ئەم کتێبەی دا هاریکاری کردووە و بەشداربووە لەگەڵی دا.بەڵام بەر لەوەش هەندێ ئەگەری کرچ وکاڵ دەخاتە ڕوو. کە ڕەنگە ئەو کتێبە لەدانانی یەکێک لە خۆرهەڵاتناسەکان بێت.

سەرجەم ئەمانەش ئەوە ئاشکرا دەکات کە کۆی مەسەلەکە لەوەدایە (عەمارە) لە مەراقی لەکەدارکردنی ئەو کتێبە و نووسەرەکەی دایە، سەرەڕای ئەوەی (عەمارە) لە شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان لەوانەبوو کە زۆر بە گەرمی بەپیری ئەم کتێبەوەو بڵاوکردنەوەیە وەچوو، بگرە چەند جارێکیش هەستا بە چاپکردنەوەی و پێشەکی بۆ نووسی لە چەند چاپێکی جیاجیا لە میسرو بەیروتدا.

وە (عەمارە) بەهیچ شێوەیەک -تەنانەت لەسەراتاکانیشی- دا بیرمەندێکی عەلمانی نەبووە، بەڵکو ئیسلامیەکی منەوەر بووە، کە دواتر ئەو منەوەریەشی لێ بەربووە وەلەڕۆژگاری کەوتنی هەموو ماسکەکان دا.

گەر (عەلی عبد الرەزاق) وەک بیر مەندێک، کاری فیکری خۆی لە چوارچێوەی ئەوەی بە هزری ئیسلامی ناو دەبرێت ئەنجام دابێت. ئەو هزرەی لەسەر فرەیی و جیاوازی بیرو بۆچونەکان دامەزراوە، ئەوا (طه حسین و زەکی نەجیب مەحمود) هەروەها (فؤاد زەکەریا و مەحمود ئەمین عالم و ڕاوێژکار عەشماوی و خەلیل عەبد ولکەریم و نەسر ئەبوزەید) یش بە هەمان شێوە. ئەمەش بەرەو ئەوەمان دەبات تا جیاکاری لە نێوان دوو ئاراستەدا بکەین: ئەویش جیاوازیە لەنێوان هەوڵدان بۆ تێگەیشتنێکی سەردەمانەی ئازادی ڕۆشنەگر بۆ ئیسلام و، تێگەیشتنی ئەرسۆدەکسیانەی بەرتەسک.

ئەمەش جیاوازیە لەنێوان ئەوانەی ئیسلام وەک پرۆسەیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتی سەیر دەکەن، کە بەردەوام بووە و تا هەنووکەش بەردەوامە، بەهۆی کرانەوەو واڵابوونی ئامـاژە و واتـای ئێکستە بنچینەییەکان و ئەو ناوەڕۆکومانایانەی لەخۆی دەگرێت. وەلەنێوان ئەوانەدا کە پێیان وایە ئیسلام بریتیە لەو واقیعە مێژووییەی سەرەتای

هاتنەخوارەوەی وەحی، وەوای بۆ دەچن کە گۆڕنکاریەکانی و ئارابوونیشی چ نییە جگە لە سەرلێشێوان و گومراهی و چاو بەست نەبێت، پێویستە لێیان قورتار بکرێت و کۆتاییان پێ بێت. وەئەگەر ئەمە هەڵوێستی دوایی (توندڕەوەکان) بێت لە شوێن کەوتووانی تێودری (سەید قطب و ئەبو ئەعلای مەودودی)، کە هەردوکیان پێکەوە سەرجەم مێژووی مرۆڤایەتیان، بێجگە لە قۆناغەکانی سەرەتای مێژووی ئیسلام، بە نەفامی و گومرای تاوانبار کردووە. ئەوا (میانڕەو) ئیسلامیەکان درێژە بە مێژووی ڕاستەقینەی دەوڵەتی ئیسلامی دەدەن. تا ئەو ساڵەی کە (کەمال ئەتاتورک) کۆتایی بە خەلافەتی ئیسلامی هێنا لەم سەدەی بیستەمەدا. بەلام هەمووان، لە توندڕەو و میانڕەوەکان، کۆک و تەبان لەسەر ئەوەی کە ئیسلام مانایەکی جێگیرو بێ کەم و کوڕی هەیەو. ئەمەش ئەهلی فیقە وتە بێژە موسڵمانەکان بەر لەسەردەمی داوەشان دایان ڕشتووە، واتا لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا. لێرەدا ئەوان دڵڕشتنی واتای ئیسلامی زۆر لە ئاقارەفەلسەفی و سیاسی و کەلامیەکان هەڵدەبوێرن.

ئەم ململانێ یە لە بواری جیاجیا دا بەدەردەکەوێت و خۆی ئاشکرا دەکات. شکۆ بەخشین بە مێژوو و لێکدانەوەی بە میتودێکی کەرنەڤالی و ڕێزێکی زۆرەوە. ئەمیش لە بەرامبەر میتودی شیکاری و شیرۆڤەکاری و ڕەخنەدا. میتۆدی کەرنەڤالی و شکۆ پێ بەخشین لە ڕوانگەی تۆمارکاری ڕەسمیەوە مامەڵە لەتەک مێژووی ئیسلامیدا دەکات و. خەریکە ئەو ململانێ و شەڕانە پشت گوێ دەخات کەبۆ نمونە لە نێوان ئەسحابەکان دا ڕووی داوە، لە نێوان سستەمی دەوڵەت و نەیارەکانی، بەوەندەوەد دەوەستێت کە بڵێت ئەمانە کێشەو ناکۆکی موجتەهیدە دڵسۆزەکانە و کاری بڕیاری دان بەسەریاندا بۆ خوای تەبارەک و تەعالا جێهێڵراوە. بەلام سەحابیەکان هەموویان بەرزو بەڕێزن و بۆ هیچ کەس نییە لێیان کەوێت یاخود ڕەخنە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانیان بگرێت، لەبەر ئەوەی ئەوان (پیاوچاکی هەموو ڕۆژگارێکن) وەلەبەر ئەوەی ئەوان (وەک ئەستێرە وەهان بەکامیان ڕێنوێنیان کرد ئەوا لەسەر ڕێگای ڕاستن) وەلەبەر ئەوی قورئان بە سیفاتی چاکە باسی کردوون.

بگرە ئەزهەرو پیاوانی ئەزهەر بەوە سەرشێت دەبن گەر یەکێک لە خۆی ڕابینێ و. یان قسەی لە ئەگەری دەرکەوتنی هونەرمەندێک کرد لە کارێکی درامایی و شانۆیی یان تەلەفزیۆنی‌دا تا کاراکتەری سەحابیەک بکات و دەوری ئەسحابەیەک ببینێ (لێرەدا مەبەستی نووسەر یارانی پێغەمبەرە). ئەم ڕێگە نەدانە تەنانەت لە پەسەند کردنی بیرۆکەی (نواندن) بە شێوەیەکی ڕەمزی هی یەکێک لەو کەسایەتیانە، دووپاتی چەمکی (پیرۆزی) دەکاتەوە، ئەو چەمکەی زاناکانی ئەزهەر و ئیسلامیەکان ڕەتی دەکەنەوە. کاتێک یەکێک بەوە ڕووبەڕوویان ببێتەوە کە ئەوان مرۆڤ پیرۆز دەکەن.

دووەمین دیاردەی ئەم ململانێ یە لەبەپیرۆز ڕاگرتنی ئیمامەکاندا بە دیار دەکەوێت. وە بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە ئیجتیهادەکانی ئەمانە تەواو بێ کەم و کوڕی یەو، بەرپەرچ دانەوەی هەر هەوڵێک بۆ لێکدانەوەی ئەم ئیجتیهادانە بەو پێیەی ئیجتیهاداتی نادەمیزادە. گوزارشت لە هەڵوێستگرتنێکی فیکری کۆمەڵایەتی دەکات کە سەرچاوە لە بەرژەوەندی و بۆچوونە ئایدیۆلۆژیەکانەوە وەردەگرێ].

دیاردەی سێ یەم، کە ئەمەیان لە یەک کات دا مەترسیدارتر و تازەشە بریتی یەلە (بە ئیسلامی کردنی مەعریفە)، ئەمەش ئەو دیاردەیەیە کە پەردە لە ڕووی جەوهەری تێزی (ئیسلامیانە) هەڵدەماڵێ و بریتی یە لە سڕینەوەی سەردەم و مێژوو و زانست و زانین. بە بیانوی ئەوەوەی کە هەموو ئەمانە بە شێوەی نادیار و شاراوە خۆیان لە هەناوی تێکستە سەرەکیەکان حەشارداوە.

ئەم دیاردەیەی دواییان بۆ خۆی چەمکی (پێشکەوتن) لە گوتاری ئیسلامیدا بەدەر دەخات، کە گێڕانەوەی بزوتنەوەکەیە بەرەو دواوەو، هەستانە بە خوێندنەوەیەکی پێشینەکاری بۆ تێکستەکان، واتا خوێندنەوەیەک کە پێ دەچێت مۆدێرنانە بێت. بەڵام لە ڕاستی دا سەرجەم واقع و (سەردەم)یش گیرۆدەی کۆت و بەندی ڕابردوو دەکات.

لێرەوە گرنگی بەهای ڕەمزی پەچەو ڕیش هێشتنەوەو پۆشتەیی و دروست کردنی مزگەوت و، شریتی کاسێت و ڤیدیۆ و، شێخی سەر ڕووت و .. ئەو شێخەی جل و بەرگی ڕۆژئاوایی لەبەر دەکات و، بە ئۆتۆمبیلی (بۆدرە) هاتووچۆدەکات، ئۆتۆمبیلێک تەنها ئەو کەسانە دەتوانن ببنە خاوەنی کە بازرگانی بە ژەهرە سپیەکانەوە دەکەن بەدەردەکەوێت. هەموو ئەمە لە ئێستا و ئەم سەردەمەدا بووەتە (ئیسلامی).

ئەم تێخوێندنەوەیە بەگشت ئەوانەی چواردەوریان داوە لە سەر لەنوێ هێماکردنەوەی نیشانەو ئاماژەکان، لە ڕاستیدا مەبەستیەتی دەست بەسەر بار دۆخی ئێستادا بگرێت لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فیکریەوە. وەلەبەر ئەوەی بەرخودانی فیکری تاکە ڕێگەیەکە لەبەر دەم هەوڵێکی لەم جۆرەدا مابێتەوە، ئەویش سەنگەری ئێستاکێ و سەردەم و کەلەپووریشە. ئەوا شەڕێکی چەپەڵی لە دژ دەکرێت بە هەموو جۆرە چەکێک لە لەکەدارکردنەوە تا کوشتوبڕین. وەئەم بەرخودانە فیکریە بۆتە تەنها ڕێگرێک لەبەردەم (پرۆژەی ئیسلامی) دا. بۆ ڕووخاندنی سەرجەم بەربەستەکانی دی و لەسەر و هەمووشیانەوە دەوڵەت، کە جگە لە ئامرازی داپڵۆسین و سەرکوتکردن هیچ چەکێکی تری لەدەستدا نەماوەتەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی باروددۆخەکە. ئەمیش چەکێکە دەوڵەت دژ بە هەمووان بەکاری دەهێنێت و، هیچ کەسێکیش لە دەستی قورتار نابێت مەگەر تەنها ئەوانە نەبێت کە دەچنە نێو پرۆژەکەیەوە. وەلەبەر ئەوەی هەندێک لە ڕۆناکبیران چوونە نێو پرۆژەی دەوڵەتیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، لەو باوەڕەوەی کەپرۆژەیەکی دژ

بەکۆنەپەرستی و دواکەوتووییە، هەنگاوێکی وا ئەو بەهانەی دا بە ئیسلامیەکان تا سەرجەم بیر مەندان دزێو بکەن. ئەوەی یارمەتی ئیسلامیەکانی دا لەم رووەوە، دابەزینی ئاستی فیکری و، بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری و بێ ئاگای و هەژاری بوو. ئەمەو سەرەڕای ئەو گەندەڵیەی بووەتە خەسڵەتی دیارو ئاشکرای هەموو واقعی عەرەبی.

کەواتە لە بنەمادا، ئەو پڕۆژە (ئیسلامی)یە، پڕۆژەیەکی سیاسی یە. پڕۆژەیەکە پڕۆژەی دەوڵەت رەتدەکاتەوە نەک وەک پڕۆژەیەکی پێچەوانە، بەڵکو بەو پێ بەی پڕۆژەیەکە مەشروعیتی خۆی لە دەسەڵاتێکی پیرۆزەوە وەردەگرێت، لەبەرابەر پڕۆژەی دەوڵەت دا کە مەشروعیتی خۆی لەسەر کوتکردن و چەوساندنەوەو گەندەڵیەوە هەڵدەهێنجێت. کەواتە ئەمە کێشمەکێش و ململانێ مەشروعیەتە کە رەنگە وادیار بێت بەوەی ململانێی نێوان دوو پڕۆژەی جیاواز و جیا لەیەک بێت، بەڵام خوێندنەوەیەکی ووردی تیژەکان ئەوە ئاشکرا دەکات کە ململانێ ململانێیە لەسەر ئەو دەسەڵاتە سیاسیەی کەهەمان پڕۆژە جێبەجێ دەکات. وەدەستەی تیۆەری (ناوەند). لە راستی دا هەوڵی ئەوە دەدەن لە رێگای داخستنی کلاو رۆژنەی بەرخودانی فیکریەوە، چارەسەری ئیشکالیەتی ململانێی نێوان ئەو دوو دەسەڵاتە بکەن، ئەو کلاورۆژنەی بەی هەمووان ناوی (عەلمانیەت) ی لێ دەنێن. ئەویش لەبەر ئەوەی بە سادەیی ئەوە کلاورۆژنەی فیکرە کە بەرووی توتالیتاریەت بەهەموو شێوەکانیەوە دەوەستێتەوەو، وە دژ بەوەش دەوەستێتەوە کە هەنووکە هەڵ بخلیسکێتە نێو داوی رابردووەوە لەلایەک. وەوەستانەوە دژ بە پاشبەندی بوون بەشێوەیەکی رەها بۆ دوژمن لەلایەکی ترەوە. کەواتە فیکر بۆخۆی پڕۆژەی (رزگاری)یە ودبوەتە تەنها سەنگەری (بەرگری). ئەم پڕۆژەیە لە بنەمادا فیکری و، لەجەوهەردا مەعریفی و، وەلەدەلالەتەکانی و واتاو ناوەرۆکیشی دا سیاسیە. ئەمەش پڕۆژەیەکە ناکەوێتە دەردوەی ئیسلام، بەڵام لەدەرەوەی (عەلمانیەت)یشدا راناوەستێت ئەوعەلمانیەتەی زۆر لە نوێنەرەکانی حاشای لێ دەکەن.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بە ئاشکرا لەسەر زەمینەی فیکر کار بۆ یەکلایکردنەوەی مەسەلەکان بکەین. کاتی ئەوە هاتووە تا پێکەوە تاو توێی چەمکی عیلمانیەت و چەمکی ئیسلام بکەین. وەرەنگە ئەوە بدۆزینەوە کە ئیسلام ئاینێکی عیلمانی یە ئەگەر هاتوو بەباشی لێی تێگەیشتین و هەڵمانسەنگاند: هەڵسەنگاندنی تێکستەکان و مێژوو و واقع لە هەمان کاتدا.

سەرچاوە:

بروانە-د.نصر حامد أبو زيد: الاستقطاب الفكري بين (الاسلام العصري) و (اسلمة العصر) في مصر مجلة-الطريق-العدد-٣-أيار/مايو ١٩٩٤ص(٨-١٢).

# ئیجتهاد و داهێنان لە ڕۆشنبیری عەرەبی ئیسلامیدا

سمیر امین
و: جمال: ڕەشید

- ئیجتهاد و داهێنان دووچەمکن لە فەرهەنگی زمانی فەلسەفی و عەرەبیدا سیمای وورد و جیاوازی خۆیان هەیە.. ئیجتهاد تایبەتە بە بواری شەریعەتەوە، بەم پێیەش وەکو زانراوە قورئان و سوونەت بە یەکێک لە سەرچاوەکانی شەریعەت دادەنرێن. لەم چوار چێوەیەشدا ئیجتهاد پشت بە ڕادەی نێو لێکدانەوەی دەق دەبەستێت لەپێناو گونجاندنی لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵدا بەجۆرێکی شیاو، جێی بیرهێنانەوەیە کە بیرمەندە ئیسلامییەکان بەتەواوی مومارەسەی ئەم جۆرە ئیجتهادە بوێرانەیان کردووە لەسەر ئاستێکی بەرفراوان لەماوەی سەدەی یەکەمی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامیدا. لێرەشدا ئەو ئاینزایانەیان بەرهەم هێناوە کەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان موسلمانان لە نێوانیاندا دابەش بوون. بەلام دواتر دەرگای ئیجتهاد کردن داخرا، تا فیکر لە قوتابخانەی ئەو ئاینزا ناوبراوانەدا بووە بە ستەڵەک و پەراوێزی شیکردنەوەی ئازادیش بۆ شەریعەت بەرتەسک بووەوە. ئیتر لەباردا نەبوو لەسنووری ئەو ئاینزایانە بچنە دەر کە بڕیاریان لەسەر درابوو وە بەڕەسمی ناسرابوون.

بەلام داهێنان هەموو بوارەکانی تری مەعریفە دەگرێتەوە- واتا ئەو بوارانەی کە شەریعەت حوکمی ناکات، بەواتایەکی دی داهێنان بوارەکانی لێکۆڵینەوەی دیاردەکانی سروشت و مامەڵە کردن لەگەڵیدا دەگرێتەوە، وەبەبێ هیچ پابەندبوونێک بەتێکستە ئایینیەکانەوە داهێنان زانستە سروشتیەکان بەڕێوە دەبات، بەلانی کەم ئەمە لە ڕووی مەبدەئەوە. وەبیری ئیسلامی تەقلیدی ئەفراندن بە بوارێک لەبواری کامڵ بوون لەگەڵ سروشت و حەرامێک لەبواری زانستی شەریعەتدا دادەنێت. لەبەر ئەوەی داهێنان لەم بوارەی دواییاندا بەمانای ڕزگاربوون دەگەیەنێت ئەمەش هاوتای کوفرە، وەوشەی (بدعه )- کە زمانی ئایینی لەم ڕووەوە هێناویەتە ئارا- ئاماژە بۆ ئەم ناوەڕۆکە دەکات.

وەلەوانەیە هەندێک وامەزەندە بکەن کە ئیجتیهاد میتۆدێکی تایبەتی شارستانی ئیسلامیەو خەسلەتێکی ناوازەی ئەو شارستانیەتە بێت. ئەو بیرمەندە تەقلیدیانەی کە دەڵێن ئیسلام ئایین و دنیایە بەپێویست ڕووەو ئەو بەردەنجامە دەڕۆن بەوەی ئەو پەیوەندیانەی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبەن دەچنە سەر بازنەی حوکم و بڕیارە ئایینیەکان بەم جۆرەش ئازادی داهێنان سنووردار دەبێت بەسنووری بڕیارە ئایینیەکانەوە. وای بۆ

دەچم کە ئەم بۆچوونە بەربڵاوەی نێو کۆمەڵگا ئیسلامیەکان -لە رابردوو و ئێستاکێ- دا بۆچوونێکی نادرووست بێت، بەو واتایەی کە کۆمەڵگاکانی تر (غەیرە ئیسلامیەکانیش) مومارەسەی بیری هاوشێوەی ئیجتهادیان زانیووە، هەروەها دەستیشیان بە جیاکاری کردووە لە نێوان بواری پەیوەندیەکانی نێو کۆمەڵگا ئەو کۆمەڵگایەی پاپەندە بە بڕیارە ئاینیەکانەوە و بواری زانستە سروشتیەکان کە دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی ئەم بڕیارانەوە.

هەر بۆ نمونە پێم وایە کە شارستانیەتی ئەورووپی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاستیش باوەڕی وەها بووە کە مەسیحیەت ((ئاین و دنیایە)) تا بەتەواوەتی جیاکاری لەنێوان بواری ئەو پەیوەندیانەدا کرد کە فەرمایشی ئاینی حوکمی دەکات لەگەڵ بواری ئەو دیاردە سروشتیانەی لە چوارچێوەی ئەم حوکم و بڕیارانە بەدەرە.

خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم شارستانیەتە جیاوازانەدەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گشت کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری سیمایەکی جەوهەری هاوشێوەیان هەیە. کۆمەڵگایەکێ رونیەک لەبواری ژیانی مادی و ئابووری‌دا بەڕێوەی دەبات، بەناچاریش دەست بەسەرداگرتنی ئایدۆلۆژیایەکی ناوەڕۆک میتافیزیکی دەبێتە هاوشانی، مەبەستم لەم دەربڕینەی کۆتایش ئەوەیە کە تەوەرەی سەرەکی ئایدۆلۆژیای باو لەم کۆمەڵگایانەدا توێژینەوەیە بەدوای (راستی رەها)دا کە بەدەست نیشانکراوی پێناسەی بابەخدانی میتافیزیکایە. ئەم توێژینەوەیە شێوەی فەلسەفەیەکی پەتی وەردەگرێ کە نەبەستراود بە بیرو باوەڕێکی ئاینی دیاری کراوەوە یا لەوەی کەلە رێبازێکی ئاینی دیاری کراودا دەرکەوێت. وەکێشمەکێش لەوەدانیە کە کۆمەڵگا ئەورەپی‌یە مەسیحیەکان لەلایەکێ و کۆمەڵگا ئیسلامیەکان لەلایەکی ترەوە ئاینیان بە شێوازێک بۆ دەربڕین لە بابەخ پێدانە میتافیزیکی‌یە باوەکانیان وەرگرتود. وەلە دەست بەسەر داگرتنی میتافیزیکا لە بواری ئایدۆلۆژیادا ئەوە ریکخراوە کە بیری باو لەو کۆمەڵگایانەدا بە کۆمەڵی خاڵی هاوبەش جیا دەکرێتەوە لەوانە نەتوانینی هێنانە بەرهەمی زانستێک بۆناستی کۆمەڵایەتی. ئەمەش لەبەر ئەوەی روانگەی میتافیزیکی بۆ کۆمەڵ (وەلە سەردەتادا روانینی ئاینی بۆی) روانگەیەکی نەگۆڕ (ئێستاتیکی‌یە) دان بە دینامیکیەت و گەشەسەندنی سەپێنراوی بابەتیانە بەسەر کۆمەڵگادا نابێت. لەم بارو دۆخەدا بیری کۆمەڵایەتی لە سنووری هەڵسەنگاندنی رەوشتی تێناپەڕێت کە لە روانگەیەکی بەهایی رەوشتی‌یەوە دەروانێتە گۆڕانکاری‌یەکان (ئەوەی کە لە کۆمەڵدا روودەدات). بەواتایەکی تر پرسیار لەوە دەکات کە ئایا ئەم گۆڕانکاریانە لەگەڵ فەرمایشتی ئاین‌دا دەڕۆن یان بە پێچەوانەوەین. تا لێرەوە فکر پەنا دەباتە بەر رێبازێک کە پشت بە جیاکردنەوە لە نێوان ئیجتیاد و داهێنان دا ببەستێت. ئەگەر ئەو بڕیارەی کەبڕیارێکی موجتەهید پێ‌ی

دەگـات ئـەوە بێـت کـە گۆڕانکاریـیـە مەبەسـتەکان لـە ئـایین لانـادەن دەشـێت پاکانەکردنەکەی بگونجێت لەڕێگای نێو لێکدانەوەیـەکێ کەپشت بـە ئیجتیهـاد ببەسـتێت بەلام ئەو پەرەسەندنانەی کە ناچنە چوارچێوەی بەزەیی ئیجتهـادەوە ئەمانـە (بدعـە)ن وەکفرێکی ڕەهان (لەڕای بیریارەکانی ئەو چاخانـەدا) ئـەم بیرەش پرسـیار لـە هۆکـارە بابەتیەکان واتـە (دینامیکیـەتی کۆمـەڵ) ناکات کـە بـەرەو ئـەم (بدعـە) لاف بـۆ لێدرا وەرۆیشتووە. بەلام کاتێک سۆسیۆلۆژیا سەری هەڵدا کە پرسیاری نوێی لـەم چەشنە هاتە کایەوە. ئایا خوێنەری ئەم دێڕانە ئەوە نابینێت کە بیریارانی سەلەفی هاوچـەرخ لـە نیشتمانی عـەرەبی دا لـە چوارچێوەی ئـەو بڕیـارە بەهاییـەدا دەرنـاچن؟ لەوباوەڕەدام کەئەمەم لە نووسینانەکانی پێشوودا روونکردۆتەوە وەک (قـەیرانی کۆمـەڵگای عـەرەبی، دوای سەرمایەداری، نەتەوەی عەرەبی) وەلەم روەوە گەلێک پرسیارم پێشکەش کـردووە لەسـەر جێگیربوونی بـالا دەستی میتۆدی پێشوو لەسـەر زانسـت لـەبیری سـەلەفی هاوچەرخدا. بۆ نموونە ئـەوەم هێنایەوە یاد کە سـەلەفیەکان تـەبان لـەو بڕیـارەدا کـە خەلافەتی ئەمەوی پاشان عەباسی لەسەر بنەڕەتی (ناپاکی گەورە) دامـەزراوە (بـەپێی دەربڕینی ئەوان)، واتە دەرچوون لە بیرو بـاوەڕی ئیسـلامەتی ڕاسـت. بێ پرسـیارکردن لەوەی کەئەم دەست پێش خەریە لە هێزێکی بابەتیەوە بەسـەر کۆمـەڵگادا سـەپێنراوە. وەبەپێچەوانەی ئەم بڕیـارە بەهاییـە ڕەوشـتیـە ئامێژوییـەوە لافـی ئـەوەی لێدا کـە پێکهاتنی خەلافەت بەو شێوەیە کە پـێی جێبـەجێ بـوو وەهـەموو ئـەوەی ڕوویـدا لـەو پەرەسەندنانەدا کە پێویسـت بـوو بـۆ ئـەم (جێگیربوونـە)پێویسـتیـەکی مێـژووی بـوو. بەڵکو مەرجی سەرکەوتنی ئیسلام بوو لەو بلاوبوونەوەیەدا لەوناوچانـەدا کـە عەرەبـەکان فەتحیان کردبوو. ئەمەو، وەرەنگە هەندێ کەس بڕیـاردانم لـە نـەبوونی سۆسـیۆلۆژیا لـە چاخە کۆنەکاندا بە بڕیارێکی زیادە ڕوویانەو ناهەق ببیننەوە. ئایا هـەوڵ و تەقـەلاکانی (ابن خلدون) بـۆ تێگەیشـتنی هۆیـەکانی گەشـەکردن و هەڵوەشـاندنەوەی بنەماڵـەو دەوڵەتەکان تەقەلایەکی سیما زانستی نەبوو لە ناوەرۆکی ڕێبازەکەماندا؟ بەڵێ... لەسەر ئـەوەی کە مـن لافـی ئـەوە لێـدەدەم کـە ئـەم تەقـەلا دێرینانـە تـەنها سـیمایەکی کۆرپەلەییانەی هەیە، ئەو هەلاوێرنە دەنوێنێ کە بەر گیانی ئایدۆلۆژیای باو دەکەوێت کە میتافیزیکا دەستی بەسەردا گرتووە وەلەبەر ئەمە سەرم سـوڕنامێنێ لـەوەی کـە بڕیـارە سـەلەفیەکان ئـەم نووسـینانەیان نـەدەزانی و پـەیان بـەگرنگی نـەدەبرد یـا ئیدانـە یـا (پرۆتسـتۆیان) دەکـرد و بـە کفـر و (بدعـە) لەکـەداریان دەکـرد. لـەو نووسـینانەی لەسـەرەوە نـاوم هێنـاون ئامـاژەم بـەو دلوە کـە بۆنموونـە (سـید قطـب) پێشـەوای سـەلەفیەتی نـوێ بـەم بڕیـارە حوکمی بەسـەر (ابـن خلـدون) دا داوە! سـاتە وەختـی ڕێنیسـانسی ئەورووپی لـە چـەرخی شـازدە و حـەڤدەدا گوێزانەوەیـەکی چۆنێتی دەنوانـد

بەرەو رزگاربوون لەدەست بەسەراگرتنی میتافیزیکدا رۆیشت، وەبەرەو تێپەڕاندن لە سنوورەکانی هەنگاوی نا ڕێنیسانس پێشینەیی بایەخدان بە حەقیقەتە ڕێژەیی و بەشیەکانی ڕاگەیاند لەسەر بایەخدان بە حەقیقەتی ڕەها، وەئەم شۆڕشە بوو لەبیردا کە کۆتایی هێنا بەسەرداریتی میتافیزیکا چ لە دەربڕینە ئایینیەکەیدابێ یا لە شێوەی فەلسەفەیەیە نا پەیوەستەکەی بە بیرو باوەڕی پیرۆز دابێت. ئێمە ئێستا لە زانیاریەکی بێگومانایین بەوەی کە ئەم شۆڕشە هاوەڵێتی شۆڕشێکی تری کرد کە لەبواری هێزی بەرهەمهێنان‌داو پەیوەندی بەرهەمهێناندا جێبەجێ بوو، ئەوەش ئەو شۆڕشەیە کە لەسەر هەڵدانی سەرمایەداریدا وەک ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری باو دەرکەوت. شۆڕش کردن لەبواری هێزی بەرهەمهێناندا گەیشتە پلەی گۆڕانێکی چۆنێتی کە پەرەسەندنێکی وەهای کردووە کە ڕێگە خۆشکەر بۆ کۆتایی هێنان بە سەرداریتی کشتوکاڵ لە ژیانی ماددی مرۆڤدا. بەم شێوەیە ئەمڕۆ ئەوە دەزانین کە ئەو گوێزانەوە چۆنێتیە لە پێشکەوتنی هێزی بەرهەمهێناندا شۆڕشێکی سەراپا لە پەیوەندی بەرهەمهێناندا هاوەڵێتی کرد. بەواتایەک ڕەگەزە پێکهاتووە جیاوازەکانی سەرمایەداری (موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان، کاری کرێ گرتە، چاککردنی ئاڵوگۆڕی شمەک..هتد ) کە هەندێ جار بەشێوەیەکی پەرش و بڵاو لەچەند چاخێکی دوور لە ئەوروپا و بەتایبەتی لە شارستانێتیەکانی تردا (لەوانەش ناوچەی عەرەبی ئیسلامیمان ) یەکانگیر بووە هەتاوەکو بووە بە شێوەیەکی نوێ لە بەرهەمهێنان دا کە ئەویش شێوازی سەرمایەداریە کە لەسەر هەموو ڕووەکانی چالاکی کۆمەڵایەتی سوود دەگەیەنێ. شۆڕشە فکریو ڕۆشنبیریەکانی ڕێنیسانس جیاکاری لەنێوان ئیجتهاد و داهێنان‌دا ڕەت نەکردەوە، بەڵکو بەردەوامێتی چالاکی ئیجتهادی ڕەت نەکردەوە بەو واتایەی دیاریمان کرد لەسەر ئەوەی کە ئەم شۆڕشە بواری بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی بەرێبازێکی داهێنەرانە کردەوە. شۆڕشەکە بەشێوەیەکی عەمەلی ئەو کۆسپانەی ڕەت کردەوە کە بۆتە هۆی سەرهەڵنەدانی سۆسیۆلۆژیا، وەدەرگای پرسیاری لەسەر سروشتی میکانیزمە بابەتیەکان کردەوە کەدەبنە هۆی ڕودانی کۆمەڵایەتی. نامەوێ لێرەدا لەمە زیاتر بڵێم. مەبەستم ئەوەیە کە ئەم قسانە واتای ئەوە نییە کە ئەو سۆسیۆلۆژیایەی ڕۆژئاوا بەرهەمی هێناوە لەکاتی ڕێنسانسەکەیەوە (ڕاستییەکی کۆتاییە )، کاتێ کە کارو باری ئەم زانستە نوێیە لە کارو باری زانستەکانی ترجیاوازنیە لەبواری نیاردە سروشتییەکاندا. ئەمەش یەکێکی ترە بۆ یاساکانی توێژینەوەی زانستی ملکەچە کە ڕەشو سپی لێک جیا ناکاتەوە. بەڵکو لەمە زیاتر دەڵێم، لافی ئەوە لێدەدەم کە ئەو زانستە کۆمەڵایەتیانەی لەم بارو دۆخەدا دەرکەوتوون ئەمانیش یاسایەکی ڕێژەییی ودبەرهاتوو لە سنوورە مێژووییەکان بەرۆوەی دەبەن کە دەست نیشانی سیمای

پرسیاره پێشنیارکراوەکان و ناوەڕۆکی ڕێبازێکی پەیڕەوکراو دەکەن... هتد. بە شێوەیەک کە ناتوانرێت جیاکردنەوە لەنێوان ئەم دەستکەوتەی پێشکەوتنی سۆسیۆلۆژیاو ئەو ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژیەی کە ئەوزانستە دەیگوێزێتەوە بکرێت. لەبەر ئەوە وای مەزەندە دەکەم کە باری زانستە کۆمەڵایەتیەکان جیاواز دەبێت لەباری زانستە سروشتیەکان لە دوایشدا ئەو دیدە باوە قبوولٚ ناکەم کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕێبازێکی زانستی (یەکە)، وەلەدوایش دا (جیگیربوونی) تیۆەرە کۆمەڵایەتیە بەتاڵەکان لە ناوەڕۆکی ئایدۆلۆژی شیاوبێت، هەروەک چۆن لەبواری زانستی سروشتیدا وایە. ناگەڕێمەوە بۆ ئەو بابەتەی کە لە شوێنیتردا باسی چارەسەرکردنیم کردووە. تەنها شتێک لەم بارەدا دەیهێنمەوە یاد ئەوەیە کە تێگەیشتنم بۆ ناوەرۆکی مارکسیزم ئەوەی سەلماندووە و ئەو ناوەڕۆکە ئایدۆلۆژیەی ڕونکردۆتەوە کەبڕیار بەسەر سۆسیۆلۆژیای بۆرجوازی و هۆیەکانی سەردلرێتی ڕەهەندە ئابووری تیایدا دەدات. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە مارکسیزم بە ڕۆڵی خۆی لە سنووری مێژوویی ڕزگاری بووبێت. تا بووبێ بە (ڕاستییەکی کۆتاییانەی ڕەها)(بەڵکو هەوڵم داوە کە ئەم سنوورە مێژووییانە بیشکێنمو (بۆنموونە) بەردەوامی سەنتەریەتی ئەوروپی لە زۆربەی ڕەوتە مارکسیەکاندا دەربخەم. هەموو ئەوەی مەبەستە لێرەدا بڵێم ئەوەیە کە پرنسیبی نوێ کە ڕێنیسانس بانگەشەی لێکرد پرنسیبی ڕەتکردنەوی ڕەهاو بەخشینی ئازادیە بۆ فکر بەبێ پەیوەندی پەرستگا. یا بە واتایەکی تر ڕێنیسانس سەردلرێتی ڕێزگرتنی پیرۆزکراوی ڕەتکردەوە و بانگەشەی نێو لێکدانەوەی دەقی کرد بەنێو لێکدانەوەیەکی مێژووییانە. بەم شێوەیە بواری لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا کرایەوە بۆ بڕیاری داهێنان.

ئایا لێرەدا خوێنەر هیچ ناکۆکیەک دەبینێتەوە لەنێوان ئەم وتەیەی کۆتایی و وتەی پێشووترم دا سەبارەت بەوەی کە ڕێنیسانسی ئەوروپی ئیجتهادی ڕەت نەکردۆتەوە؟ نەخێر!

لەبەر ئەوەی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بیرو باوەڕی میتافیزیکیەت (جا ئەگەر سیمایەکی ئایینی هەبێت یا شێوەیەکی نا ئایینی) بیرو باوەڕێکی دوو ڕەهەندە، یەکێکیان نا مێژووییەو ئەوەی دی مێژووییە. مەبەستیش ئەوەی کە پرسیارکردنی میتافیزیکی پرسیارکردنێکە ڕەنگە پشت بە ناوەڕۆکی سیمای مرۆڤ و نیگەرانیان ببەستێت لە بەرامبەر نا دیاریەکانی دواڕۆژدا، بەشێوەیەک ئەم ڕەهەندە سیما دەروونیە بێگومان لە ئەو قۆناغانەی گەشەسەندنی سیستمی کۆمەڵایەتی تێدەپەڕێنێ کە مرۆڤ تیایدا دەژی. بەڵام ڕەهەندی دووەمی مێژوویی لەوەوە وەبەرهاتووە کەهەروەها ئایینیش دیاردەیەکی مێژووییە، لێرەدا دەڵێم هەروەها وە ناڵێم بەتەنها، ئایینیش وەک دیاردەیەکی مێژوویی تایبەتە بە گەلانی دیاری کراوەوە لەچاخی دیاریکراودا. لەم

گەزشەیەوە نەبێت جیاوازی لەنێوان ئایین وەک بیر و باوەڕ و ئایین وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی مێژوویی دابنێین پێم وایە کە عیلمانیەتیش پشت بەم جیاکردنەوەیە دەبەستێ، ئەمەش هاوتای ڕەتکردنەوەی ئایین نیە. ئایین وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ملکەچی یاساکانی پەرەسەندن دەبێ. ئەوانەی کە دەشێ نهێنیەکانی لە ڕێگای توێژینەوەی زانستییەوە بدۆزرێتەوە. لێرەدا سەرنجم بۆەوە ڕێک هێنا کە ئەم توێژینەوەیە تەواو لە توێژینەوەی لاهوتی جیایە، توێژینەوەی زانستی لە بواری ئاییندا وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی نادات بە نەگۆڕی بیرو باوەڕەکان بەڵکو گرنگی دەدات بەو گۆڕانکاریانەی کەتایبەتە بە ڕۆڵی ئایینەوە لە کۆمەڵگای دیاریکراو داو لە چیخێکی دیاریکراودا، کەواتە لێرەدا توێژەرەوە باس لە ئایین ناکات لە خودی خۆیدا (بۆ نمونە ئیسلام و مەسیحیەت) بەڵکو باس لەو خەڵکە دەکات کە ئەوئایینە لە باوەش دەگرن (موسڵمانەکان یان مەسیحییەکان لە چاخێکی دیاری کراو و شوێنێکی دیاریکراودا). جیاکردنەوە لەنێوان ئەم دوورەهەندەی ئاییندا ڕێگە دەدات بە جیاکردنەوە لەنێوان ئیجتهاد و دامێنان لە دیراسەکردنی کۆمەڵگادا. لاهوتیەت ولزی نەهێنا لە ئیجتهاد لەپێناو بەخشینی مانادا بەبیرباوەڕ (العقیدة)، لەسەر ئەوەی کەدامێنان لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگادا دەستنیشان کردنی شوێنی ئایین لێوەی وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بەڵکو ئەوە شتێکی ترە و بۆتە ئاستەم.

٢- پێویستە کێشەی دواکەوتن و پێشکەوتن و (پێنگگەیشتنەوە) لەم چوارچێوەیەدا بخرێتە ڕو،ئەو کارەی ئەوەی لێوە وەبەردێت کە پێشکەوتن و شوێن کەوتەیەکی دەبنە دوو شتی ئاستەم بەبێ جێبەجێ بوونی شۆڕش لە فیکر و ڕۆشنبیریدا کەکۆمەڵ لە چاخی سەرداریتی میتافیزیکاوە دەگوێزێتەوە بۆ چاخی ڕزگاری بوون لەو سەرداریتییە. لەپشت ئەم وتەیەود مەبەستم لەوە نیە کە شۆڕش لە بیرو ڕۆشنبیریدا پێویستە بکەوێتە پێش بەدەست هێنانی شۆڕش لەبواری پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان و سیستمی حوکمی کۆمەڵگاوە. تەنها دەڵێم کەشۆڕشی کۆمەڵایەتی بەبێ شۆڕشی ڕۆشنبیری بەری چاوەڕوانکراوی لێوەبەرناهێنێ. بەڵکوڕەنگە (لەبار بردنی) چارەنووسی پێویستی بێت لەم بارودۆخەدا. شۆڕش لەبیر و ڕۆشنبیریدا بەشێکە لە گۆڕانکاری پێویست لە پێناو خۆشکردنی ئەو بارودۆخەدا کە بەبێ ئەو ناتوانرێت ڕزگاربوونی ماددی بەدەست بهێنرێت. هەروەها گەلێک ڕەهەند هەیە بۆ ئەم بەستنەوە ڕەگەزیە لەنێوان هەردوو شۆڕشەکەدا یا بە دەربڕینێکی ڕاستتر لە نێوان دوولایەنی یەک شۆڕش دا. لێرەدا بۆنمونە تەنها یەک ڕەهەند هەڵدەبژێرم، ئەویش ئەو ڕەهەندیە کە تایبەتە بە دیموکراسیەتەوە، دیموکراسیەتیش دەست نیشان کراو نیە تەها بە ڕزگاربوونی زەین نەبێت لەبڕیارد پێشوەختیەکان ئیتر ئەو بڕیارە هەرچۆنێک بێت، واتە بەخشینی

لیبرسـراوێتی بڕیـاردان بـەبێ کـوَت و بـەندی پێـش وەختـی بۆگـەل؟ بـەم واتایـە دیموکراسیەت ڕەتکردنەوەی هەموو ڕەهاییەک دەسەپێنێ وە لەجێگەیدا تاکە ڕەهایـەک دادەنێت کە ئازادی بیرە لە هـەموو پانتاییـەکاندا، وەلـەدوایيدا دیموکراسیەتی عیلمـانی مەرجێک بۆ خۆی دەسەپێنێ کە دەربـاز بوونـی لێنیـە، جیاکردنـەوەی کاروبـاری ئـایین وەک سیسـتمی فـەرمان ڕەوا هەرچـەندە ڕژێمێکـی سیما ئـەخلاقی و بـەهاییش بێـت- جێگیربوونی ئەلتەرناتیڤێکی کۆمەلایەتی پەتی کە بارودۆخێکی مێژووی دەسـت نیشـانی دەکات. جێگەی داخـە کـە زۆر کـەس پـەی بـە نـاوەرۆکی ئـەم عیلمانیەتـەو بایـەخی لـە بنیاتنانی کۆمەلگای دیموکراسی لەسەر ئاستی بەرهەلستیەکانی چاخەکـەدا نـەبردووە. وەرەنگە هۆکاری ڕەتکردنەوەیان بۆ عیلمانیەت ئەوە بێت کە گومان دەکەن لـەوەی کـە عیلمانیەت هاوتای دوژمنایەتی ئایین بێت. وای دادەنێم کـە ئـەم تێکـەل کردنـەش هیـچ بنچینەیەکی نیە، بـەلکو وای دادەنێم کەعیلمانیـەت لەئـەرکی خۆیدا ئەوەیـە کـە ئـایین ڕزگار بکات لە چەوساندنەوەی دەسەلات بۆی. وە لە دوایدا عیلمانیەت ئەرکی ئەوەیە کە دوورەپەرێزی ڕازی بوونی تاکیانـەی سەربەسـت لـە بیرو بـاوەڕی ئـایینی بـەهێز بکـات. ئەمـەش لـە ڕێگـای هەلوەشاندنەوەی پـەیوەندی نێـوان ئـایین ودەسـەلات، ئەمـەش گرێدانێکە بیرو باوەڕ بە بارودۆخی ئاییني‌یوە کۆت دەکات وەک دیاردەیەکی کۆمەلایەتی سیمامێژوویی، لەم چوار چێوەیەدا وام بۆ دەردەکەوێ کە عیلمانیەت سیمایەکی تایبـەت نیە بە کۆمەلگا مەسیحیەکانەوە. وەکو سـەلەفیەکان وای دەبینـن. کۆمـەلگای ئـەورووپی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاستیش چەمکی عیلمانیەتی نەزانیوە. بـەلکو لەسـەر پرنسـیپی یـەکێتی ئـایین و دنیـا وەسـتابوو بـەو جـۆرەی کـە لەکۆمـەلگا ئیسـلامیەکانی ئێسـتادا لەسەریەتی. ئەم یەکێتی‌یە سیمایەکی کۆمەلایەتی ئەدا بەئایین بەزۆری لەسـەر حیسـابی پەسەندکردنی ئازاد و بیروباوەڕەوە، ئەمەش خالی هاوبەشی هەموو کۆمـەلگاکانی پێـش سەرمایەداریە. کە لەسەر پەیت بوون لـە سـەر یـەکێتی ئـایین و دنیـا ڕێـک دەخرێـت لـە هەموو بارەکانی تێگەیشتنی دواکەوتووانەدا بـۆ ئـایین خۆشـی، لـە کـاتێکدا عیلمانیـەت (واتـە جیـا کردنـەوەی ئـایین لـە دنیـا ) مـەرجێکی پێویسـتی تێگەیشتنی بـەرزی بـیرو بـاوەڕە. لێرەدا ئـەوە دەبینـین کـە دیموکراسـیەت بـەم مانایـە دیاردەیـەکی نوێیـە، پەیوەندی بە شـێوەکانی پێشـووەوە نی‌یـە کـە هـەندێ کـەس بـە دیموکراسیەت نـاوی دەبەن کە هەلەیە بۆ نمونە شورا لـە کۆمـەلگای عـەرەبی ئیسـلامی تـەقلیدیدا و هاوتـای دیموکراسیەت نیە، ئەم شـورایە تـەواو جیـا نیـە لـە مومارەسـە هاوشـێوەکانی تـر کەلـە کۆمەلگاکانی تری پێش سەرمایەداریدا هـەبووە، لـە کـاتێکدا کـە پێشـوتر شـورا کـۆت و پێوەندکراوە، ئەم کۆت و پێوەندە پێش وەختیـەش سروشـتێکی ڕێژەیـی نـەبووە، واتـە پرۆسێسێکە کە هەر شێوەیەکی دیمەکراسی هەیەتی هەر چۆنێک بێت، دیموکراسیەتیش

شتێکی تره که ڕەها نیەو هەمیشه ڕێژەییه، مەبەستم لێرەدا ئەوەیه که شورا گەلێک سنووری ناسیوه که پەیوەسته به سیفاتی ئەوانەی مافیان لە ئەنجوومەنەکانی شوراد هەیه. لەوانەش دورخراوەکان لێی، و هێزی بڕیارەکانی ئەم ئەنجوومەنانه چیيه.... هتد. ئەم تێبینیانه لەسەر ڕێژەیی مومارەسەکردنی شورا لەپێناو دەست نیشانکردنی ماهیەتی ئەم دیاردەیەوە نەهاتووه. شورا لە بنەڕەتدا بەبڕیارەکانی ئایدۆلۆژیای میتافیزیکی باوەوه پێوەند نەکراوه، وەله چوارچێوەی کۆمەڵگایەکدا دەهۆنرێتەوه که تا ئێستا پەی به توانستی جیاکردنەوەی ئایین و دەوڵەت نەبردووه، لە دواییدا شورا لەسەر پرنسیپی دورخستنەوەی داهێنانی کۆمەڵگەیی وەستاوه، ئەمەش ئەو پرنسیپەیه که بەبێ ئەم دیموکراسیەت بوونی نیه.

٣- به ڕێکخستن لەسەر ئەوەی پێشوەوه بەرەو ئەوه دەڕۆم که بیری سەلەفیەتی هاوچەرخ بیری داهێنان له بواری کارو باری کۆمەڵدا ڕەت دەکاتەوه، و (لەچاکترین بارو دۆخدا) مەسەلەکه به بانگەشەی گیانی ئیجتهاد دەبڕێنێتەوه لەم بوارەدا. وەبەتەواوی ئەوه دەزانم که بزوتنەوەی سەلەفی هاوچەرخ چۆن یەک نین لەگەڵ ئەوەدا که ئێمه لێرەدا لەبارەی گفتوگۆی ئەو ڕەوته هەمه چەشنانەدا نین که بزوتنەوەی سەلەفیەتی نوێن. بەتایبەت که سەرجەم ئەم ڕەوتانه تەبان لەسەر حاڵەتێکی جەوهەری لەوەدا که تایبەته به بابەتەکەی ئێمەوه ئەویش ئەوەیه که کەلێپوری ئیسلامی چارەسەری ڕاستمان پێشکەش دەکات له پێناو ڕووبەڕووبوونەوەی بەرهەڵستیەکانی سەردەمدا. بۆ نمونه ئەوانەی بەرگری لە سەلەفیەت دەکەن وای دەبینن که شورا شێوەیەکی داواکراوی سیستمی دیموکراسیەته. بەم بۆنەیەوه جەخت لەسەر ئەوه دەکەنەوه که سیستەمی ئیسلامی چاخەکۆنەکان هەمەچەشنەیی ڕاو بۆچوونی بینیوه، بەدڵنیایشەوه ڕاکان هەمه جۆر بوون (بەڵکو له هەندێ کاتدا ناکۆکیش بوون) لە کۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامی کۆندا، بەڵام ئەمەش لەبەر هۆیەکی ساده بووه ئەویش ئەوەیه که بەرژەوەندیه کۆمەڵایەتیەکان فرەچەشن بوون و بەڵکو ناکۆکیش بوون. لەسەر ئەوی که بەڵگەی خراوه ڕوو بەم شێوەیه لە بنەڕەتدا ناکۆکیداره، هەمەچەشنەیی لەم ڕاو بۆچوونەدا لەگەڕ دونێکدا بەرێوه چووه که میتافیزیکا دەستی بەسەردا گرتووه. له دواییدا جیاوازی ڕاو بۆچوونەکان شێوەی مەزهەبیان وەرگرتووه و له چوارچێوەی فکری نادیار نەچونەته دەرەوه، ئەو قوتابخانه مەزهەبیانەی کەلەم چوارچێوەیەدا بەریەک کەوتوون شێوازی ئیجتهادیان بەکار هێناوه بەبێ گوێزانەوه بۆ داهێنان له کاروباری کۆمەڵدا. لەسەر ئەم بنەڕەته نابێت گەڕانەوه بەردو بەکارهێنانی ئەو جۆره شێوازه بەجێ بهێنرێت بەرەو ژیاندنەوەی دەستکردانه بۆ جیاوازیه مەزهەبیەکان هیچ پەیوەندیەکی به گیروگرفتەکانی سەر دەقەکەوه نیيه. ئەوەی که بەردو ڕووبەڕووبوونەوه بچێت بۆ نمونه لەنێوان شیعە و

سوننەدا... هتد. ئەو پەرەسەندنانەی کە لە ئێستادا ڕویان داوە لە ڕیزەکانی بزوتنەوەی سەلەفی ڕاستەقینەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەم مەترسی‌یە لێ دەربازبوونی نیە تاوەکو گفتوگۆ لەسەر کەلەپوری وادانراو بکرێت. ئەوە بۆ ئەم تێبینیە زیاد دەکەم کە زۆربەی ڕەوتەکان لەبزوتنەوەی سەلەفیەتی هاوچەرخ دا بەرەو بانگهێشت نارۆن بۆ کردنەوەی دەرگای ئیجتهاد. وەرەنگە کە ڕەوتی زۆرینەی خۆی بە ڕەوتێکی پارێزەرەو کلاسیکی نەژمێرێت کە لە بیری تەرخان کردنی مومارەساتی سروتیانە تێناپەڕێ بەشێوەیەک کە نوێنەرایەتی گەڕاندنەوەی چاخەکانی هەرەسهێنانی دەکات( دوای ئەوەی کە دەرگای ئیجتهادی داخست ) زیاتر لەمەش گەڕانەوەیە بۆ چاخەکانی پێشوو لەسەر ئەم هەرەسهێنانە!.

لەم بارو دۆخەدا بزوتنەوەی سەلەفی بە هەموو باڵە جیاجیاکانیەوە یەکێک لە دیاردەکانی ئەم قەیرانە، چارەسەرێک نیە بۆی وەلەبەر پرسیارێتی ڕووبەڕوو بوونەوەی بەرهەڵستی‌دا بەشێوەیەکی ڕاستەقینە ڕادەکات. بەلام ئەو هۆیانەی کە ڕاقبەی سەرکەوتنی ئێستای بەدیار کەوتووی دەکەن ئەمە بە ئاسانترین شێوە وەبەرهاتووی سەرنەکەوتنی پرۆژەیەکی ترە کە مێژوویی سەدەیەک و نیوەی سەدەی ڕابردووی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. مەبەستم ئەو پرۆژە بۆرژوازیە نیشتمانیە یە کە شێوەی بەدوادایەکی وەرگرت وەکو وەهمی توانای ( تەقلید )ی ڕۆژئاوای ڕەواندەوە، لەڕێی تێکەڵ بوون ( اندماج ) لەسیستمێکی سەرمایەداری جیهانی‌دا بەبێ پەی پێبردنی لەبەر ئەوەی ئەو یاسایەی کە حوکمی فراوان بوونی سەرمایەداری دەکات ئەوە یاسای جەمسەرگیریە کەبەبێ شوێن کەوتەیی دەگۆڕێ. لەو ڕووانینەوە لەبەر ئەوەی کە ئەلتەرناتیڤی تر نەخراوەتە ڕوو، ئەم پرۆژیەش بە سروشتی کارەکە شکستی هێنا. هەروەها کومەڵ خۆی لەجێگای نیگەرانیەکی ڕەهادابینیەوە. گەڕانەوەش بۆ فەرمان ڕەوایی ئایینی تەقلیدی دەرکەوت بەو پێیەی کە ( چارەسەرە ) وەئەگەر ئەم چارەسەرەش وەهمی بێت ئەو نیگەرانیە ڕەت ناکاتەوە. ئێستە پێویستە لەسەرمان کە ڕوخساریانە بڕیارەکانیان دەربارەی سیمای ڕەها بگونجێنین ڕوخساریانە بۆ دژواری لە نێوان ئیجتهاد و داهێناندا وەک لە پێشدا خرایە ڕوو، ئەمەش لە دوولایەنەوە: مەبەستم ئەوەیە کە ئیجتهاد لە هەندێ بارودۆخ‌دا دەتوانێت هەندێ ڕەگەز بگرێتە خۆی کە سیمای نزیک بێت لە سیمای داهێنانەوە، یاخود هۆیەک بێت بۆ گێڕانەوە بەرەو داهێنان. لەلایەکی تریشەوە ئیجتهاد لە (سۆسیۆلۆژیادا ) تا ئێستاش مومارەسەی جێگای داهێنان دەکات لەگەڵی بارودۆخدا. بەڵکو هەندێ جار بەهۆی داهێنانەوە دەکرێ. بەشێوەیەک بە ڕێککەوتنی نێوان ئەم دوو ڕێبازە بەریەککەوتنێکی ڕێژەیی‌یە نەک ڕەها. وە باسەرەتا دوو لایەنی ئەم کێشەیە باس بکەین. کەواتە با بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ناکۆکیە

کۆمەلایەتیەکان لە کۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامی کۆندا. ئەم ناکۆکیانە لە فرە مەزهەبیدا دەردەکەوت وەهێزی کۆمەلایەتی جیاجیای بەرهەم هێنا، ئەو مەزهەبانەی وەلامی بەرژەوەندیەکانی دەدایەوە. هەندێک لەو مەزهەبانە خزمەتی بەردەوامیتی فەرمان ڕەوایی چینە فەرمان ڕەواکان بوون لە ڕێی نێو لێکدانەوەی پارێزەرانە یان ڕیفورمستی ڕێک بۆ بڕیارەکانی شەریعەت. هەندێکیان مەزهەبی ڕیفۆرمستی ریشەیی بوون (لەهەندێ کاتدا گەیشتنە پلەی شۆڕشگێڕی) وەلامی داخوازیەکانی جەماوەری کۆڵەواری دەدایەوە. لەم بارو دۆخەی دواییدا ئەوپێشنیارانەی لە ڕێگای ئەم مەزهەبە شۆڕشگێڕیانەوە پێشکەش کران لەسەر شانیان بوو پەرەسەندنێکی کۆمەلایەتیانە بکەن کە بەرەو دابڕانێکی برد لە گریمانەی بەدەست هێنانیدا. ئەمەش چ لەبواری دابەش کردنی موڵکایەتی دابێت یان لە بواری کاروباری کەسایەتی دابێت وەهەر یەک لە ڕەگەزەکانی کۆیلەو سیستمی میراتی و بڕیارەکانی ژن هێنان و باری ئافرەت و...هتد. سەر بەم بوارە بوون. جیاوازی لە بیرو ڕاکاندا لەسەر هەوڵەکانی ڕێکخستنی کاروباری کۆمەلایەتی گەمارۆ نەدرابوون بەڵکو تێڕوانینێکی فەلسەفیش هەبوو بۆ گەردوون، هەندێک نێو لێکدانەوەیەکی حەفییان پێشکەش کردوە بۆ تێکستەکان و پشتیان بە تیۆەری پێشینەیی کردگار لەسەر گەردونی مادی بەستووە. لە کاتێکدا هەندێکی تر بەرەو تیۆرێکی هەمیشەیی مادی ڕۆیشتوون بۆ گونجاندنی هەمیشەیی خواوەند، ئەمەش لە دوو حاڵەتدا لە ڕێگای مومارەسەی میتۆدی ئیجتهادەوە لە چوارچێوەی دەقەکان خۆیاندا بەجێهێنراوە: لێرەدا پێویستە لەسەرمان پرسیار لەوە بکەین کە ئایا میتۆدی ئیجتهاد لە خودی خۆیدا ڕێگرێکی ڕاستەقینە دەنوێنێ و (لەڕوی پرنسیپەوە) ڕێگە نادات بە گەیشتن بەو ئامانجانەی کە دشێت پێیان بگەین لە ڕێگای کۆچ کردنی دەقەوە وەبەڵکو لەڕێگای دەرچونی ڕووتەوە (السافر) لێی گەر کارەکەوا پێویست بکات. وەلامدانەوەی ئەم پرسیارکردنە بانگهێشتی شتێک لە خۆگونجاندن دەکات. ودئەمەش ئەگەر چی پرسیاری خراوە روبێت بواری لایەنە کۆمەلایەتیەکاندا بۆ پێشنیارە پێشکەش کراوەکان یان لەبواری لایەنی فەلسەفی بیردابێت. وەلەبواری پرۆژەی کۆمەلایەتی پێشکەش کرا و لەمەزهەبە شۆڕشگێڕیەکاندا (پلەی پێشکەوتن خوازیان هەرچەندێک بێت لەڕوی ناوەڕۆکەوە) هەموو مەزهەبەکان پەنایان بردۆتە بەر ئەو بەڵگانەی دەکەونە سەر زەمینەی ئەخلاق نەک زەمینەی پێویستی بابەتی وەبەرهاتوو لە داینامیکیەتی کۆمەڵەوە، ئەم پێشنیارانە لەڕووی میتۆدەوە لە چوارچێوەی ئیجتهاد دەرنەچون، دور لە گیانی داهێنانی زانستی لەبواری کارو باری کۆمەلایەتی دا. لەو باوەڕەدام کە ئەم سنورانە لەمیتۆددا تیشکدانەوەی پێگەیشتویی کۆمەڵگایە بەپلە یەک کە ڕێگای گوێزانەوەی دەدات بۆ قۆناغێکی بالاتر. مەزهەبە شۆڕشگێڕیە مەبەستەکانیش تەنها

دەربڕینێکە لە بەردەوامێتی مەیلی کۆڵەوارەکان بۆ دابەڕووەری کۆمەڵایەتی بەبێ ئەوەی توانای لەسەر پێشنیارکردنی شێوازێکی ئەلتەرناتیف هەبێت بۆ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە پێشتوەکان لەگەڵ پێویستە بابەتیەکانی بۆ ئەشونمای هێزی بەرهەمهێنان، وەلە دواییدا ئەو بزوتنەوە (کۆمۆنیستیی یە سەرەتاییە) (پشت بەستو بە ئایین) بڕیاری سەرنەکەوتنی بەسەردا درابو، وەسەریش نەکەوت. ئەو پرنسیپانەی کە لەسەر بنچینەی ئەم هەندێ لە دەوڵەتەکانی چاخی ناوەڕاستی ئیسلامی بنیات نرا بەنەپرنسیپێکی بەتاڵ لەناووەرۆکە بنەڕەتیەکاندا، بەشێوەیەک سیستمی ئەم دەوڵەتانە لە دوادەوراندابەتەواوی لەگەڵ ئەو سیستمەدا کە بوبوە دژی هاوشێوەبوو، هەروەها ئەوەشی لێوەبەر هات کە دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی ئەوبانگەشە هاوشێوانەی لەسەردەمی ئێستاماندا بەرەویان پێدەدرێ ناتوانێت چارەنوسێکی جیای هەبێت لەبەر هەمان هۆکاری پێشوو. لەسەر ئەوەی کە مەترسی ئەو ئەنجامانەی کە هەندێ مەزهەبی شۆڕشگێڕ لە بواری چاککردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا پێگەیشت بەبێ دەرچوون لە میتۆدی ئیجتهاد مەترسی دەنواند لەسەر سیستمی حوکمی چینایەتی باو لەو کاتەدا. وەئەمەش ڕێگەی نەدا بە بەردەوام بوونی ناکۆکیە مەزهەبیە پشت بەستوەکان بە ئیجتهاد. چینە بالا دەستەکان بەرەو (داخستنی دەرگای ئیجتهاد) ڕۆشیتن (وەکو دەوترێت) لەماوەیەکی زووەوە واتا لەپاش هەندێ سەدە لە بوژانەوەی شارستانیەتی ئیسلامیەوە. ئەم دەرگایەش تا ئێستا هەر داخراوە و نەکراوەتەوە لەبواری بیری فەلسەفیشدا ئەم کارە جیاوازی نیە تەنها بەشێوەیەکی ڕێژەیی نەبێت. ئالێرەشدا ئیجتهاد ڕێگەی دا بە گەیشتن بەو ئەنجامەی کە لە ناوەڕۆکدا زۆر دورنییە لەو ئەنجامانەی ئەولنی تر پێی گەیشتون بە داهێنانی ڕزگار بوون لە کۆت و پەیوەندی دەق. ڕاستیەکەش ئەوەیە، ئەو وتەیەی کە هەمیشەیی گەردوون پێویستییەتی هەمیشەیی کردگارە بەشێوەیەکی عەمەلی جیانییە لە وتەیەکی مادی فەلسەفی کە بە دڵنیاییەوە گەماروی هەمیشەیی گەردوون دەدات. جگە لەوەی کەسەر بارکردن بەجەنەخت لەسەر کردنی هەمیشەیی خواوەند بۆ هاوەڵێتی کردنی هەمیشەیی گەردوون ئەوە دەسەلمێنی کە فەلسەفەی مەبەست لەژێر ئاسمانی میتافیزیکادا دەسوڕێتەوە،مەبەستم ئەوەیە کە ئەم فەلسەفەیە بایەخی دەدا بە توێژینەوە لەسەر ڕاستی ڕەها. لەم دواییەدا بازدان نەهاتەدی بۆ کۆچ کردنی ئەو بایەخدانە بۆ بەس بوون بە ڕاستیە ڕێژەییەکان کە پێشکەوتنی زانستەکان بەرهەمی دەهێنێت. لەم گۆشەیەوە فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامی (وەک هەموو فەلسەفەکانی تری پێش سەرمایەداری) لە پرنسیپی ئیجتهاد ڕزگاری نەبوو وەکو هەستیتت بە دان پیانانی ئاشکرا بە داهێنانی فەلسەفیدا لەمەود ئەوە وەبەر دەهێنین کە کۆت و پەیوەندی هاوشێوە لە پرنسیپی پابەندبوون بە ئیجتهادەوە (واتە

مانەوە لەو سنووورەدا کە نێو لێکدانەوەی دەق ڕێگەی پێ دەدات) بێگومان ئەمەش ڕێگرێکی لە بەرهەم هێنانی سۆسیۆلۆژیاو بیری ئازاد دا بەواتایەکی تەواو دروست دەکرد جگە لەوەی کە هەڵاوێردنێک هەیە شایستەی وەبیر هێنانەوەیە ئەویش تێڕوانینی (ئیبن خەلدونە) لە کاروباری کۆمەڵ و مێژوو دا (مهدی عامل) بایەخی ئەو دابڕانەی ڕونکردۆتەوە کە تیۆریای (ابن خلدون) لە سۆسیۆلۆژیاو مێژوودا کە (ابن خلدون) بە ئاواکاری (العمران) ناوی دەبات. هەموو کتێبە مێژووییەکانی پێش خەلدون شتێکیان لەو نوانە نەکردووە. یا ئەوەتا تەنها (گێڕانەوەی هەواڵ یا ڕوخساری ئەو دیاردانەیە کە بەبێ هیچ بەستەرێک و پرنسیپێک کە ڕاڤەی بکات بەدوای یەکدا دێن). لەم بارەشدا مێژوونووس گێڕەرەوەیەکە تەنها هەواڵ دەگوزێتەوە، یا ئەوەتا مێژوو لەسەر زەمینەی (فیقە و حیکمەتی ئاینی) دروست دەبێ. مێژوو نووس بە چاوێکی ئاینییەوە دەڕوانێتە ڕووداوەکانو مێژوو کۆمەڵ لە ڕوانگەی دروست کردنی پەیوەندی نێوان کردگار و ئافەریدەکانیەوە دەبینێت و هۆیەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ کردگار بەمەش مێژوو دەبێتە (لقێک لە فەلسەفەی غەیبانیەت). پاشان مەهدی عامل سەبارەت بە ڕێبازی (ابن خلدون) دەنووسێت: (مێژوو لای خلدون هاوتای هەواڵ نیە چونکە واقعی مێژووی واقعێکی نوێ نییە... بەڵکو کۆمەڵێ پەیوەندییە لەجموجوڵەکانیدا ڕووداو لە دایک دەبێت) پاشان مهدی عامل دەڵێت (ابن خلدون مێژوو ناگێڕێتەوە بۆ پرنسیپە فەلسەفییە پێشینیەکان کە لە دەرەوە دەیخات بەسەر ئەم مێژووەدا) (ابن خلدون ڕوانیویەتە بابەتی مێژوو لە خودی خۆیدا) نەک بۆ (بەروبوم و فیقە و حیکمەت و وانە ڕەوشتییەکانی). بەم شێوەیە ڕوانیوێتییە واقع بۆ خۆی وەبە گوێرەی ئەو یاسا ناو خۆییانەی کە دەیجوڵێنێت) پاشان مهدی عامل دەڵێت: (لەبەر ئەوەی ڕوانینی خلدون بۆ ئایین لەبەر ڕۆشنایی یاسای ئاواکاری دا (عمرانیة)دا بووە وەک دیاردەیەکی ئاواکاری (عمراني). لەگەڵ زانینی ئەوەدا کە ئەم یاسایە بەتەواوی پەیوەندیینیە بە بڕیاری شەریعەت و پرنسیپەکانی فیقە یا حیکمەت یان ڕەوشتەوە... هتد) ئەمە لایەنێکی پۆزەتیفانەی مەزنە لە پرۆژەی خەلدونیدا کە بەڕاستی سەردەمێکی نوێی کردەوە و بەهۆی ئەمەوە بیری کۆمەڵایەتی بەرزبوەوەهەتا فەلسەفەی زانستی بە دەست هێنا.
لەکاتێکدا توێژینەوە لەو یاسا ناوخۆییانەی مێژوو دەجوڵێنێت پەیوەندی بە ئایینەوە نامێنێت (لە تێڕوانینی خەلدون خۆیەوە، ئەوا ئازادی ڕەها (واتە بەبێ پابەندبوون بە دەقەکانەوە هەرچۆنێک بێ]) ئەو پرنسیپەیە کە حوکمی سۆسیۆلۆژیای باو دەکات وەلە دوایدا لەسەر پرنسیپی داهێنان کاروباری لەمەدا کاروباری زانستە سروشتیەکانە. بەو پێیەی کەبنیادی تیوری خەلدونی بە ڕۆڵی خۆی لەسەر ئەو چەمکە دەمارگیرییە هەڵدەستێت کە بۆتە تەوەرەیەکی بنەڕەتی لە ڕاڤەکردنی خەلدونیدا بۆ پەرەسەندنی

دەوڵەتانی عەرەب و بەربەر لە مەغریب، منیش لێرەدا بەشداری لە سەرنجەکانی (مەهدی عامل)دا دەکەم لەم ڕووەوە، وەلەم خاڵانەدا کورت دەکرێتەوە: یەکەم: (لەوانەیە دەمارگیری بەتەواوەتی خەسڵەتێکی تەوەرەیی بوو بێت لە ڕەوشتی خەڵکی مەغریب دا لەو چاخانەدا کە لە مێژووی خەلدوندا خوێندراوە) ئەمەش لەئاستی هەریەک لە گروپی فەرمان ڕەواو جەماوەری فراواندا. جگە لەوەی کە هەبوونی ئەم خەسڵەتە بە ڕۆڵی خۆی بانگ هێشتی ئەو هۆیانە دەکات کە دەریدەخەن. وە (ابن خلدون) لەم بابەتەدا بێدەنگ بوو. بە هۆی (ئامادە نەبوونی چەمکی ئابووری لە بونیادی خەلدونیدا) بەپێی شیکردنەوەی (مەهدی عامل) ئەمە لەگەڵ ئەوەدا دەمارگیری خەسڵەتێک بووە کە لە کۆمەڵگاکانی تردا نەبووە وە لەو چاخانەی مێژووی مەغریبدا نەبووە کە (ابن خلدون) لێی کۆڵیوەتەوە، یان پێشی کەوتووە، هەروەکو تا ئێستا دەزانین کە دەمارگیری کۆمەڵگای سەرمایەداری نوێ بەڕێوەنابات، بەڵکو هیچ جێگایەکی تیایدانیە.
ئەو کارەی کە دەگاتە وەبەرهێنانێکی ترسناک ئەوەیە کە دەمارگیری دیاردەیەک نیە کە ئاەرزێکی جیهانی گشتی هەبێت، وەلە دوایشدا ناتوانێت کە پرنسیپی جەوهەری بێت لە ڕاڤەکردنی پەرەسەندنی مێژووی گشتیدا. دووەم: دەبوایە چاوەڕوانی سەرمایەداری بکرایە تاوەکو مەرجە بابەتییە پێویستییەکانی کۆدەبوونەوە بۆ دۆزینەوەی ڕۆڵی ئابووری لە پەرەسەندنی مێژوویدا وەک گرێدانی لایەنی ئابووری ژیانی کۆمەڵایەتی بە لایەنەکانی ترەوە کە وێنەیەکی دینامیکی سیستمی سیاسی و ناوەڕۆکی دەربڕینی ئایدۆلۆژیای هەیە... هتد. وەبێگومان (خلدون) نەیتوانیوە تیۆریایەک لەسەر ئەو ئاستە پێشکەش بکات بە پێی ئەوتێگەیشتنەی کە ماتریالیزمی مێژوویی دوای چەند سەدەیەک پێی گەیشتووە. ئەمەش بە تەواوی ڕێ لە دانانی تیۆریای (خلدون) بە ئەلتەرناتیفی ماتریالیزمی مێژووی دەگرێت، وەک هەندێ لە بیریارە سەلەفیە هاوچەرخەکان ئەوانەی کەبیری (خەلدونی) بە چاکتر دەزانن لەسەر بنەمای چینە پاشکۆکان بۆ کەلەپوری عەرەبی ئیسلامی (وەلاف لێدانی ئەوەی کە ئەمە لەگەڵ تایبەتمەندێتی یا شارستانیەکانیان دەڕوات). ئەم هەڵوێستەش دەگۆڕێت بەپێی دانانی ئەم کەلەپورە بەبەشێک لە کەلەپوری مرۆڤایەتی بە گشتی، چ لە ڕووی لایەنە باشەکانیەوە بێت یان لە ڕووی سنوورە مێژووییەکانیەوە بێت، وەلە تەڵەزگەی ئەو ئایدۆلۆژیەتە ڕۆشنبیریەدا بەندمان دەکات کە بەرەو ئەوە دەچێت کە مێژووی گەلان ناچنە هەمان یاسای گشتییەوە بەڵکو یاسای تایبەت بەڕێوەی دەبات وەهەموو گەلێک ئەنجامی تایبەتمەندێتی ڕۆشنبیریەتی خۆی هەیە. پێشتر لەم بارەیەوە وتمان کە ئەم ڕوانینە سەلەفیە بەشداری ڕۆژهەڵاتناسی ڕۆژئاوایی دەکات کە هەردووکیان وای دادەنێن کە (ڕۆژئاوا ڕۆژئاوایە و ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵاتە و هەرگیز بەیەکتر ناگەن)، بەواتایەکی تر

سەلەفیەتی هاوچەرخ هیچ نیە بێجگە لەوەی کە ڕۆژهەلاتناسێکە بەهەڵگەڕاوەیی.
سێیەم: بواری مێژوویی بیری خەلدونی ئاماژە پێدراو ڕێگری ئەوە نیە ئەم بیرە ببێتە بیرێکی زانستی. جیاکەرەوە لە نێوان بیری کۆمەلایەتی پێش زانست وبیری کۆمەلایەتی زانستیدا بە دەست نیشانکراوی دەکەوێتە پەیوەست بوونی یەکەم بە میتۆدی ئیجتهادێکی کۆت کراو بەدەق بەپێچەوانەی جەخت کردنی پرنسیپی داهێنانی ئازاد لەلایەن دووەمەوە وەلە کاتێکدا( ابن خلدون ) ئەم هەنگاوە چۆنێتیە پێشکەش دەکا. ناتوانرێت نکوڵی لە سیما زانستی‌یەکی بکرێت. لێرەدا بەرەو ئەو قسەیە دەڕۆم کە ئەو دابڕانەی بڕیاری عەرەبی وێراویەتی لەسەر وەبەرهێنانی بە دەستنیشانکراوی ئەو بەشداری کردنەیە کە بیری خەلدونی دەکات بەبیرێک کەناوەڕۆکێکی جیهانی هەبێ وەبەسەر ئەو بەشداری کردنانەدا سەردەکەوێت کە ناوەڕۆکەکەیان بەناوخۆیی ماوەتەوە.

ئێستاش لە کورتەی ئەم خستنەڕوییە خێرایەدا لەسەر هێنانی پرنسیپی داهێنان بۆ ناو سۆسیۆلۆژیا هەتا وەکو جێگەی نێو لێکدانەوەی دەقەکان لەڕێگەی ئیجتهادەوە بگرێتەوە. دەتوانرێت بوترێت کە بیری عەرەبی ئیسلامی بە گشتی‌یەی بە گرنگی ئەم دابڕانە نەبردووە، وەئەم هەلەی لە کیس چووە. بەرهەمەکانی ( ابن خلدون ) بەو جۆرە مایەوە کە نەتوانێ بەرەو پێداچوونەوەی بیرو میتۆدەباوەکان بچێت. بەڵکو ئەم بەرهەمانە لە بیر کران. لێرەدا وای دەبینم کە ئەم لەبیر کردنە ناگەڕێتەوە بۆ تایبەتێتی‌یەکانی (ڕۆشنبیری ) کۆمەڵگای عەرەبی، بەڵکو بەستەڵەک بوونی ئەم ڕۆشنبیریە دەگەڕێتەوە لە گەشەکردنیدا، وەمەرجە پێویستەکانیش کۆبوونەوەی لە پێناو پەی بردن بە گرنگێتی بەشداری کردنی خەلدونی و سوود وەرگرتن لێی بۆ وەبەرهێنانی پێشکەوتنێکی زۆرتر. بەم شێوەیە بیری عەرەبی ئیسلامی لەسەر ئیجتهاد و ڕەتکردنەوەی پرنسیپی داهێنان مایەوە لە ڕاڤەکردنی گەشەسەندنی کۆمەڵدا.

ئێستاش ڕوویەکی تری کێشەکە دەخەمەڕوو، واتا بەردەوامی موماردسە ( سیما ) ئیجتهادیەکان لە زانستە نوێ‌یەکاندا.

وتمان کە ڕێنسانس بالا دەستی میتا فیزیکای لەبیری فەلسەفی‌دا ڕەتکردەوە ودلە دوایی‌دا کوتایی هات بە دەسەلاتدارێتی ئایین بەسەر بوارە بیریە کۆمەلایەتیە هەمەجۆرەکاندا ئەو کارەی کە بەڕۆڵی خۆی چەند ئاسۆیەکی نوێی کردەوە هەتاوەکو سۆسیۆلۆژیای وەستاو لەسەر خۆی دەرکەوت بەو پێیەی کە ڕێنسانس نیگەرانێتی میتافیزیکی ڕەت نەکردەوە بەڵکو بەدەستنیشان کردنی دیاردەکەو تایبەتمەندکردنی بوارێک بۆی هاتە کۆتایی بە مەرجێک کە لەبوارە کۆمەلایەتیەکانی تری جیا بکاتەوە. هەروەها ڕێنسانس بیرو باوەڕی ئایینی دەستنیشانکراوی ( لێرەدا مەبەست مەسیحیەتە )ڕەت نەکردەوە ئەمەش شێوەیەکە لە دەربڕینی بایەخ پێدانی میتافیزیکی

لە شارستانیەتی ئەورووپیدا. بەو پێیەی کە ڕێنیسانس ڕێی بۆ وەدەست هێنانی شۆڕشێکی ڕۆشنبیری لەنێو لێکدانەوەی ئایینیدا خۆشکرد لەوەدا کە تایبەتە بە تێگەیشتنی پەیوەندی لەنێوان دەق و عەقلدا. ئەم شۆڕشە لە ڕێگای بەکارهێنانی میتۆدی ئیجتهادی کلاسیکیەوە لە چوارچێوەی مومارەسە لاهوتیەکاندا جێبەجێ کرا. ئەمەش لەبەر هۆیەکی ساکار ئەویش ئەوەی کە ئایین لە ڕووی پرنسیپەکانیەوە دەریدەخات بۆ ڕێزگرتن لە دەق و پشان میتۆدی ئیجتهاد دەسەپێنێ وناتوانێت کە ئازادی داهێنان بەرەلا بکات (واتا ڕزگار بوون لە دەق) لەبواری بیرو باوەڕدا. واتای ئەمە ئەوەیە کە داهێنان (لە ڕوی پرنسیپەوە)بووە بالا دەست لە گشت پانتاییەکانی بیردا لە دەرەوەی بیرو باوەڕی ئایینی، واتە بوو بەدەسەلاتدار لە پانتاییەکانی بیری کۆمەلایەتی و فەلسەفی و ئەوەی کە تیایدا بوو لە بیری میتافیزیکی عیلمانی نوێدا. بەم شێوەیە فکری فەلسەفی ڕۆژئاوایی گەڕایەوە بۆ دۆزینەوەی بیری میتافیزیکی هیلینی کۆنی پێش وەختە لەسەر ڕاڤەکردنی مەسیحی و (ئیسلامی) بۆی. ئەمەش وەك لە شوێنێکی تردا وتمان (میتافیزیکای عیلمانیە) بەواتای ئەوەی کە نەبەستراو بە بیروباوەڕی ئایینی تایبەتی وەستاو لەسەر دەقی پیرۆزکراو. لێرەدا دەبێ ئەوپرسیارە بکەین کە ئایا جێگرتنەوەی پرنسیپی داهێنان لە جێگای پرنسیپی ئیجتهاد لەم کاروبارانەدا بە تەواوی مومارەسەکانی ئیجتهادی ڕەتکردەوە؟ بەو پێیەی کەوەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە بە ڕۆلی خۆی داوای ئەوە دەکات کە ساتێك لەلای میتۆدو مومارەساتی لێکۆلینەوەی زانستی بەشێوەیەکی گشتیو لێکۆلینەوە لەبوارەکانی زانستی سروشتیدا بەشێوەیەکی تایبەتی ڕابووەستین. زانستیە سروشتیەکان هیچ کات نکولیان لە پرنسیپەکانی داهێنان نەکردووە، بەو پێیەی کەوەلامان پێکهێناوە بۆ پرسیارە دەرەکیەکان لەسەر چوارچێوەی لێکۆلینەوە لە (حەقیقەتی ڕەها)، بەلکو وەلامدانەوە لەسەر گەڕان بەشوێن حەقیقەتە پارچەیی (جزئي)و ڕێژەییەکاندا. ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە زانست (بەلایەنی کەمەوە لەم بوارانەدا) ئیجتهاد نازانێت؟

نەخێر. پێشکەوتنی زانستی پێشکەوتنێکی کەلەکەبوویی‌یە بەپێی چەند قۆناغێك پێك دێت. لە قۆناغی یەکەمی لێکۆلینەوەدا ئەو لێکۆلەرەوەی کە ڕاستی‌یەکی نوێی دۆزیوەتەوە هەلدەستێت بە هەولدان بۆ تێکەل بوون. ئەم دۆزینەوەیە لە چوارچێوەی تیۆرییایەکی جێگیر و پەسەنددا. هەروەها هەولی ئەوە دەدات کە نێو لێکدانەوەی ئەم بیردۆزیە بە شێوەیەکی گونجاو بگێڕێتەوە کە جێگەیەك دەدات بەم بیردۆزەیە. هەتا وەکو کەلەکەبوونی دۆزینەوەی تری سەربارکراو دروست دەبێت بەشێوەیەك کە ئیتر ناتوانرێت بەردەوام بێت لە پابەندبوون بەتیۆریا کۆنەکەوە. وەتیۆریایەکی نوێی ڕزگاربوو لەو پرنسیپانە دێت کە زانستێکی پێشتری پێ هەلدەستێت تاوەکوتیۆریا

نوێکە پرنسیپە تازەکراوەکانی بڵاو دەکاتەوە. بەم جۆرە دابڕانی (گواستنەوەی) جۆنێتی ڕوودەدات لە گەشە سەندنی زانست و پێشکەوتن لە مەعریفەدا. کەواتە دابڕانیش ئەنجامی چوونەدەرەوەیە لە چوارچێوەی ئیجتهاد لەژێر سایەی تیۆریایەکی دیاری کراودا، وەهەستان بە داهێنان و خستنەڕووی پرنسیپی نوێ. کەواتە، جیاوازی لە نێوان میتۆدەی ئیجتهاد و میتۆدی داهێنان دا تەنها ڕێژەیییە. جیاکەرەودیەکی ڕەها نیە کە لێکیان جیا بکاتەوە مومارەسەی کرداریانەش بەتێکەڵەیەک لەم میتۆدانە پێکدێ کە هەندێکیان پەنا بۆ ئیجتهاد دەبەن و هەندێکی تریشیان لێی تێدەپەڕێنێ تاوەکو پشت بە داهێنان ببەستێت. جیاوازی نێوان ئەم دوو میتۆدەش ئاماژە بە سنووری سیمایەکی کەڵەکەبوویی بۆ مەعریفە دەدات کە لە ئاستێکی دیاریکراودا گواستنەوەیەکی جۆنێتی دەسەپێنێت وە لە کۆتی پرنسیپە پەسەند کراوەکانی پێشوو ڕزگار دەبێ. ئایا ئەم تێبینییە بەسەر بواری فەلسەفەدا بەشێوەیەکی گشتی و سۆسیۆلۆژیادا بەتایبەت هاوجووت دەبێت؟ بەڵێ. تا ئاستێکی دیار، فەلسەفە لە دوای ڕێنسانسەوە بانگەشەی ڕەتکردنەوەی کۆتکردن و پەیوەست بوونی کرد بەرەو دەقێکەوە بێت، وەبەرەو وەرگرتنی پرنسیپێکی گشتی ڕۆیشت کە پابەند نەبێ بە ڕەهاکانەو تەنها ڕەهایەک نەبێ کە ئەویش ئازادی بیرو ڕای کۆت نەکراوی پێش وەختەیە. لێرەدا دەمەوێ کێشەی ئڕایەتی نێوان مەزهەبی ماتریالیزم و مەزهەبی ئایدیالیزم لە چوارچێوەی ئەم تێبینییە میتۆدیەدا بخەمە ڕوو. وەرگرتن بە پرنسیپی ئازادی فکر بەرەو جەخت کردن لەسەر پێشینەیی مادە (واتە مێژوو) دەڕوات وەشیانی بوونی شتێکی تر پێش مادە. بەڵکو بەرەو ناکردنی بوونی هەرشتێک دەچێت جگە لە مادە خۆی، ئەم پرنسیپە بەردو دڵنیایی کردنی بەراوردکاری مادە و فکر و هەمیشەیی بوونی هاوبەشیان دەڕوات، یا بەرەو جەخت کردن لە پێشینەیی فکر لەسەر مادە دەڕوات. ڕۆڵ و گرنگی قوتابخانە فەلسەفیەکانیش لە قسە لەسەر کردنی ئەم هەڵبژاردنە پرنسیپییەدایە هەرچۆنێک بێت. وای نابینم کە جیاوازیەکی بنەڕەتی لە نێوان ئەم هەڵوێستە جیاوازانەدا هەبێت (ناکۆکی ڕوخساریانە) لەڕووی ئەو میتۆدەوە کە لێرەدا گفتوگۆی لەسەر دەکەین، تاوەکو هەمو ئەم هەڵوێستانە لە ئازادی بیرێکی کۆت نەکراو بەدەقێکی پێشین ترەوە سەرچاوە دەگرن، لەم گۆشە میتۆدیوە جیاوازیەکی بنەڕەتی نابینم لە نێوان ماتریالیزم و ئایدیالیزم دا. وەلە دواییدا ئەو ڕا بڵاوە دەگونجێنم کە بەرەو ئەوە دەچێت کە ئەم ئڕایەتییە نوێنەرێتی ناکۆکیە بنەڕەتی و هەمیشەیی دەکا لە فکردا، کێشەی بنەڕەتی کێشەی پابەندبون نیە بۆ ئەم یا ئەو مەزهەبە، بەڵکو کێشەی هەڵبژاردنە لەنێوان پرنسیپی داهێنان و ئازادی فکری ڕەهادا وەلەنێوان هۆنینەوە لە چوارچێوەی مومارەساتی ئیجتهادی وەستاو لەسەر ڕێزگرتن لە دەقی پێشوو.

ئایا تێبینەکانمان لەسەر بیری کۆمەڵایەتیش هاوجوت بێت؟

لە پێشوودا بینیمان کە سۆسیۆلۆژیای تازە سەری هەڵداوە. وەپێش سەرمایەداریەت و ڕزگار بوون لە دەسەلات دارێتی ئاتیار بەسەر گشت ڕووەکانی بیری کۆمەڵایەتی‌دا سۆسیۆلۆژیابونێکی سەربەخۆی نەبوو. بەوەرگرتنی ئەوەی کە بیری خەلدونی نمونەی هەڵاوێرن بوو، بەو واتایەی کە تێرامان مێژووی لە ئاتیار هێنایە دەرەوە. سەرەڕای ئەوەی کە سۆسیۆلۆژیا بنەڕەتیانە لەسەر ئازادی فکر بەبێ کۆتکردنێکی پێشینەیی بە هەر دەقێکەوە پێ‌ی دروست دەبێت، واتە لەسەر پرنسیپی داهێنان دروست دەبێت، سەیر نیە کەئێمەلێرەدا بەردەوام بوونی مومارەسەیەکی دوولانە بدۆزینەوە کە ئیجتهاد و داهێنان کۆدەکاتەوە. ئیجتهاد جێگەیەک لەچوار چێوەی تیۆریا باوەکاندا دەدۆزێتەوە تا وەکو گواستنەوەیەکی چۆنێتی وەبەرهاتوو لە هەستان بە داهێنان ڕوودەدات. ئەو پرسیارانەی کە لەم ئاستەدا خۆیان دەسەپێنن بەم جۆرەن: ئەو تیۆریا سۆسیۆلۆژیە باوانە کامانەن کە لە ناویاندا مومارەساتی ئیجتهاد ڕوو دەدات؟ ئەو گواستنەوە چۆنێتیانە چین کە لە گەشەکردنی سۆسیۆلۆژیای نوێ‌دا دەیانناسین؟ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە بەڕۆڵی خۆی بانگهێشتی پرسیاری پێشتر دەکەن کە ئەمانەن: ئایا دەتوانرێت بە سیفەی کۆ مامەلە لەگەڵ تیۆر یا سۆسیۆلۆژیایەکان بکرێت؟ یا سۆسیۆلۆژیایەکی یەکگرتوو هەیە کە پێویستە بە سیفەی تاک مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ؟

ئەگەر ئەم پرسیارانەی دوایی شیاوبێت ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گەشەکردنی سروشتی لەهەر زانستێک لە زانستەکانی زنجیرەک لەدەستکەوتەکان بێت. تاوەکو ئەم گەشە کردنە بەرەو جیابوونەوە لە قەدێکی هاوبەش دەچێت وەپاشان پلە پێدانی (بەرزکردنەوەی) لقەکان بۆ ئاستی زانستە باوەکان لە خۆیاندا، تایبەتێتی خۆی هەیە لەوەدا کە پەیوەندی بە دیاری کردنی کێشە خراوەڕووەکانی و میتۆدی وەرگیراوەکانی لە باسکردنی بابەتیەکانیدا هەیە. وا دیارە کە سۆسیۆلۆژیا لەم گۆشەیەوە ناوازە نابێت: وەئەم زانستەش لقی هەیە وەک لقەکانی زانستی ئابووری و زانستی سیاسی و سایکۆلۆژیاو سۆسیۆلۆژیا بە واتایەکی تەسک و... هتد. بەو پێ‌یەی کە من بە جیاوازیەکی بنەڕەتی لە جیابوونەوە و دابەش کردندا لێرەو لەوێ‌دا دەبینم. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە باری ئەپستیمۆلۆژی بۆ سۆسیۆلۆژیا جیاوازە لەوەی کەلە زانستە سروشتیەکاندا هەیە. هۆی ئاوڕدانەوەشم بۆ ئەم جیاوازیە ئەوەیە کە بە دەستنیشان کراوی ئەم جیاوازیە لەلای ڕەوتی باو لەبیری کۆمەڵایەتی‌دا پەسەند نەکراوە. وتەی باو ئەوەیە کە چەند یاسایەکی بابەتی هەن کۆمەڵگای هاوشێوە (لە کردارەکانیدا) بۆ یاساکانی سروشت بەڕێوە دەبات. ئەوەش هاوتای لێکچوونی باری ئەپستیمۆلۆژی سۆسیۆلۆژیایە بەو جۆرەی کە لە زانستە سروشتیەکاندا لەسەریەتی. بێ‌گومان دەزانین

که ڕاگەیاندنی بابەتی ئەو یاسایانەی که کۆمەڵگا بەڕێوەدەبەن پێشکەوتنێکی چۆنێتی بەخۆوە دەبینێ که پێویست بوو تاوەکو بیری کۆمەڵایەتی له دەسەلات گەریتی غەیبی ڕزگار دەبێ جگه لەوەی کە ئەم ڕاگەیاندنە زیاد ڕەویەکی تێدایە له ئاستی خۆیدا، وەتایبەتێتی یاساکانی کۆمەڵ ڕەتدەکاتەوە. توێژەرەوەی زانستی لەبواری دیاردەکانی سروشت دا له گەواهی‌یەک زیاتر نیە کە چاودێری گۆڕنکاریەکانی سروشت دەکا لە دەرەوەیدا و هەروەها تۆماریان دەکا و پاشان ڕاڤەیان دەکات. ئەمە لە کاتێکدا کەکارەکە لەبواری کاروبارەکانی کۆمەڵدا دەگۆڕێت. کاتی گەشەکردنی کۆمەلایەتی خۆی ودبەرهاتووی مومارەسەکانی خەڵکە، لە دوایشدا ئەمان بکەرن بە تەنیشت دانانیاوە له جێگەی کاردا. لەم تێبینی‌یەشدا ئاکامێکی زۆر گرنگم وەدەر هێناوە ئەویش ئەوەیە کە جیاکردنەوەی ڕەهەندیی ئایدۆلۆژی لە ڕەهەندی زانستی لەبیری کۆمەلایەتی‌دا کارێکی مەحاڵە (لەبەر ئەمە باشترە کە قسە لەسەر بیری کۆمەلایەتی بکەم لە جێگەی زانستە کۆمەلایەتیەکان). هەروەها وەبەرهێنانێکی ترم له تێبینی‌یەوە وەبەر هێناوە بریتی‌یە لەوەی کە بیری کۆمەلایەتی یەکگتوو، یەکگرتنی لەسەر ڕاستیەکی ساکار دەبێت ئەویش ئەوەیە کە بابەتی سۆسیۆلۆژیا (بە سیغەیەکی تاک) بریتی‌یە له مرۆڤ، مرۆڤیش لە تاکێتیە تەنها کەیدا چەندین لایەن کۆدەکاتەوە کە لقەکانی سۆسیۆلۆژیا ئامادەی دەکا، پاشان ڕەهەندی ئابووری و ڕەهەندی دەروونی و ڕەهەندی ڕامیاری و هتد...؟ ئەو کارەی کە لەسەری ڕێک دەخرێت ئەوەیە کە لقکاری لێرەدا دەستکردە وەک لای لێکۆڵەرەوە کۆمەلایەتیەکان باوەڕی پێ‌هێنراوە کە سکالا لەو لەمپەڕانە دەکەن کە ئەم لقانە لەیەکدی جیادەکەنەوە وەئەوانەی دەگەڕێن بەدوای هۆکارەکاندا بۆ دووبارە بەجێ‌هێنانی یەکگرتنەوەی سۆسیۆلۆژیا. وەلە کاتێکدا کە سۆسیۆلۆژیا لە ناوەڕۆکی خۆیدا یەکگرتوو بوو بەپێی وەسف کردنی لەم چواچێوەیەدا، وەلێرەدا دەڵێم کە سۆسیۆلۆژیای باو سیمایەکی بۆرژوازیانەی هەیە. بە دیاریکراوی مەبەستم لەوەیە کە وەبەرهاتویەکی مێژوویە کە (بۆرژوازیەتی ڕۆژئاوایی) هەستاوە بەدروست کردنی لەپێناو شەرعیەتدان بە سیستمی سەرمایەداری. ناڵێم کە ئەم بونیادە لە هۆشمەندیەکی لەوەو پێش مەبەستدا دروست بووە. بەتەواوی بەپێچەوانەی ئەمەوە دەڵێم ئەو بارودۆخە بابەتیانەی کە حوکمی سیستمی سەرمایداری دەکەن (بۆ نمونە چاککردنەوەی پیوەندیەکانی ئاڵوگۆڕکردن لە ئابووری سەرمایەداری‌دا) ئەوەیە کە خەسڵەتەکانی سۆسیۆلۆژیای بۆرژوازی باو دیاری دەکات لەسەر لێکێشان کالایی (کە چاککردنەوەی پەیوەندیەکانی بازاڕی ئامادە بۆکراو تیایدا لە نمونەیەکی هەڵبژاردەدا ڕەنگ دەداتەوە). بەم جۆرە ئەو تیۆریانە دروست بوو کە شەرعیەت بەسەرمایەداری دەبەخشن لەڕێگای دەمامک کردنی لێکێشان کالاییەوە. ئەمەو لە شوێنێکی تردا ڕونم کردەوە کە ئەم بیرە له ناوەڕۆکی خۆیدا لەسەر ئەم سیفەتە بنەڕەتیە کورت ناکرێتەوە،

بەڵکو بەوەش جیادەکرێتەوە کەبە (شێوازی چەقبەستنی ئەورووپی) ناوم بردووە، وەئەمەش سیفەتێکە دەمامکێکی تر لە سەرویەکی تر (بۆ سەرمایەداریەتی ئامادە بوو بە حەقیقی) دادەنێت. وەئەمەش فراوانبوونی جیهانیە بۆ سەرمایەداریەت کە جەمسەرگەری و ناکۆک گەرایی لە نێوان ناوەندە باوەکانی و کەنارە پاشکۆکانی دا وەبەردەهێنێ. بیری کۆمەڵایەتی بۆرجوازی باو لە دەزویەکی دیاریکراو پێکدێت کە پرنسیپی میتۆدەیی و بەهای شارستانیەتی و تێبینی ئەمبریقی و یاساکان کۆدەکاتەوە کە دیاردە تێبینکراوەکان بەیەکدیەوە دەبەستێتەوە، بەبێ ئەوەی کە جیاکردنەوەی ئەم ئەندامانە لەتەک یەکدی بشێت. بۆنمونە: زانستی ئابووری بۆرژوازی لەسەر گریمانەیەک هەڵدەستێت کەڕوخسارەکەی سیمایەکی زانستی هەیە ئەمەش گریمانەکەیە کە ئەوە دەسەپێنێت کە (تاکەکان) بە ڕەفتارێکی (ئابووری) جیا دەکرێنەوە کە گەڕان بەشوێن (سودی تاکی)دا حوکمی دەکات وەبارە ئابووریەکان وەبەرهاتووی کارلێکی ئەم ڕێڕەوە تاکیەتییەوە. وەبا تێبینی ئەوەش بکەین کە ئەم پرنسیبە تاکانەیە لە هەمان کاتدا پرنسیپی بەهاییە بەتەنیشت ئەوەوە کە گریمانەیەکی سیما زانستیە (وەئەمەش بەلایەنی کەمەوە لە ڕوخساری‌دا) بیری سیمای بۆرژوازی جەخت لەسەر ئەم (تاکیتی‌یە) دەکات، ئەمە لە خۆگری (سەربەستی) یە (بەواتایەکی نوێ بۆ ئەم چەمکە) وەئەمەش مەبەستێکی پەسەندە لەئاستی خۆیدا. لەم چوارچێوەیەدا دەتوانرێت بوترێت کە بەدەست هێنانی زانستەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازی لە ڕێگای جۆرێک لە (ئیجتهادی بەردەوام)ەوە پێک هات کەلەچوارچێوەی ئەو پرنسیپانە دەرنەچوو کە ئەم بیرەی لەسەر دەوەستێ. لەسەر ئەوەی کە ئەم ئیجتهادە ناگەڕێتەوە بۆ (دەق)ی نووسراو و دیاریکراو کە سەبارەت بەئەم دەبێتە (دەقێکی پیرۆز)وەک ئەوەی کارەکە لەبواری نێو لێکدانەوەی ئایینی‌دا لەسەریەتی، چەمکێکی تایبەتمەند هەیەبۆ ئەم جۆرە لە مومارەسەی (ئیجتهادی بونیادنراو لەسەر دەقێکی ناوەکی) وەئەمەش چەمێکی (براد جم)ە. بەو پێیەی ئەوەش دەزانین کە دابڕانێکی چۆنێتی هەیە لە مێژووی گەشەسەندنی سۆسیۆلۆژیای نوێ‌دا ڕویداوە، بێگومان مەبەستم ئەو دابڕانەیە کە مارکسیەت نوێنەرایەتی دەکات. داهێنانی مارکسی هەڵدەستێت بە دۆزینەوەی لێکێشانی کاڵایی کە ئەمەش دۆزینەوەیەکی دوولایەنەیە. وەئەمە لایەکەو دۆزینەوەی نهێنیِ هێزی شاراوەیە کە سیستمی سەرمایەداری دەجولێنێت لە حەقیقەتی کارەکەیدا. لەم گۆشەیەوە ئەو دۆزینەوەیە بەرەو گونجاندنی ناوەڕۆکی (بابەتی) ئەو یاسایانە دەڕوات کە ڕوخساریانە حوکمی ڕێوڕەسمی ئەم سیستمە و پەی بردنی سیمای مێژوویی ڕێژەییەکەی و ئەو هۆکارو میکانیزمانە دەکات کەوای لێدەکات کار بکات وەک ئەوەی کە (هێزی بابەتی) سەربەخۆیی لە ئیرادەی خەڵک وەلەلایەکی ترەوە دۆزینەوەی نهێنیِ میکانیزمەکانی ئایدۆلۆژیای بۆرژوازیە، بەواتایەکی تر ئەم دۆزینەوەیە ڕێگەمان پێدەدات بەپەی

بردن بە چۆنیەتی کاری ئەم ئایدۆلۆژیایە لەپێناو دەمامک کردنی ڕاستی یاسا بابەتیەکان تاوەکو سیمایەکی (هەمیشەیی) سەربەخۆی لەو بارودۆخە مێژوویی‌یە بداتێ کەئەم لە ژێر سایەیدا کار دەکات. لە شوێنەکانی تردا لە شیکردنەوەی ئەم دۆزینەوەیە دوولایەنیەدا ئەو ناوەڕۆکەم گەیاند کە ناوەڕۆکی داهێنانی مارکسی دەنوێنێت لە ڕای مندا، وەناگەڕێمەوە سەری. بەوپێیەی کە دەرئەنجامی هەیە شایانی ئاماژە پێدانە ئەویش ئەوەیە کە ئەم داهێنانە یەکێتی گێڕایەوە بۆ بیری کۆمەلایەتی. وەئاماژە دانم لەم بارەدا پێش کەوت بۆ ئەوەی کە بە (ئابووری مارکسی) ناودەبرێت بەڵکو ئەوە لە واقعی کارەکەیدا دەربڕینێکی کورت و کراوەیە (وەلەدواییدا نائاشکرایە) لە شتێکی تر، مەبەستم لەوەیە کە مارکسیەت زانستی (ئابووری) بەڕاستی پێشکەش نەکردووە تاوەکو جێگەی زانستە هەڵەکەی پێشوو بگرێتەوە، وەمارکسیەت کەمو کوڕیەکانی ڕاست کردبێتەوە. بەڵکو ڕەخنەیەکی پێشکەش کرد بۆ زانستی ئابووری بەواتای ئاشکراکردنی بارو دۆخە ئەبستیمۆلۆژیەکەی. ئەمەو وە ماتریالیزمی مێژوویی کە ئەم داهێنانەی پێشکەش کردووە واتای ئەوە نیە کە بە تایبەت بووەتە کار (بووەتە زانستێکی کۆتایی دوورو پارێزراو لە هەڵە!) نەخێر. ئەم دابڕانە هیچ ناتوانێت جگە لە هەنگاوێکی بەکەمی کەدەرچەیەکی بڕبێت لەسەر ئەو ئاسۆیانە بکرێتەوە کە-لە پێشدا داخرابوون. لێرەدا دەمەوێ کە ئاماژە بە ئیشکالیەتێکی دیاریکراو بدەم لەنێوان ئەو ئیشکالیەتە هەمە چەشنانەدا کە میتۆدی داهێنانی مارکسی هێناویەتیە ناوەوە. مەبەستم ئاشکرا کردنی ڕەهەندیەکی تری ئایدۆلۆژیای سۆسیۆلۆژیای باوە ودئەمەش ڕەهەندی ئەوروپی‌یە چەقبەستووەکەیەتی ئەمەش بابەتێکە لە شوێنێکی تردا بەدرێژی چوومەتە سەری.

جگە لەوەی کە (مارکسیەتی ئامادەبوو)- کەوەک دیاردەیەک مێژووی هەبێت- لە چوارچێوەی گەشەسەندنیدا (تێکست)و دانراوی وای وەبەر هێناوە کەپێی دەگوترێت (کلاسیکی) یا (مەرجەعی). گومانی تێدانیە کە بوونی ئەم تێکستانە مومارەسە ڕاوەستاودکانیشی لەسەر ئیجتهاد هانداوە لە چوارچێوەی خۆیدا. ڕێگر لەمە دانیە وە ئەم تەموژە لەسەر ئەم مومارەسانە نیە. مارکسیەت خۆشی جێگەی دیراسەیەکی زانستی شیاوە، کاروباری خۆیەتی کە تیشکێک بخاتە سەر ناوەڕۆکی چەمکەکانی و ئەوسیاقەی کە تیایدا وەبەر هاتووە، وەبەو پێیەی کە ماتریالیزمی مێژوویی هاو واتای مانەوە نیە لەم چوارچێوەیەدا. بەڵکو ئیجتهاد دەگۆڕێت بۆ- دۆگمایەتێکی سیما قوتابخانەیی- کاتێ لێکۆڵەرەوە پەنا دەباتە بەر دەقێک تاوەکو جێگە تیبینی‌یکانی واقعی پێ‌بگرێتەوە. وەهەمو دەزانن کە ئەم گۆڕانە شیاوە. بەلو ڕەنگە بێتە باو لە ڕەوتە (مارکسیە ئامادەبووە حەقیقیەکاندا). دەڵێم کە ئەم تێگەیشتنە بۆ مارکسیەت خیانەت لە میتۆدی مارکسی خۆشی دەکات وەلە دواییدا ئەم مارکسیەتە پلە دارە بە مارکسیەتێکی شۆڕشگێر نازمێردرێت. سەرەڕای گشت شتێک، جیاوازیەکی بنەڕەتی دەمێنێت لەنێوان بەردەوامی مومارەساتی ئیجتهاد دا جائەگەر لە چوارچێوەی سۆسیۆلۆژیای بۆرجوازی دابێ یا لە چوارچێوەی مارکسی‌دابێ وەلەنێوان بالا

دەستی ئیجتهاد لەبیری کۆمەلایەتی پێش وەخت لەسەر ڕێنسانس، ئیجتهاد لەبیری کۆندا میتۆدێکی دارێژراو نەبوو بەتەنها، بەڵکو ئەو میتۆدە زۆرەملێیە بووە کە دەسەلاتدارێتی بیری ئایینی دای دەڕێژێ، بەلام بیری کۆمەلایەتی نوێ لە بنەمادا ڕازی نابێت بەتەواو بوون بە ئیجتهاد وە بەهایەکی سەرکەوتوو بەداهێنانەوە هەڵدەواسێ.

٤- لەسەر ئەوە کە لە پێشدا خستمانە ڕوو لە چەمکی ئیجتهاد و داهێنان ئێستا دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ بابەتی تەڵەزگەی بیری هاوچەرخ.

بەکورتی: وای دەبینم کەبیری عەرەبی هاوچەرخ تا ئێستا گواستنەوە (بازدان)ێکی چوونیتی پێویستی وەبەر هێناوە بۆ چوونە ناو چاخەوە وەبەشداری کردن لە بەرهەمهێنانی سۆسیۆلۆژیایەکی ئاسۆ جیهانی‌دا وەلەسەر ئاستی بەرهەڵستیەکی مێژوویی، ئەو کارەی کە ترسناکیەکی گەورەو تۆقێنەری لەسەر ڕێک دەخرێت ئەوەی کە ترسناکی (بەپەراوێزکردنی) عەرەبە لە وەبەرهێنانی ئایندەیەکی مرۆڤانە. تائێستا بیری عەرەبی لە چاخی بالا دەستی غەیب (نادیار) نەچۆتە دەرەوە لەسەر هەریەک لەبیری فەلسەفی و بیری کۆمەلایەتی، وەلەدواییدا ئەوە بیرێکە کەبەردەوام لەسەر قۆرخ کردنی میتۆدی ئیجتهاد- لە باشترین بارودۆخدا هەڵدەستێت. بەڵکو زیاتر لەمە دەڵێم، کە میتۆدی ئیجتهاد خۆیشی مومارەسە ناکرێت لەبیری عەرەبی هاوچەرخدا بەهەمان پلەی ئازایەتی و سەربەستی کە لە چاخەکانی گەشەکردنی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامیدا مومارەسە دەکرا، ئاکامی (داخستنی دەرگای ئیجتهاد) لە بواری ئایین داو وەپەسەندکردنی ئەم بارودۆخە لەلایەن ڕەوتە فکرییە ئیسلامیە هاوچەرخەکانەوە. لە دەقی بیری ئیسلامی هاوچەرخدا نێو لێکدانەوەی دەقەکان گەڕایەوە لەسەر تیشکی پێویستییەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵگا. ئەم بیرە هەستان بە (شۆرشێکی ڕۆشنبیری) ڕەت دەکاتەوە لە چوارچێوەی بیری ئایینی خۆیدا، لەسەر ئەوەوە کە ڕوویدا کاتێک نێولێکدانەوەی مەسیحیەت گێردرایەوە لە ڕۆژئاوادا تاوای لێبکرێ بگونجێنت لەگەڵ پێویستیەکانی گەشەسەندنی سەرمایەداریدا... ڕەنگە بیری ئیسلامی هاوچەرخ پەی بردە نەبێت بە ئەم پێویستییە! بێگومان لێرەدا مەبەستم بیری باوە. لە کاتێکدا کە هەلاوێردن هەیە بۆنموونە وەک دانراوەکانی (محمد سعيد العشماوي) کە بانگهێشتی نوێبوونەوەی نێو لێکدانەوە دەکات بۆ ئەوەی بوارێک بکاتەوە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی عیلمانی وەبۆ دابڕانی ئایین لە دەوڵەت تیایدا. لەوباوەڕەدام کە گرنگییەتی ئەم هەلاوێردنانە- دەڵێم هەلاوێردن بەواتای ئەوەی کە کاریگەرێتی بەردەوام لەسەر گرووپێکی بچوک لە ڕۆشنبیران بەبێ جەماوەر کورت دەکرێتەوە- دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئاماژە بە ئاقاری داوکراو دەدات. بابەتیانە بۆ دەرچوون لەم تەڵەزگەیەی ئێستا.

وەئەگەر بیری ئیسلامی باو پەی بردە نەبێت بە پێویستییەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەی کارە واقعیەکان- مەبەستم بالا دەستی نموونە سەرمایەداریەکانە، بتەوێ و نەتەوێت. وەئاستەمێتی گەڕانەوە بۆ (پێش سەرمایەداری) (ئەوا هەر هەوڵێک لەم ئاقارەدا بە (ئینتیحارێکی کۆمەڵی)

نەبێت ناژمێزدرێت )- لەسەرەتادا ئەو تواناداری نیە بۆ بەشداری کردن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی پێویستی‌یەکانی کۆمەڵگای سۆشیالیزمی زیاتر پێشکەوتوو. لەبەر ئەمە، دەڵێم کە ( ڕابوونێکی ئیسلامی لاف لێدراوە ) شایەنی ئەم ناولێنانەنیە، ئەوە ڕابوون نیە بەڵکو شەپۆلێکە دەمۆنرێتەوە لە بەردەوامێتی دەسەلاتدارێتی بیری چاخەکانی داتەپین کە پێش غەزوی سەرمایەداری کەوت.

وەئەم پەرەسەندنە ناخۆش و ئازاراویانە لە هەمان سەردەمی مێژوودا ڕوویان‌دا کە لە شوێنەکانی تردا بە پێشکەوتن لە بواری داهێنانی کۆمەلایەتی و عیلمانی و ئیجتهادی داهێنەر لە نێو لێکدانەوەی ئاییندا جیادەکرێتەوە.

لەپشت ئەم ڕستەیەی کۆتایی‌یەوە مەبەستم لە دو کۆمەڵە دیاردەیە. لەلایەکەوە مەبەستم بەجێهێنانەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی و نوێگەرییە کە ئیلهامی بە مارکسیزم دا. بەتەواوی دەزانم کە ئەم بەجێهێنانە هەنگاو یەکەمی زیاتر نانوێنێت، سەرەڕای وتەی بڵاو کە دەچێت بۆ گۆڕینی بۆ دۆگمایەتێکی ( کۆتایی )، لەسەر ئەوەی ئەم کۆمەڵگایانە بەتەواوی گواستنەوەیەکی چۆنێتیان جێ‌بەجێ کردووە کەئەگەری بەردەوام بوونی پێشکەوتنی لە دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆکێشەکانی دابین دەکات. وەمەبەستم لە لایەنەکەی تر ئەوەیە کە ( هەندێ کۆمەڵگای مەسیحی لە جیهانی سێ‌هەمدا )( لە ئەمەریکای لاتینی بە سیفەتێکی تایبەت ) دەستی کردووە بە وەبەر هێنانی شۆڕشی ڕۆشنبیری سێ‌هەم لەنێو لێکدانەوەی ئایینی‌دا. بەجۆرێک دەتوانرێت گونجاندن بەدی بهێنرێت لە نێوان باوەڕ و لەنێوان پێداویستیەکانی دامەزراندنی کۆمەڵگای سۆشیالیزمی. وەبێ‌گومان ئەو نێو لێکدانەوەیەی کە ( لاهوتی ڕزگار بوون ) پێشکەش دەکات جێ‌بەجێ دەبێت- وەئەمەش بەم ناوەناسراوە- لە ڕێگای مێتۆدێکی ئیجتهادیەوە بە سروشتی کارەکە. دەنا دەڕوات بەرەو سەرکەوتنی باوەڕو پێویستی‌یەکانی عەقڵی ئایندەی سۆشیالیزمی. وەنمونەیەکی هاوشێوە نابینم لە چوارچێوەی ( ڕابوونێکی ئیسلامی لاف لێدراودا ) هەموو ئەوەی جێ‌بەجێ بوو ناوێتەیەک بوو لە جەخت کردنی سروتی شێوەیی وە ئالۆزی لە وەلامدانەوەدا لەسەر ئەو کێشانەی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان ڕووبەڕووی دەبێتەوە، وەلە کۆتایی ڕێگەکەدا- مەزهەب کۆبوونەوە لە نێوان دەسەلاتدارێتی بیری ئایینی وەستاو و لەنێوان چۆک دادان بۆ پێداویستیەکانی بەردەوامی بالا دەستی ئیستعماری ڕۆژئاوایی دەکات! بانکە ئیسلامیەکان نموونەیەک بۆ ئەم کۆکردنەوەیە لە بواری ئابووری‌دا دەنوێنن، وەک چۆن حوکمی باو بەناوی ئایینەوە ڕێکخرا. لە پاکستان‌و وەئەوانی تر لە ولاتەکانی جیهانی ئیسلامی هاوچەرخ کە چەند نموونەیەک لەبواری سیاسەتدا دەنوێنن.

سەرچاوە:

( الاجتهاد والابداع في الثقافة العربية ) بەشێکە لە کتێبی ( بعض قضايا المستقبل ) ل ١٢٩ بۆ ١٥٠- د. سمير امين- دار الفارابي/ بيروت/ طبعة ١٩٩٠.

# نوێکردنەوەی عەقڵی ئیسلامی

نوسینی: محمد سعيد عشماوي
وەرگێڕانی: پێشواز سەعدوڵلا

لە خراپترین ئەو دەردانەی کە تووشی عەقڵی ئیسلامی بووە، ئەو دوولایەنیە زۆرەیە کەلە ناخیدایە و کارەکانی تێکەڵ کردوە وای لێکردووە دابەش بێت لەناو خۆیدا، دووره لەڕاستییەکان، دەستەوەستاوە لەبەردەم تێگەیشتنی واقیع دا. شتێک دەڵێت و شتێکی تر دەکات، وێنای شتێک دەکات کە لەڕاستی دا بوونی نیە، وەبەلای زیادەڕۆیی و گشتگیردا دایدەتاشێت. دەکەوێتە دوژمن کاریەوە لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە داوای چاک کردنی لێدەکەن و دەگەڕێن بەدوای چارەسەرێکدا بۆی.

لەگرنگترین ئەو شتانەی کە لەئەنجامی ئەم دوولایەنیەی عەقڵی ئیسلامی دێتە بەرهەم؛ بێتوانایی ئەم عەقڵەیە لەبینینی دەردەکەی وە خەملاندنی هۆکارەکانیو گەیشتن بەچارەسەرێک.

ڕوودەدات هەندێ لە نووسەران درک بەو دەردەی عەقڵی ئیسلامی بکەن وەهەروەها بەپێویستی کارکردن بۆ نوێ کردنەوەشی. بەلام ئەوانیش (کە دووچاری هەمان دەرد بوون) ناتوانن چارەسەرێکی یەکلا کەرەوەی بۆ دابنێن، هەر بۆیە بە چوار دەوری بێژەکاندا (الالفاظ) دەسوڕێنەوە و ناگەنە دەست نیشانکردن و دۆزینەوەی ڕاستی دەردەکە وەناگاتە نوێ کردنەوەیەکی ڕاستەقینە. نوێ کردنەوەی عەقڵی ئیسلامی تەنها بەحەزەرێک یاخود ئاوات خواستن یان دووبارە کردنەوەی قسەو وتراوەکان نابێت، بەڵکو بۆ گەیشتن بەم نوێ کردنەوەیە پێویستە ڕێبازێکی زانستی ڕوون دابنرێت کە لە دوو تەوەرە پێک دێت.

یەکەمیان: پەیوەندی بەبابەتی عەقڵی ئیسلامییەوە.

دووەمیان: پەیوەستە بە شێواز (میکانیزمی) کاری ئەم عەقڵەوە.

## بابەتی عەقڵی ئیسلامی

بابەتی عەقڵی ئیسلامی لە بنەڕەتدا بریتییە لە: قورئان، حەدیث، کتێبەکانی کەلەپوور وەگرنگترینیان کتێبی [(احياء علوم الدين) لأبي حامد الغزالي]. ئەم چوار پێکهاتەیە دەتوانرێت کورت بکرێتەوە بۆ دووان کە قورئان و حەدیثە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە (١٤) سەدە بەسەر سەرەتای ئیسلامدا تێپەڕیوە، کە چی هێشتا عەقڵی ئیسلامی ڕێبازێکی ڕوون و دیاریکراوی بۆ پێناسەکردنی بێژەکان لە قورئانداو ڕاڤەکردنی ئایەتەکان دانەڕشتووە، وەهیچی نەکردووە بۆ دەرخستنی (الناسخ و المنسوخ)[1] لەم ئایەتانەدا، یاخود بۆ سیستەمی کارنەکردن بەهەندێ لە حوکمەکان. لەلایەکی تریشەوە، ڕێبازێکی عەقڵی (واتە غیر نقلی)[2] بۆ هەڵسەنگاندنی حەدیثەکان و دەرخستنی هەمیشەیی و کاتی تیایاندا دانەناوە.

لەسەر بناغەی ئەم کەم و کورتی‌یە کە لە گرنگترین هۆکارەکانی دەردەداربوونی عەقڵی ئیسلامی‌یە، نوێکردنەوەی ئەم عەقڵەیە بە داڕشتنی ڕێبازێکی زانستی ڕوون و دیاریکراو دەبێت بۆ ئەو مەسەلانەی کە پێشتر باس کران.

یەکەم: دیاری کردنی مانای بێژەکان (الالفاظ) لە قورئاندا.

لەگەڵ بوونی جیاوازی لەووتنی هەندێ بێژە یان جیاوازی لە پێکهاتنی هەندێکی تر، هێشتا بێژەکانی قورئان پێناسەیەکی‌یان بۆ نەکراوە کە ڕێگر بێت لەهەر دەست تێوەردانێک. بەمەش وای لێهاتووە هەرکەس بێژەکانی قورئان بەپێی تێگەیشتن و هەڵسەنگاندن و ڕۆشنبیریێ خۆی ڕاڤە بکات، وەهەندێ جاریش بەپێی ئەوەی کە خۆی بەدروستی دەزانێ.

لەلایەکی ترەوە، مەدلولی هەندێ بێژە بەدرێژایی مێژوو لە گۆڕاندا بووە هەتا وای لێهاتووە کە بێژەکە مانایەکی بنچینەیی هەبێت کە لە کاتی هاتنە خوارەوەدا گەیاندوویەتی، وەمانایەکی مێژووی کە بە تێپەڕبوونی کات وەری گرتووە، کەلەوانەیە دوریش بێت لەمانا بنچینەییەکەیەوە. وەئەم گۆڕانە ترسناکە هەموو بێژەکانی قورئانی گرتۆتەووە وەک بێژەکانی: شەریعە، حوکم، نەتەوە، خەڵک، کفر، زکری خوا، شەریک پەیداکردن، قورئان، ئەوانەی کە دەزانن (العالمون)، باوەڕ، ئیسلام و چەندانی تریش.ئەم شڵۆق بوونە لەنێوان مانا بنچینەیی بێژەو مانا مێژووییەکەی لەلایەن عەقڵی ئیسلامی‌یەوە یەکلا نەکراوەتەوە، بەڵکو تەنانەت لایشی لێ نەکراوەتەوە لەگەڵ گرنگی‌یە زۆرەکەشی‌دا.

دەبێت ڕاڤەکردنی بێژەکان لەسەر چ ڕێبازێک بێت؟ ئایا دەقاودەق بەپێی ئەو مانایەی کە لەکاتی هاتنە خوارەوەیدا هەیبووە یان بەپێی ئەو مانایەی کە لە مێژوودا

---

[1] سڕینەوە حوکم یاخود مانا و کاریگەری ئایەتێک بەئایەتێکی تر کە بەدوای دا هاتووە لە قورئاندا. بەئایەتە لەکار خەرەکە دەوترێت (الناسخ) وە بەلەکار خراوەکە (المنسوخ).

[2] (عقلی، نقلی): لەبیری ئیسلامیدا دوو جۆر سەرچاوە هەیە بۆ زانیاری یەکەمیان (نقلی) کە بریتی‌یە لە دەقی ئایەت و حەدیث وە دووەمیان عەقلی کە بریتی‌یە لە ئیجتهاد و ڕاڤەکردن. (و: کوردی)

پەیدای کردووە؟! ئەو ڕێبازەی کە ڕاڤەی بێژەی قورئانی پێ دەکرێت ئەبێتە هۆی گۆڕینێکی تەواوی ماناکانی قورئان و گۆڕینێکی تەواوەتی بۆ حوکمەکانی. یاخود، ڕاڤەکردنە کە لەڕێگە دەرکردنێکی بێژەیە لە مانا بنچینەییەکەی یان بەدورخستنەوەی واتا بنچینەییەکەی خۆی لێی. بێژەی شەریعەی لە قورئاندا بەواتای ڕێباز. ڕێگا یان ڕێگە دێت (ثم جعلناك علی شریعة من الامر فأتبعها) (سورة الجاثیة ٤٤:١٨) (لکل جعلنا منکم شرعة و منهاجاً) (سورة المائدة ٤٤:٥)، بەلام بێژەکە پەرەی سەندووە لەگەل مێژوودا تا وای لێهاتووە بەواتای (الفقه)یش بێت. تێگەیشتنی واتای بێژەی شەریعە. بەپێی کاتی هاتنە خوارەوە بەواتای (دانانی بەرێگای خودا و ڕێگا بۆ گەیشتن پێی) هاتووە، بەلام تێگەیشتنی بەپێی پەرەسەندنی مێژوویی وای دادەنێ کە (فقه)- کە بریتییە لە بیروڕای خەلک- شەریعەیە وە شەریعەش ئاینە.وەبەم شێوە بیروڕای (فقهاء) بەرگێکی پیرۆزی بەبەردا دەکرێت و وادادەنرێت کە هەرگیز جێگای هەلە کردن نیە و دەبێتە شەریعە، ناکرێت بەرەنگاری بکرێت و لەگەلیدا نەیەیتەوە ئەگینا بەشەریک بۆ خوا پەیداکردن و تەجدیف (التجدیف)* دەدرێتە قەلەم.

بێژەی حوکمی سیاسی لە قورئاندا مانای سیستەمی حوکمی سیاسی یاخود سیاسەت کردن لەکارو باری خەلک دا نایەت. بەلکو بەمانای دادکردن لە ناکۆکیەکاندا دێت وەهەروەها بەمانای کاملی و داناییش (وإذا حکمتم بین الناس أن تحکموا بالعدل) (سورة النساء ٤:٥٨)، (ان الله یحکم بینهم فیما هم فیه یختلفون) (سورة الزمر ٣:٣٥)، (ولما بلغ أشده آتیناه حکماً وعلماً) (سورة یوسف١٢:١٣)، (ففرت منکم لما خفتم فوهب لي ربي حکماً وجعلني من المرسلین) (سورة الشعراء ٢١:٢٦) لە قورئاندا بەبێژەی (الامر) گوزارشت لە دەسەلات و سیاسەت دەکرێت (وشاورهم في الامر) (سورة آل عمران ٣:١٥٤)بەم شێوەیە بەکارهێنانی بێژەی حوکم بەواتای حوکمی سیاسی. گۆڕینێکی واتاکانی قورئانە و ئالوگۆڕکردنی مەبەستی خودایە لەناردنە خوارەوەدا. ئەمە زۆر بەو ئاشکرا لەو ئایەتەدا دەردەکەوێت کە هەندێ لە گروپەکان بەرزی دەکەنەوە وەک دروشمێک (ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون) (سورة المائدة ٥:٤٤). ئەو گروپانە مەبەستیان لە بێژەی حوکم واتای حوکمی سیاسییە لە کاتێکدا بێژەکە لەڕاستیدا بە واتای (نەهێشتنی ناکۆکیەکان) دێت. وەدەرئەنجامی ئەم تێکەلکردنە، ئەو گروپانە کۆمەلگاکان و حکومەتەکان بە کافر لەقەلەم دەدەن، بەپێی ئایەتێک کە قورئان بەرەهایی ئەو مەبەستەی نەبووە لەکاتی هاتنە خوارەوەدا، بەلکو ئایەتەکە بەکارهاتووە بەو ڕاڤەکردنەوە کەپێی بەخشراوە لەپەرەسەندنی مێژووییدا نەک لەواتا

---

* قسەکردن سەبارەت بە خودا بەکفر و سوکایەتی پێکردن (و: کوردی)

بنچینەییەکەی کە لەکاتی هاتنە خوارەوەدا مەبەستی بووە. وەبەهەمان شێوە بۆ هەموو ئەو بێژانەی کە لەو جۆرەن.

بێـژەی ( الامـة ) لـە زمـانی قورئـاندا بـەواتای کۆمـەڵێک خـەڵک ( Community ) دێـت ئەوەک بەمانای نەتەوە بەواتا سیاسی‌یەکەی ( Nation ) وەبێژەی ( الناس ) واتـە خـەڵکی مەککە. ئەوەک سەرجەم خەڵک لە جیهاندا.

دووەم: ڕێبازی ڕاڤەکردنی قورئان.

عومەری کوڕی خەطاب ڕۆژێک بیری دەکردەوە و پرسیاری کرد ئایا چۆن ئۆمـەتی ئیسلام جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە کە پێغەمبەرەکەیان و خێڵەکەیان یەک بێت. عبد ا لله کوڕی عباس ( کوڕی مامی پێغەمبەر ) پێی ووت: قورئانمـان بـۆ نێردرایـە خـوارێ، خوێندمانەوە و زانیمان بۆچـی هاتۆتـە خـوارێ، لـەدوای ئێمـە خـەڵکانێک دەبـن قورئـان دەخوێننەوە و نازانن بۆچی هاتۆتە خوارێ، بۆیە بیروڕای خۆیان دەبێت لەسەری، پاشان جیاواز دەبن لەبیر و باوەڕەکانیـاندا، پاشـان یـەکتری دەکـوژن لەسـەر ئـەوەی لەسـەری ناکۆکن. ئەم ڕێبازەی عبد ا لله کوڕی عباس باوەڕی پێبـووە، وەئەسـحابەکان لەسـەری ڕۆیشـتوون لەسـەرەتای ئیسـلامدا، ڕێبـازی ڕاڤـەکردنی ئایەتـەکانی قورئانـە بـەپێی هۆیەکانی هاتنە خوارەوەکەی. هۆیەکانی هاتنە خـولرەوە ( أسباب التنزيل ) ئەوەیـە کـە دەتوانین بـە زمـانی یاسـایی سـەرەدەم پـێی بڵێـین- کـارە ئامادەکارییـەکانی یاسـا- ( الأعمال التحضيرية للقانون ). ئەگەر بێتو ئەم کارانە پەیوەست بن بەخستنە ڕووی هـۆی دانـانی دەقـی یاسـایی، ودبـارو دۆخـی دانانەکـەی، وەئەوانـەی کـە لەبارەیـەوە پێشـنیار کراون. وە ئەو ڕاست کردنەوانـەی کـە تیـایدا کـراوە هـەتاکو گەیشـتۆتە ئـەو شـێوەیەی ئێسـتای ئـەگەر کارە ئامادەکارییەکان پەیوەست بێت بە هەموو ئەمانـەوە وە نـاکرێت لـە دەقی یاسایی بگەین و کاری پێبکەین بـە شـێوەیەکی دروست بـەبێ ئەمانـە. بەهـەمان شێوە هۆیەکانی هاتنە خولرەوە وەک کارە ئامادەکارییەکانی دەقی یاسای وەهایە. ئـەم هۆیانـەی هاتنـە خـوارەوە پێویسـترن لـە ڕاڤـەکردنی ئایەتـەکانی قورئـاندا وەک لـە پێویسـتی کارەکـان بـۆ ڕاڤـەکردنی دەقـەکان. هەڵـە لـە کـارپێکردنی دەقـی یاسـاییدا شـتێکی شـیاوە ڕوودەدات بـەڵام هەڵـە کـردن لـە کـارکردندا بـە ئایەتـەکانی قورئـان یـان حوکمێکـی شـەرعی دەمانگەیەنێتـە دەرەئەنجامێکی زۆر ترسـناک. ئـەم دەرئەنجامـە هەڵەیەش پارێزراو دەبێت لـە ئانـە و تەشـەر و نـاکرێت زەفـەری پێببرێ بـەبێ ئـەوەی خۆمان توشی ترسناکی گەورە بکـەین.گۆڕینـی ڕێبـازی ڕاست و دروست لـە ڕاڤـەکردنی ئایەتەکانی قورئاندا لەسەردەمی ( خەوارج )ەکاندا دەسـتی پێکرد. خەوارجـەکان بـوون کەئایەتی ( ومـن لم يحكـم بما أنـزل الله فـأولئك هـم الكـافرون ) یـان بـەکار هێنـا بـەپێی سـەرەتاپای بێژەکـانی، ئـەوەک بەتایبەت مەندییـەکانی هۆیـەکانی هاتنـە خـولردەوە.

وەپاشان کۆمەڵگای ئیسلامی یەکەمیان تاوانبارکرد بە کفر، وەخوێن و پارەو نامووسی موسڵمانەکانیان حەڵاڵ کرد. بەپێی ڕاڤەکردنەکەی خۆیان، واتە بەپێی ئەوەی کە خۆیان بەبنچینەیەکی ڕەوایان دادەنا. لەم بارەیەوە عبد الله کوڕی عومەر سەبارەت بەوان وتوویەتی کە ئەوان شەڕانگێزترین خەڵکن وە ئەوان بەرەو چەند ئایەتێک چوون کەبۆ بێباوەڕەکان نێردرابوو ئەوان وایان لێکرد کە بۆ باوەڕدارەکان بگونجێت.

هۆیەکانی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون) وەهایە کە تایبەتە بەهەندێ لە یەهودیەکانی مەدینە کە ویستیان لابدەن لەحوکمی تەورات سەبارەت بە بەردبارنکردنی ژن و پیاو کە جنسی ناشەرعیان کردبێت (الزانية و الزاني) وەجێبەجێ نەکردن یاخود کارنەکردن بەو حوکمە. ئایەتەکە مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر ئەو یەهودیانە لە بارودۆخی ڕوودانی دیاردەی جنس کردن دا ژن و پیاوەکە بەردباران نەکەن وەکو چۆن خودا لەتەوراتدا ناردویەتیە خوارێ بەو پێیە نکوڵی لە حوکمی خودا دەکەن لە ڕووداوەکەدا.

وەکاتێ خەوارجەکان بەم شێوە تەواوە تێنەگەیشتن لە ئایەتەکە، بەشێوەیەکی گشتگیر ڕاڤەیان کرد. واتای بێژەی (حكم)یان ئاوەژوو کرد، بەو شێوەیەی کە باسمان کرد وایان دانا کە حوکمێکی گشتییەو بۆ هەموو باوەڕدارەکان دەبێت. لەدوای خەوارجەکان خەوارجی تر هاتن کە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامن لەسەر ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە کە زۆر ترسناکە.

لەسەدەکانی دابەزینی ئاستی عەقڵدا، (فقه)ی ئیسلامی شێوازی خەوارجەکانی پەسەند کرد لە ڕاڤەکردنی ئایەتەکاندا وە ڕێسایەکی گشتی دارێشت بۆ ڕاڤەکردنی ئایەتەکان ئەویش (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) وەئەم ڕێسا هەڵەیە دەبێتە هۆی ڕاڤەکردنی قورئان دوور لەوەی کە ناردنەخوارەوە مەبەستی بووە، وەلادانێکیشە لە وتارە ڕاستەقینەکانی، ئەمە بێجگە لەوەی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی چەند ناکۆکییەکی زۆر لە ڕاڤەکردنی قورئاندا. بۆ نمونە لە قورئاندا ئایەتێک هەیە دەڵێت (يابني إسرائيل أذكروا نعمتي التي أنعمت عليكم وأني فضلتكم على العالمين) (سورة البقرة ٢:٤١). وەئایەتێکی تیادایە دەڵێت (فيما نقضهم ميثاقهم لعناهم وجعلنا قلوبهم قاسية) (سورة المائدة ٥:١٣). ئەگەر هەردوو ئایەتەکە بەگشتی بێژەکانیان ڕاڤە بکرێت مانای ئەوەیە کە (بني إسرائيل) بە چاکترین دەزانێت لەلای خودا لەچاو هەموو مرۆڤدا بەرەهایی، ودلەهەمان کاتدا نەعلەتیان لێکراوە. بەڵام ڕاڤەکردنی ئایەتەکان بەپێی تایبەتی هۆی هاتنە خوارەوە ئەوە دەردەخات ئەوانەی کە بەچاکترین دانراون یەهودەکانی (موسى)لیە وەئەوانەی نەعلەتیان لێکراوە یەهودەکانی مەدینەی ئەو کاتی سەردەمی پێغەمبەرن.

سەرەرای ئەو دەرئەنجامە ترسناکانەی کە لەم جیاوازیەی نێوان هەردوو ریساکە (راڤەکردنی ئایەتەکان بەپێی تایبەتی هۆیەکانی هاتنە خوارەوە) و (راڤەکردنی ئایەتەکان بەپێی گشتی بێژەکان) کەوتۆتەوە، جیاوازیەکەی نێوانیان بەرەوی سەندوە لەبیری ئیسلامی داو تا ئێستاش لەبرەو دایە و رازاوەتەوە بە بەرگێکی فەلسەفی و پۆشاکێکی دیالیکتیکی، ئەویش بیرۆکەی واقیعەت و مێژوویتی ئایەتەکانی قورئانە یاخود هەتاهەتایی و ئەبستراکێتی ئەو ئایەتانەیە .راڤەکردنی ئایەت بەپێی هۆی هاتنە خوارەوە مانای بەستنەوە بەباروودۆخی واقیعی و پێکهاتە مێژووییەکان دەگەیەنێت کەوای لێکرد بێتە خوارێ. هەرچی راڤەکردنیشە بەپێی گشتی بێژەکان سوودبەخشە لە دابڕکردنی ئایەتەکە لە واقیعەکەی و بڕینیەتی لە مێژوو وەدانانی بە مەسەلەیەکی ئەبستراکت وەسەروو واقیع و دەقێکی رەها و دوور لە مێژوو. جیاوازی لەنێوان ئەو دوو ئاراستەیەدا لەوانەیە بەتەواوی دوو رووی جیاواز بەئیسلام ببەخشێت. ئەم جیاوازیە تەنها جدلێکی بێژەیی یان بیردۆزەکردنێکی فەلسەفی نی‌یە بەڵکو ریبازێکی کاملە لە تێگەیشتنی قورئان و کارپێ کردنی‌دا، وەهەروەها کلیلێکی گرنگیشە بۆ کردنەوەی یاخود داخستنی دەرگاکانی نوێکردنەوە.

لەڕابردوویەکی دووردا، (معتزلة) وای بۆ چوون کە قورئان خەلق کرابێ. بەمە دەیانویست ئایەتەکانی ببەستن بەواقیعەوە. سەلەفی‌یەکان بەڕابەری (ئەحمەد بن حەنبەل) بەربەرەکانی (معتزلة)یان کرد و وتیان کە قورئان هەتاهەتاییەو خەلق نەکراوە. ئەم قسەیە مانای وایە کە قورئان لە واقیع جیا بکرێتەوە و دابڕێ لە مێژوو. لەم سەردەمەدا هەمان بیرۆکە لەبرەو دایە، لەوانەیە لەبەرهەمان ئامانجیش، لەنێوان دوو دەستەو تاقم دا کە یەکێکیان دەڵێت ئایەتەکانی قورئان مێژوویین، لەکتێکدا دووەمیان دەڵێت کە ئەم ئایەتانە هەتاهەتایین. ئەم دوو وتەیە دوو وتەن کە بەرئەنجامیان ئەو بەرئەنجامەیە کە برەوی سەند لەنێوان (معتزلة) و سەلەفی‌یەکاندا هەرچەند مانا ئەمۆ مژاوی بێت و دەرئەنجامەکان روون نەبێت.

لەهەڵسەنگاندنی راستدا، خستنەرووی ئەم جیاوازیە لە دیدگای (فقه)یەوە ئاسانتر و بەکەڵک ترە. رێسای راڤەکردنی قورئان بەپێی هۆیەکانی هاتنە خوارەوە بەردو واقیعەتی ئەو ئایەتانەی دەبات بەوە دەگیرسێتەوە کە ئەم ئایەتانە مێژوویین و پێویستە ببەسترێنەوە بەرووداوەکانەوە. ئەگەر بێت و (فقه) نزیکتر بێت لە عەقڵی ئیسلامی‌یەوە وەک لەفەلسەفە کەواتە چارەسەرکردنی مەسەلەکە بەم دیدگایە لە قوڵایی (فقه)ەوە هەڵقوڵاوە ئەم دیدەش سەرجەم ئەسحابەکان پشتگیری لێدەکەن ئەوویش کارکردنە بە راڤەکردنی ئایەتەکانی قورئان بەپێی هۆیەکانی هاتنە خوارەوە نەوەک بەپێی گشتی بێژەکانی.

سێ‌هەم: (النسخ) لەقورئاندا.

لەقورئاندا هاتووە (ما ننسخ من آية أو ننسها نأت بخير منها أو مثلها) (سورة البقرة ١٠٦:٢) بەم ئایەتە نسخ لە قورئاندا بووە بە حوکمێك. لەگەڵ گرنگی نسخ دا، لەبەر ئەوەی رەت کردنەوە حوکمێکی قورئانی‌یە لەگەڵ مانەوەی دەقەکەدا لە قورئاندا، کەچی عەقڵی ئیسلامی بیردۆزێکی روونی دیاری کراوی دانەناوە کە کۆك و تەبا بێ لەسەری. بەم پێ‌یە نسخ بووە بە دەرگایەکی فراوان کە لێیەوە هەموو ئەوانە دەچنە ژوورێ کە دەیانەوێت حوکمێك لە قورئاندا لە کار بخەن و بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئەو ئایەتە بە ئایەتێکی تر نسخ کراوە.

لەسەر ئاستێکی تر، عەقڵی ئیسلامی پێوەرێکی روونی دیاری‌کراوی تیادانیە بەوەی کە ئایا دووبارە رێکخستنەوەی بابەتێك مانای ئەوەیە کە رێکخستنە پێشینەکەی هەمان بابەت لەکار دەخرێت، یان دەشێت دوو سیستەمی قورئانی هەبێت بۆ حوکم دان بەسەر بابەتێکی دیاری‌کراودا؟!

لە قورئاندا ئایەت هەیە لەسەر سەربەستی باوەڕ (لا إكراه في الدين) (البقرة ٢:٢٥٦)، (ومن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر) (سورة الكهف ١٥:١٥)، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ گروپ هەن کە دەڵێین ئەم دوو ئایەتە نسخ کراون (واتە چیتر کاریان پێ‌ناکرێت) بەئایەتی (وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة و يكون الدين لله) (سورة البقرة ٢:١٩٣) لەگەڵ ئەوەی کە راڤەی تەندروست بەبەستنەوەی ئایەتەکە بەهۆیەکانی هاتنە خوارەوە- بۆ ئەم ئایەتە وەهایە کە مەبەست لە شەرکردن خەڵکی مەککەیە لەسەردەمی پێغەمبەردا وەئەم ئایەتە ئایەتەکانی سەربەستی باوەڕ لەکار ناخات (نسخ ناکات) کە قورئاندا ئایەتێك هەیە (إن الذين آمنوا والذين هادوا والنصارى والصابئين من آمن با لله واليوم الآخر وعمل صالحاً فلهم أجرهم عند ربهم ولاخوف عليهم ولا هم يحزنون) (سورة البقرة ٢:٦٢)، هەندێ هەیە وابانگێش دەکەن کە ئەم ئایەتە- ئەم ئایەتە دووبارەبۆتەوە لە (سورة المائدة)دا بەچەند گۆڕانێکی تر- نسخ کراوە بەئایەتی (ومن يتبع غير الاسلام ديناً فلن يقبل منه) (سورة آل عمران ٣:٨٥).

لەگەڵ ئەمەشدا، لە قورئاندا دوو سیستەم هەیە بۆ میرات گیری، یەکێکیان میرات گریە بەوەسیەت، وەدوومیان میرات گریە بە پێ‌ی سەپێنراوەکان (الفروض). ئایا سیستەمی سەپێنراوەکان سیستەمی وەسیەت لەکار دەخات، یان ئەشێت بۆ هەریەکە لەسیستەمەکان کایەی کارکردنی خۆی هەبێت، کات و شوێنی خۆی هەبێت.

ئایەتی میرات گیری بەوەسیەت (كتب عليكم إذا حضر أحدكم الموت ان يرك خيراً فالوصية للوالدين والاقربين بالمعروف حقاً علي المتقين) (سورة البقرة ٢:١٨٠). وەئایەتی تایبەت بە میرات گیری بەپێ‌ی سەپێنراوەکان (للرجال نصيب مما ترك الوالدان والاقربون

وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والاقربون مما قل منه أو كثر نصيباً مفروضاً ) ( سورة النساء ٤:٧ ) وەئایەتی ( يوصيكم الله في اولادكم للذكر مثل حظ الانثيين، فان كن نساء فوق اثنتين فلهن ثلثا ما ترك ) ( سورة النساء ٤:١١ ) وەچەند ئایەتێکی تریش.

ئایا دیاری کردنی بەش لەمیرات دا ئەوە دەگەیەنێت کە سیستەمی تایبەت بەمیرات گیری بەوەسیەت نسخ کرا بێت، وەئایا بناغەی ئەم (نسخ)ە چیە؟! نوێ کردنەوەی عەقڵی ئیسلامی پێویستی دانانی پێوەرێکی روون و دیاری کراو دەخوازێت کە لەسەری رێکەوت (واتە پیاوە ئایینیەکان )سەبارەت بە سیستەمی نسخ لە قورئاندا.

وەسەرکەوتووتر دەبێت ئەگەر نسخ لە حوکمەکانی شەریعەدا دابنرێت نەک لە حوکمە ئاینیەکاندا.

چوارەم: کارنەکردن بە هەندێ حوکم.

ئیسلامە یەکەمیەکان وەها لەپەیرەوی ( نسخ ) تێگەیشتبوون لەقورئاندا. (لەحەدیثی پێغەمبەریش دا ) کە ئەوە دەگەیەنێت کە هەندێ لە حوکمەکان لە قورئاندا بەردەوام رەها نیە.بەڵکو رێژەیی و کاتییە. ئەمەش وای لێکردن چیتر کار بەهەندێ لە حوکمەکان نەکەن کە لە قورئانیشدا نسخ نەکرابوو بەلام درکیان بەوە کرد کە واقیعی ژیان و لۆژیکی رووداوەکان تێی پەڕاندوە و چیتر ناکرێت کاری پێبکرێت وەجێبەجێ بکرێت لەدوای سەردەمێکی دیاری کراو یان لەدوای رووداوی دیاری کراو. عومەری کوڕی خەطاب. بەپێی ئەم تێگەیشتنە. حوکمی زەواجی لەززەت ( زواج المتعة )ی راگرت.هەروەها حوکمەکانی تایبەت بەبەخشینی بەشێک لە خێر و سەدەقە بە (المؤلفة قلوبهم) (بێ باوەڕەکان ) وەدابەش کردنی زەویە رزگار کراوەکان بەسەر سەربازە رزگار کەرەکاندا.

وەلەسەردەمی نوێدا پرۆژەی میسری. کۆیلەتی نەهێشت بەپێی بریارێکی دەرچوو لە ١٨٨٧/٨/٤ وەبریارێکی بالای دەرچوو لە ١٨٩٦/١/٢١. ولاتە عەرەبی و ئیسلامی‌یەکان شوێن پێی میسر کەوتن و کۆیلەیەتیان نەهێشت لەماوەی جیاجیادا وەدواهەمیان سالی ١٩٦٢ بوو. بەنەهێشتنی کۆیلەیەتی کارکردن بە حوکمی ( الجواري ) راگیرا لەگەڵ ئەوەی کە ئەم بابەتە لە ٢٥ شوێنی قورئاندا هاتووە. وەهەروەها راگرتنی کارکردن بە حوکمی سزادانی تایبەت بە کۆیلە، وەحوکمەکانی سەربەست کردنی کۆیلە.

لەگەڵ ئەمەشدا، هێشتا عەقڵی ئیسلامی نەگەیشتۆتە ئەوەی بیردۆزێکی گشتی دابرێژێت سەبارەت بەرێساکان و سیستەمەکان و حاڵەتەکانی کارنەکردن بەهەندێ لە حوکمەکانی قورئان. بەڵکو هەندێ جار ئایەوێت دان بنێت بە نەگۆرە مێژوویی و بەڵگە نەویستەکاندا. لەگەڵ ئەوەشدا دانانی بیردۆزێک سەبارەت بە (کاتێتی حوکمەکان ) بەیەکێک لە سەرکەوتنە مەزنەکان دادەنرێت کەعەقڵی ئیسلامی پێی بچێتە بواری نوێ کردنەوەوە وە رزگاریشی دەکات لە زۆر دەمەتەقێی نەزۆک.

پێنجەم: حەدیثەکانی پێغەمبەر.

حەدیثەکانی پێغەمبەر لەسەردەمی عەباسیەکاندا کۆکرایەوە- سەردەمی تۆمار کردن- پرۆژەی کۆکردنەوە سەخت بوو وە دەرئەنجامەکانیشی نادیار بوو. (بوخاری) دووسەد هەزار ( ٢٠٠ ٠٠٠ ) حەدیثی کۆکردەوە بەڵام تەنها (٢٧٦٢) دانەیان راست بوو. وەزۆربەی ئەو حەدیثانەی کە لە حەدیثە راستەکانی بوخاریدا دانراون، لە حەدیثە راستەکانی (مسلم)دا نەهاتووە (واتە نیە). ئەمانە دوو کتێبی گرنگی حەدیثەکانی پێغەمبەرن کە دەمان گەیەنێتە ئەو رایەی کە (ئەو پێوەرەی کاری پێکراوە لە کۆکردنەوەی حەدیثەکاندا لەلای هەردووکیان پێوەرێکی زاتی بووە نەوەک پێوەرێکی بابەتی) کۆکەرەوەی حەدیثەکان کاریان لەسەر گوڵبژێرکردنی ئەوانەی کە خۆیان بەراستیان زانیوە کردووە، لە زنجیرەی گێرەوەکانی حەدیثەکان (لەفلانەوە، لەفلانەوە لەفلانەوە) کە لە رێک رەوەکانن، بەبێ ئەوەی پشت بە پێوەرێکی تر ببەسترێت بۆ هەڵسەنگاندنی راست و تەندروست لە حەدیثەکان لە رووی دەقەوە. لەگەڵ ئەوەی کە دانەرەکانی حەدیث بەبەردەوامی زنجیرەیەک لەگێرەرەوەیان بۆ حەدیث دادەنا کە بۆ گوێ گر یاخود خوێنەر وا دەکەوتە بەرچاو کە ئەم گێرەرەوانە رێک رەون، هەتاوای لێدێت حەدیثەکەی لەلا دەبێت بەراست و بروا بەگێرانەوەکە دەکات. لەبەرئەمە بوو چەند حەدیثێکی سەیر سەمەرە پەیدا بوون بەگێرانەوەی دروست وەک حەدیثی مێش، وەحەدیثی پاکژکردنەوەی برین بە مێزی حوشتر، وەحەدیثی ئەوەی کە پیسی و چەپەڵی لەباوەرەوەیە.

گرنگترین هەوڵی چاکسازی بۆ نوێ کردنەوەی عەقڵی ئیسلامی بەشێوەیەکی راست- لەبواری حەدیثەدا- ئەوەیە کە دوبارە حەدیثەکان هەڵدەسەنگێنێتەوەبەتەرازوویەکی نوێ کە پشت بەدروستی و مەعقولیەتی دەقەکە خۆی دەبەستێت، نەک لەسەر بناغەی زنجیرەی گێرەرەوەکان (کە ناسراوە بەپشت بەستن). لەگەڵ ئەمەشدا، ئەوەی کە ئێستا لەبرەو دایە سەبارەت بەکاتێتی هەندێ حوکم لە قورئاندا- وەک حوکمەکانی کویلەیەتی. زەواجی لەرزەت- بەهەمان شێوە لەبرەودایە سەبارەت بە حەدیثەکانی پێغەمبەر.

عەقڵی ئیسلامی هەوڵی داوە کە لەمەسەلەی کاتێتی هەندێ لە حەدیثەکان بکۆڵێتەوە، بەڵام ئەمەی بەجۆرێک لەووریایی و ترسەوە کردووە. لەگەڵ ئەوەی کە شتێکی سروشتیە کە زۆربەی حەدیثەکانی پێغەمبەر کاتی بن و پەیوەست بن بەسەردەمێکەوە. وەبەتایبەت ئەوانەی کە پەیوەندیان بە (رووداوەکانی کۆمەڵگا، باروودۆخی ژیان، داب و نەریتەکانی ژینگە. زانیاریەکانی مرۆڤ)ەوە هەیە لەسەردەمی پێغەمبەردا. هەندێ لە زانا ئاینیەکان وای بۆ دەچن کە پێویستی جیاکاری هەیە

لەنێوان ئەو حەدیثانەی پێغەمبەر وتونی وەک کارکردن بە فەتواو بانگێشەکردن کە پابەندن بە پەیامەکەیەوە، وەئەوانەی کە وتویەتی سەبارەت بە وەسف کردنی ئیمامێتی و سەرۆکایەتی کە مل کەچی بۆ هەڵسەنگاندنی گەل، بەپێی ئەو حەدیثەی کە دەڵێت (أنتم أعلم بشؤن دنياكم)وەهەندێ لەزانا ئاپینیەکان وای بۆ دەچن کە هەندێ حەدیث ئەوەدەگەیەنێت کە حوکمێکی کاتیە بەهەمان شێواز و بارودۆخی وتنی. لەو حەدیثانە حەدیثی (وفروا اللحى و احفوا الشوارب) کە تیایدا حساب بۆ جل و بەرگی شەریک پەیداکەرەکان کراوە لەکاتی حەدیثەکەدا وەمەبەست لە سەرپێچی کردنی ئەوانە. هەندێ حەدیث هەیە پێویست بە پێداچوونەوە دەکات بەپێی ئەو پێوەرانەی کە باس کران. لەوانە ئەو حەدیثەی کە دەڵی (تناكحوا تناسلوا فإني مباه بكم الأمم يوم القيامة) ئەم حەدیثی یەکێکە لە گەورەترین ئەو فاکتەرانەی کە دەبێتە هۆی زۆربوونی مەسلمانەکان بەڵام ئەبێتە زۆری و بۆری، لەبەر ئەوەی لەسەر بناغەی چەندایەتیە نەوەک چۆنایەتی. ئەمەش لۆژیکێکە کە ناگونجێت لەگەڵ لۆژیکی سەردەمدا، وەدەبێتە هۆی کەوتنەوەی چەند کێشە یەک کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم موسڵمانەکاندا وەنوقمی چەند کێشەیەکیان دەکات کەلە ژماردن نایەت وەکو کێشەی ژینگەیی، گەشەسەندن، ئابووری، فێرکاری.. وەچەندانی تریش.

## شێوازی (میکانیزمی) عەقڵی ئیسلامی

موسڵمانە یەکەمیەکان قسەکردن و بیر کردنەوە و هەڵس و کەوتیان بەگوێرەی سروشتی زمانی عەرەبی بووە، بەبێ ئەوەی هەوڵی دانانی شێوازێک بۆ بیر کردنەوە یان سیستەمێکی عەقڵی بدەن. وەک ئەوەی کە ئەرستۆ لەسەدەی چوارەمی پێش زایین دا کردی کاتێ کە لۆژیکی وێنەیی دانا بە ئامرازێک بۆ دیسپلین کردنی عەقڵ. عەقڵی ئیسلامی گەیشتە پلەیەکی دوور لە سەربەستی لە سەردەمی (المعتزلة)دا، لەگەڵ ئەوەی ئەمانیشی (واتە معتزلة) وزەی خۆیان بەفیرۆ داو هێزەکانی خۆیان لەکارخست لەچەند مەسەلەیەکی لاوەکی و کێشەی کاتیدا. نەلە بابەتە مرۆڤایەتیە گشتیەکانیان کۆڵیەوە نە میکانیزمی کارکردنیان دارشت وەئامرازێک کە سیماکانی هەڵگرێت. وەلە گەرانی (معتزلة) لەمەسەلە ئیسلامیەکاندا زۆر جەختیان لەسەر بیرۆکەی خولقاندنی قورئان دەکرد- جەخت کردنێکی فەلسەفی- لەگەڵ ئەوەی زۆر میانرەو بوون لەکاتی خستنە رووی مەسەلەکە لەرووی (فقهـ)وە بەپێی بیردۆزی راڤەکردنی ئایەتەکانی قورئان بەگوێرەی هۆیەکانی هاتنە خوارەوە نەک بەگوێرەی (کشت)ی بێژەکانی. ئەوەی جێگای داخە کە (معتزلة)کان- کە سوارچاکی عەقڵ بوون- هەر کە گەیشتنە حوکم لەسەردەمی خەلیفە (مأمون)دا یەکسەر پەنایان بردە بەر دەسەڵات و توندوتیژی و

زۆرلێکردن بۆ سەپاندنی بیروڕای خۆیان سەبارەت بە خولقاندنی قورئان. وەزۆر لە نەیارەکانی خۆیانیان چەوساندەوە، یەکێ لەوانیش (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)بوو. بەم کارە گوورزیان لەسەربەستی عەقڵ وەشاند، وەرێگایان خۆش کرد بۆ گۆڕینەوەی ئەوەش کە لە عەقڵی ئیسلامی مابووەوە. لەسەردەمی (متوکل)، کاتێ کە سەلەفی یەکان بەسەر (معتزلة)دا سەرکەوتن، دەستیان کرد بە لێدانی عەقڵ و لۆژیک و سەربەستی بیر. بەو پێیەی کە ئەمانە ئەو ڕێگایانەن کە دەبنە هۆی کفر و باوەڕنەبوون بەبوونی خودا و باوەڕبوون بەخولقاندنی قورئان.

(الاشعري) (ئەبو حەسەنی کوڕی ئەبو موسی ٨٧٣-٩٤١ز) دەرکەوت، باوەڕێکی تەوا و توندوتۆڵ و پتەوی هەبوو لە پابەندبوون بەکتێبی خودا (تاڕادەی دۆگما بوون) و سونەتی پێغەمبەرەکەی و ئەوەی سەبارەت بە هاوەڵەکان و شوێن کەوتووەکان و ئیمامەکانی حەدیث گێردرابووەوە. وەبەڕێزەو ئاراستەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (دوژمنی (معتزلة) کە دەیووت قورئان هەتاهەتاییە). گرنگترین شت کە مەزهەبی ئەشعەری لێ پێک دێت ئەوەیە کە خۆی دەیڵێت (خودا توانای هەموو شتێکی هەیە وەخولقێنەری هەموو شتێکە. سروشت لەلای خودا هیچ کارێکی نیە. هەرچی کردەکانی مرۆڤیشە خودا خۆی دەیان کات و لە مرۆڤدا دەیانخولقێنێ مرۆڤیش دەیان داتە پاڵ خۆی و بانگێشی ئەوە دەکات کە خۆی وەریگرتوون. عەقڵیش تەنها ئامێرێکە بۆ درک پێکردن بەڵام ناتوانێت درک بە بوونی خودا بکات). ئەشعەریەکان- واتە شوێن کەوتوانی ئەشعەری- گەیشتنە ئەو بیروڕایەی کە عەقڵ هیچ جۆرێک لەزانین ناسەپێنێت و جێگیری ناکات، وەپێویستی نەبەباشکردن و نەبەخراپ کردن نیە. وەلەسەر خودا هیچ بایەخ پێدانێک بەبەندەکانی (عبادە) پێویست نیە. وەئەرکەکان هەموویان بەڕێگەی بیستن دەسەپێنرێن نەک بەڕێگەی عەقڵ. ئەمانە هەمووی دژی ئایەتە روون و ئاشکراکانی قورئانە کە بەئاشکرا بەشان و باڵی عەقڵدا هەڵدەدات و کردویەتی بەوتەوەرەی مەسەلەکە.

لەدوای ئەشعەری، ئەبو حامد محمد غەزالی (١٠٥٩-١١١١ز)دێت. وەعەقڵی ئیسلامی بەتەواوەتی داخست. کورتەی مەزهەبەکەی- کە پابەند بێت بەبابەتەکەوە- بریتی یە لە: (وەهای بۆ دەچوو کە خودا هۆی بوونی جیهانە، خودا بەویست و توانای خۆی جیهان خەلق دەکات. وەتەنها یەک هۆکار (علیة)* هەیە، ئەویش هۆکاری بوونی ویستەر (مرید)ە، واتە خودا. هەرچی هۆکاری سروشتیشە، یاخود ئەوەی کە دەبینرێت لە بوونی پەیوەندیەکی هۆکاری بەدوایەکدا هاتوو لەنێوان دووشت دا وەک ئاگرتێ بەردان و پاشان گرگرتنی شتەکان، یان برینداریەک کە مردنی بەدوادا دێت، یان پرژاندنی ئاو کە تەڕبوونی بەدوادادێت. ئەمانە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی پەیوەندیەکی زەمانی لەنێوان دوو شت دا، وەڕوودانی شتێکی بەدوایەکدا

---

* وشەی (العلیة) وشەیەکە لەبیری فەلسەفیدا بەواتای بەدوایەکداهاتنی دووشت دێت کە یەکێکیان هۆکارە بۆ ڕوودانی ئەوەی دوای خۆی (و: کوردی).

هاتوو لەنێوانیاندا. ئەوە ئاگر نیە کە شتەکان گڕتێبەردات، وە برینداری نیە کە دەبێتە هۆی مردن، وەئاویش نیە کە شتەکان تەڕ دەکات. بەڵکو ئەمانە هەموویان ئامادەگیەکن لەزهنی خەڵکی دا بۆ ڕوودانی ئەم لەدوای ئەو، وەبکەر لەڕاستیدا، وەهۆ تەنها خودایە نەک ئەم شت یان ئەو شت. بە بڵاوبوونەوەی بیری غەزالی- وەکتێبەکەی (احیاء علوم الدین)- عەقڵی ئیسلامی بەتەواوی داخرا بیروڕا دەربڕین ریشەکێش کرا. بەڵکو بیرۆکەی سەربەستی ئیرادە بەتەواوی نەما. لۆژیکی هۆیەتی، ڕێبازی هۆکارێتی، سەربەستی ئیرادە ئەمانە هەموویان بەتەواوی لێدران. وەلایەنی عەقل و ڕێزگرتنی سەربەستی لەعەقڵی ئیسلامدا بەتەواوی نەما. عەقل ئیتر توانای ئەوەی نیە دەسەڵاتی بەسەر (فقهە)و شەریعەدا بشکێتەوە، نەتوانای تەماشاکردن وەچارەسەرکردنی هەیە، نەرێگەی پێ دەدرێت بەدوای هۆی شتەکاندا بگەڕێت، یاخود بەقووڵای هۆکاری ڕووداوەکاندا بچێتەخوارێ. یان بیەوێت کردارەکانی خۆی ڕێک بخات یان دەست بکرێت بەسەر ئیرادەی خۆیدا. یان بیر لە بەکارهێنانی شتەکان بکاتەوە لەبەرژەوەندی خۆیدا.

لەرێگای عەقلەوە لە عەقل درا، لەڕێبازی ئاینەوە ئاین ڕاگیرا. بەناوی زانستەوە زانست بەتەواوی نەما.

بەبێ لۆژیک هیچ تێگەیشتنێک نایەتە ئاراوە، بەبێ هۆیەتی (السببیة) عەقل پێک نایەت، بەنەفی کردنی هۆکارێتی (العلیة) زانستەکان کۆتاییان دێت. وەبە نەهێشتنی سەربەستی مرۆڤ وای لێدێت نزم ببێتەوە بۆ ئاستی ئاژەڵ.

لەبەر ئەمانە لۆژیک گەڕایەوە دواوە، عەقل دواکەوت، زانست پەرش و بڵاو بووەوە، وەسەربەستی لەکیس چوو، وەئیسلام دەستی کرد بە قۆناغێکی درێژ لە خەوتن وەسەدەیەکی درێژ خایەن لە خورافات!! نوێ کردنەوەی عەقڵی ئیسلامی تەنها بە نوێ کردنەوەی میکانیزمەکانی و بەسەردەم کردنی ئامرازەکانی دەبێت هەتا بتوانێت پرۆسەی بەلۆژیک کردنی شتەکان و ڕێبازاندنی زانستەکان و کارکردن بە هۆیەتی و هۆکارێتی وە ڕێزکرتن لەسەربەستی مرۆڤ پیادە بکات.

ئەمە رێگە دروستەکەیە، بەڵکو عەقڵی ئیسلامی پەیرەوی بکات، وەکاری پێ بکات وەلەسەری بڕوات.

تێبینی:

(١) وەرنەگێرانی ئایەتەکان بۆ کوردی لەبەر دوو هۆیە: (١) لەکاتی بەکوردی کردنیدا ئیشکال لەمانا دروست دەبێت. (٢) گوتاری زمانەوانی (الخطاب اللغوي) ئایاتەکان لەزمانە بنچینەییەکەی دا باشتر و ڕوونتر دەکات وەک لە کوردیدا (و: کوردی).

(٢) ئەم بابەتە لە هەفتەی ڕۆشنبیری زانکۆی دیمەشق/ بەشی فەلسەفەدا، پێش کەش کراوە، لەلایەن: ڕاوێژکار: محمد سعید عشماوی.

سەرچاوە:

گۆڤاری- النهج- ژمارە- ٤٦-ی ساڵی ١٩٩٧، لاپەرە ٢٤-٣٢.

*La Corsa del Contari*

*Eugenio Barba*

*Milano - 1981*

# کاروانی پێچەوانەکان

دەق: یۆژینیۆ باربا

وەرگێڕ: هۆزین غەریب

پێشکەشە بە: کاردۆ - سەفین- کاروان.

## بەشی یەکەم

### دەستپێکردنێک دەربارەی بێدەنگی نووسراو

بەباوەڕی خۆم وامدەزانی کە زانستی شانۆیی شتێکە دەشێت بپچڕێت و ببیتە خاوەنی. لەسەرەتادا چوومە لای یەکێک لە زیندووان. سێ‌ساڵ مامەوە، دادەنیشتم و تێبینی کاری بڕزی گرۆتۆفسکیم دەکرد، پاشان سەفەرم کرد بۆ هند و پاش ئەوە پەنام بردە بەر مردووان، بۆ پەڕاوە چاوگەکانی (Lirressources) (زانستی) شانۆ. لەسەر مێزەکەم نووسینەکانی ستانسلافسکی و مایرهۆلد و برێخت هەیە. هەروەها پەڕاوە کۆنەکانی (زیامی Zeami و ناتیا شاسترا Natya Shastra) بێ لە ئیزنیشتاین. ئەوە ئامادە کردنم بوو تا ئەو ڕۆژەی لە (ئۆدن) لەگەڵ هاوڕێکانم دەستم کرد بە کارکردن.

ئەمڕۆ هەندێک ئارەزووی کارکردن دەکەن لەگەڵم و پرسیارم لێ دەکەن سەبارەت بە کاری ئەکتەر ئایا لەبەر ئەو زانینەمە کە تیایدا بینەر یان خوێنەر بووم؟ یان بەهۆی ئەو ئەنجامانەوە کە هاوڕێ ئەکتەرەکانم پێی گەیشتوون؟

ئایا لە توانای کتێبدا هەیە وآتای ئەزموونی ساڵانێکی درێژی کارکردن بگەیەنێت؟ بۆچی لە هەندێک ڕۆشنبیریدا هەرگیز زانستە شانۆیییەکان (بڵاو نەکراونەتەوە) یان- وەک ئەوەی لەگەڵ نووسینەکانی زیامی و نووسینە تەکنیکیەکانی کۆمیدیا دیل ئارتا دا ڕووی داوە- بەسپێرراوی ماوەتەوە لە کەلەپورێکدا کە دەستاودەست گوێزراوەتەوە.

شەوێکیان لە هند گوێم لە دەنگی سترانبێژێک بوو گەیشتبووە ڕادەیەکی کاریگەری لەوەو بەر مەزەنەم نەدەکرد گەیشتنی لەتوانادا بێت، هەستم کرد خەریکە یەکێک لە نهێنییەکان دەدۆزمەوە. سەبارەت چۆنێتی مەشقی دەنگی پرسیارم لێ‌کرد وەلامی دامەوە: 30ساڵم بەسەر بردووە لەپێناو گۆرانی ووتن بەم ڕێگەیەی ئێستا گۆرانی پێ دەڵێم. تۆش لێم دەپرسی چۆن وام کردووە؟

داواکاری سەنتەری نەتەوەیی لێکۆڵینەوەی شانۆی (CNRS) پاڵیپێوەنام بۆ نووسینی ئەم وتارە کە بەشێوەیەکی تایبەتی ئەم دوو پرسیارەی لە خۆ گرتووە:

١- واتای چی‌یە لە کاتی ئێستاو لە کۆمەڵگەی هەنووکەییمان‌دا ئەکتەر بێت؟

٢- ئامادەکردنی ئەکتەر بەلای منەوە، واتای چی؟

(دەربارەی واتای کۆمەڵایەتی ئەکتەر)

نازانم من واتام چی‌یەو، سەبارەت بە ماوەی ئێستا و بەلای کۆمەڵگەکەمانەوە هاوڕێکانم واتایان چی‌یە. ئایا ئێمە خۆمان بڕیار دەدەین ئێستا واتامان چی‌یە و لە داهاتوودا واتامان چی دەبێت؟ بارووئۆخی دەوروبەر بڕیاری واتای ووشەکان دەدات وشە لە توانایدایە تەنیا ورد بێت. رەچەڵەکی ئەم یەکەیە (زاراوەیە) ئاماژەیە بۆ شتێکی جیاکراوە شتێکی یەکجاری ناشێت بگۆڕێت بە شتێکی تر.

دەشێت بڵێین واتای (کە ئەکتەر بێت) ئەوەیە کە خۆت ئازاد بکەیت ( Affran carsi ) وەلە مێژوودا چەندین نمونە هەیە کە دەشێت بۆمان دەربخەن کە ئەکتەر لەمیانەی پیشەکێیەوە بە شێوەیەکی زۆر بەرجەستە لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە خۆی ئازاد کردووە و ئازاد بوون بەواتا سایکۆلۆژیە تەماویەکەی نا. بەڵکو بەواتای (ناوچە ئازادەکان) (Zone frabche)یان (دەروازە ئازادەکان) یان رەنگە بەواتای زمانی ئازاد (Langue Franque).

رەنگە بشێت کە فەیلەسوفێک بڵێت: (ئەکتەرەکان یان هەندێک ئەکتەر) لەمیانەی کاری رۆژانەوەیانەوە بەڕێگەیەکی بەدەنی واتای نارەحەتی و تەنانەت بێزران دەبەخشن لە رازی بوون بە واقعی ماوە زەمەنیەکەیان هەڵبژاردنەکانیان، بەر لە نمایشەکانیان، جەخت دەکاتە سەر نەتوانینی تێرکردنی پێویستیەکانیان لە (ژیانی راستەقینەدا) یان ئارەزوویان بەوەی خۆیان ئەخەنە خزمەتی زەمەنەکەیانەوە)و. دەشێت لە داهاتوودا کەسێک واتاو ئەو کاریگەریە بناسێت کە (ناوچە ئازادەکان)ی ئەکتەر بەجیان هێشتووە. ئەو ئەکتەرەی پراکسیس کردنی کارێکی هەڵبژاردووە. کە بەنەمانی خۆی نامێنێت.

پاش سالانێک تەریکی لە (ئەزموونگە) من و هاوڕێکانم بۆمان دەرکەوت. لەناکاودا بۆمان دەرکەوت کە واتای ئێمە شتێکە بەلای زۆر کەسەوە گرنگە. ئەو (زۆر کەسانەی) کێن؟ چەند هەزارێکی پەرش و بڵاو لێرە و لەوێ لە وڵاتی جیاجیا باوترین تەم و مژ دەوری داون: ئاگادار بوون لەکار و مێژوومان و گرنگی‌دانێکی ئاناشکرا و کەمێک فضولو سنووری ئەم تەمومژە لەلایەن ئەوانەوە کێشرا بوو کاتێک ناومانیان دەبیست وایان دەردەخست دەمانناسن. لەم بازنە بچوکانەوە، کە ئەزموونمان هەیە لەگەڵیاندا مەحاڵە بازبدەین بۆ بازنەی گەورەتر لەوان. بۆ ئەوەی بشێت خۆمان ناو بنێین (ماوەیەکی

زەمەنی ) و (کۆمەڵگە ) و لەپێناو ئەنجام دانی ئەم بازەدا. پێویستە لەسەرمان واز بهێنین لە زەمینەی ئەزموونەکەو قسەکردن دەربارەی ئەکتەر بەشێوەیەکی گشتی. دەربارەی فۆرمێکی ئەبستراکت ئاماژەیە بۆ هەمووان ئاماژەش نی‌یە بۆکەس. واتە قسەکردن شتێکی نا کەسێتی (impersonale ) و ئەو واتای هەڵنجهێنانی تیورێک نی‌یە لە ئەزموونەکەوە بەڵکو واتای ئەنجام دانی پرۆسەیەکی تەوندوتیژی و زەوتکردنی ئەزموونەکەیە.

پاش ۱۵ ساڵ لە کاری شانۆی هێشتا هاورێکانم هەندێک جار تووشی کتوپڕیم دەکەن. سەرم سوڕماوە لەگەڕانی بەردەوام و کەللەرەقی و ئازایەتیان لە کاردا هەموو رۆژێک. لەبەیانیەوە تا ئێوارە. هەندێک جار وا دێتە بەرچاو کە کۆشمەیەکیان نایەتەبەر، وەهەندێک جار وادێتە پێش چاو یەکێک کەمتر کار دەکات لەوەی کە راهاتووە بەخۆی رلزی دەبێت یان دەکشێتە دولوە لەبەردەم ئەوەدا کە بەمەحاڵی تێدەگات. ئەوانی دی بەتورەیی دەلەرێنەوە. وەک ئەوەی کارکردنی بێ ووچانی چەندین سەعات و سەعات سەبارەت بەیەک ڕووە ئاماژە یان برگەیەکی بچوک و بەسەربردنی زۆربەی زۆری کاتمان بۆچەندین ساڵ لەدەرو بەرێک دا کەڕووبەرەکەی لەڕووبەری شانۆ کەدەرناچێت ولە (کۆمەڵگە )یەکدا کە پێک هاتووە لە ۱۵ کەس. بۆتە راهاتن. وەک ئەوەی بوبێتە سروشتێکی دووەم بۆمان.

دەشێت فەیلەسوفەکە بڵێت، هەموو ئەوە هەرگیز باش نی‌یە و هیچ کەڵکی نی‌یە. لەتوانادایە بسەلمێنی کە هەموو ئەوە شتێک زیدەڕۆیی تیادایە و بسرێتەوە وەک چۆم سیاسەتمەدارێکی گەورە دەیگۆت. نا ئەوە (تاوزەیەکی لەرادەبەدەر)و لە توانادایە بڵێت (بەراستی. ئەو ئەکتەرانە بەرادەی پێویست کارناکەن بۆ بازاڕی نمایش. ئەوان کۆمەڵگەیەکی بچوکیان پێک هێناوە پێک هاتووە لەچەند کەسێکی کەم پەیوەندی نزیک و قووڵ و ئاڵۆز دەیانبەستێت بەیەکەوە هەموو ژیانیان دا گیردەکات مەترسییەکە لێرەدا خۆی حەشارداوە چونکە ئەوان پەیوەندی خۆیان بەجیهانی دەرەکی و زەمەن و کۆمەڵگەکەیانەوە دەپچڕن ).

ددشێت فەیلەسوفەکە شتی تری جیاواز بڵێت: ئەوەی کە ئەم کۆمەڵە کەسەدەیکەن. لە جەوهەردا جیاوازنی‌یە لەوەی کە هونەرمەند ئەنجامی دەدات و ناشێت کەس لۆمەی بکات واتە وا دێتە بەرچاو کە خۆی دادەبڕێت و هەر لەبەر خودی ئەم و بەهۆی دلێری بەرهەمەکانیەوە. پاش ئەوە هەڵدەستێت بەکردار لە جیهانی دەورووبەردا.بۆ نمونەکە برێخت لێرە لە دانیمارک بوو کە خۆی دابڕیبوو لەبیری بوو چەند سەعات و سەعات لەماڵەکەی بەسەر برێت بەدانیشتووی لەدەم مێزەکەیەوە تا قەسیدەیەکی ئەوتۆ بنوسێت کە زۆر بەکەمی دەخوێندرایەوە. بەهۆی تەراوگەوە دەقی شانۆی ئەوتۆ

بنووسێت کەبۆ ساڵانێکی زۆر پێشکەش نەکران- هۆشیار بوو لەوەی (لە هەموو جارێکدا کە هیتلەر جارێ سەرکەوتنێکی نوێ دەدات ئەوە گرنگی من وەک نووسەر بچوکتر دەبێتەوە ) بەڵام هەر بەدەم مێزەکەیەوە دەمایەوە.

ئەو کردارەی لە قەوارەیەکی تەسک دا دەکرێت- فەیلەسوفەکە دەڵێت: واتایەکی راستەقینەی هەیە ئەگەر رۆبچێتە قووڵاییەوە لەپێناو پاساودانی فراوانیە بچووکەکەی.

دەربارەی ئامادەکردنی ئەکتەر:

ئامادەکردنی ئەکتەر بۆ من واتای چی‌یە؟

ئەم پرسیارە ئاراستەی ئەکتەر نەکراوە بەڵکو ئاراستەی ئەو کەسە کراوە کە هەڵدەستێت بە (ئامادەکرنی) ئەکتەرەکان و دیارە ئەوەی هەڵدەستێت بە ئامادەکردنی ئەکتەر، ئەوەیە کە دەتوانێت ئەو ناوچەی بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە (نهێنی) ئەکتەر لە بینەردا دەشارێت. ناکرێت ناوچەی بێ دەنگی لاببرێت ئەو لەمپەرەیە کە پێویستە بۆ رەتبوون لە پێین.بۆ ئەوە نووسین دەربارەی ئەکتەر بەکەڵکە، نەک تەکنیک و ئەزموون: ئەوانە بێدەنگی زەبر و رەق دەکەن. لەوێنەی دیوارێک لەرێسا و ئەو تیورانەی کە دەشێت بە هەموو تواناکانەوە پشتی پێ ببەستین لەپێناو بازدان بۆ لاکەی تر. واتێناگەم شتێکی راستە بوترێت من هەڵدەستم بە (ئامادەکردنی) ئەکتەرەکان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا دانییانانم چنگ کەوت بە کارامەیم لە ئامادەکردن و ( Fournare ). بەخشینی فۆرمی نمایشە شانۆییەکان و ئەزموونێکم چنگ کەوتووە رێی پێ داوم لەگەڵ هاوڕێکانم کار بکەم بۆ ئەوەی هە ستن بە ( Fornarsi ) (ئامادەکردنی خۆیان) بەوەش لەچاوی بینەران دا بەشێوەی ئەکتەر کەوتنەڕوو.

وەئەگەرو پێویستیەکانی پیشەکیەکە ناچارم دەکات فۆرم- ببەخشمە ئەکتەر. ئەو کاتە دەزانم من سەرنەکوتووم لە کارکردن لەگەڵیان. شانۆ لەکۆمەڵگەکەماندا ئاماژەیە بۆشتێکی جەمسەرکۆتاو کەمناشکرا. کە شتی زۆر جیاواز دێنە ژێر ئەم ناوەوە هەندێک جار هێندە بەسە بۆدوە. کە کەسێک لەکاتی قسەکردنیدا هەستێت بە جوولە.

بەشێوەیەکی گشتی دەزانین. چی‌چاوەڕوانی گەنجێکە کە ئارەزووی هەیە ببێتە ئەکتەر. دەچێتە قوتابخانە و وانەی پراکتیکی شانۆیی وەردەگرێت کە بەشێوەی چەندین مادە دابەشکراوە و زۆر قورسە کە هەلی کارکردنی بۆ برەخسێت بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ کەسێکدا تا ئەزمونە کەسیەکەی بۆ بگەیەنێت و بتوانێت نەک تەکنیکی باو ( Saveor Faire )ی فێر بکات بەڵکو هانی بدات لەپێناو گەشەیەکی کەسێتی کە بە درێژایی تەمەنی هونەریی خۆی قووڵی بکاتەوە. ئەوەی کە خوازیارە ببێتە ئەکتەر لەسەر بنچینەی ئەوەی کە ناو دەبرێت بە (بەهرە سروشتیەکان) لە قوتابخانەکان وەردەگیرێت و ئەم (بەهرانە)یە کە لە دوایشدا دەبنە ئەو کانگا سەرەکیانەی کە لەپێناو

کاردا بەکار دەخرێن. ئەوە جۆرێکە لە پەروەردە بۆ (ژیان لەسەر پاشماوەکان) وەپاش ئەوە لە قوتابخانە دەردەچێت. لەلای خۆی کەرەستەیەکی بچووکی هەڵگرتووە وەدەتوانێت- ئەگەر کارامە بێت- پێشبکەوێت بەڵام لەمەوداکارێکی زۆر تەسک دا خۆی دەبینێتەوە خاوەن (پسپۆرێکی باڵا) یە (سوپەر) وە ئەمەیکە بە شێوەیەکی گشتی بانگهێشتی (بەتواناییە گەورەکان) دەکات بەڵام ئەکتەری خاوەن پسپۆری باڵا (سوپەر) ئەکتەرێکی ملکەچی بینەرانی جۆرێکی دەستنیشانکراوی شانۆیە. ناتوانێت وەک ئەکتەر زیندو ئامێز بێت لەبارودۆخێکی جیاواز لەوەی کە لەپێناویا ئامادە کراوە. بەوەش خاوەنی جۆرێک لە رام کردنە (Dresagge) وەسیستەمێکی پتەوی نییە (Discipling) پسپۆرییەکەی تەنها دوو رێگەی لەبەردەم دا دەکاتەوە: یان پرۆلیتارییایی بێت یان خاوەن ئیمتیاز و چاکانەی پیشەسازی شانۆیی بێت. نەرێکی نەریتە شانۆییەکان ئەمڕۆ هەمو یەکێک ناچار دەکات سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە. بەوە خۆشاردنەوە دێتە دی لەپشت بەهانەی وەک ئەمانەوە کە ئازادی گەشەکردنی کەسی بۆ هەموو یەکێک بەجێدەهێڵێت وەئەوەش وەک برینی باڵی باڵندە وایە لەبەرامبەر ئەوەدا ئازاد دەبێت لەڕۆیشتن بەو ئاراستەیەدا کە دەیەوێت.

بەخشینی ئەزموونەکانمان بە کەسانی دی شتێکی گەوهەرییە تەنانەت ئەگەر لەوەشدا مەترسی دروستکردنی ئەوانە هەبێت کە فۆتۆکۆپی دەکەن. تەنها ئەوەی کە فێری بوون دوبارەی دەکەنەوە. بەهۆی رێزگرتنی زیاتر و زیاترەوە. سروشتییە کەسەرەتای تاکەکەس دووبارە کردنەوەی شتێک بێت کە موڵکی نییە وەسەر بە مێژووی خۆی نییە وەلەگەرانی خۆیەوە هەڵنەقوولاوە ئەوە ئەو خاڵی تێهەڵچوونەیە کەری دەدات بە دوور رۆیشتن.

جارێکیان بۆلز (Boulez) نووسی، ئەوەی کەرێ دەدات بە گەشەکردنی رۆشنبیری پەیوەندییە لەنێوان باوکە خراپەکەو کورە خراپەکە. کە باوک چاک بێت لەلایەکەوە وەکوڕیشی چاک بێت لەلایەکی ترەوە. ئەوە حاڵەتێکی ترسناکە دەشێت رووبەرووی ببینەوە. خراپتر لەوە ئارانەبوونی پەیوەندییە لە نێوان (باوک) و (کوڕ)دا کار کردنە سەر قوتابی- لە هەندێک لەبۆچوونە باوەکاندا بەشتێکی نێگەتیڤ دێتە پێش چاو ئامانجەکانی کاریگەری ناڕاێی دەخاتە روو بەڵام بیرکردنەوە بەم رێگەیە لەسەر هیچ شتێک ناگیرسێتەوە. هەموو یەکێک لەئێمە لە ژیانیدا یەکێک کاری تێکردووە. کێشەکە ئەو وزەیەیە کە ئەو پەیوەندییەی پێبارگ دەکرێت: ئەگەر کاریگەرییەکە بەهێز بوو ئەوە پاڵنەر دەبێ بۆ دوور رۆیشتن بەڵام ئەگەر کاریگەرییەکە لاواز بوو ئەوە پاڵنەر دەبێت بۆ جۆرێک لە گواستنەوەی بچووک. یان بۆڕاکردن لە هەمان شوێن دا (هرولە) بیرکردنەوەی مەرج دار هەردەم پاڵمان پێوەدەنێت بۆ حوکم دان بەسەر ئامانجەکانی

کاریگەری وەک دباردەو نیشانەی نێگەتیڤ. مندڵان تا ئەمەنێکی دیاریکراو ناچار دەکرێن بڕۆن بۆ قوتابخانە و. تەنانەت لەوەو دواش منداڵەکان خۆیان هەڵناستن بە هەڵبژاردنی ئەوانەی کە فێریان دەکەن. نە کەفێرکەرەکانیش هەڵدەستن بەهەڵبژاردنی قووتابیەکانیان. لەم کەسیە سەرەتاییەی ئازادییەوە لەنێوان هەردوو لایەندا. روون دەبێتەوە کە چەند پەیوەندیەکە بێلایەن بێت زیاتر دادپەروەرانە دەبێت. ئازاد و موجامل. ئەگەر چی ڕێ دەدات بە هەریەکێک- بەپێی توانا- هەستێت بەکردنی ئەوەی کە دەیەوێت. وە ئەگەر پەخشی مەعریفە ناکەسێتی و یەکسان بێت بۆ هەمووان لە هەر شوێنێک بن ئەوەیە کە مسۆگەری دەکات پەیوەندیە- ناچاریەکە- ئەگۆڕێتە جۆرە زەوتکردنێکی راستەقینە.

بەڵام لەهەر جێیەکدا ئازادی. کە لە هەڵبژاردنی هەر دوو لایەنەکەوە سەری هەڵدابێت- ئەوا شێوەیەک لە دادپەروەری مسۆگەر دەکات هێندەی کە هەردوو لایەنەکە ناچار دەکات بە شێوەیەکی ئاڵوگۆڕ.ئەم هەڵبژاردنە ئاڵ و گۆڕە پێویستی بە ئارا بوونی پەیوەندییەکی فێرکاری جیاواز لە خۆگرتووە کە بونیاد نراوە لەسەر ئاڵوگۆڕ و کاریگەرییەکی قووڵ تا ئەو رادەیەی پەیوەندییەکە دەگاتە سنوورێک قوورس دەبێت جیاکاری بکرێت لەنێوان فێرکەر و قوتابییەکەدا. وەئەمەش داوای سیستەمێکی تیژۆپەتەو دەکات نەک زۆرەملێ و سەپێنراو. ئەوە نەریتی زیندووە، پەخشێکی زیندوو ئامێزی ئەزموونی لە خۆدا حەشارداوە واتە رەتکردنی پرنسیپەکان. تیۆرەکان.. گشتکاریە. تەکنیکیەکان و مامۆستاکان بەکتێب و پرۆگرامەکانیانەوە، ئەوە پەیوەندییەکی تەواو کارە لەنێوان کەسەکاندا. ساتێک دێت بارودۆخ و تەمەن و ئەو پرسیارانەی لەدەورو بەرەوە دەکرێن داوای فراوانکردنی رووبێوی چەقی ئەو پەخشە دەکات گواستنەوە لەگەڕان بەدوای ئامادەبووندا بۆ پەیوەندییەکی دیاری نەکراو لە میانەی وشەکانەوە، ئەو ساتە ئەزموونەکان دەبنە (طروحات) دەرەنجام وجەختی گشتی. تایبەتمەندی کەسێتی خۆی لەدەست دەدات نازانێت بەووردی بۆ کێ ئاراستە کراوە بەوە ئەو کاروانەی پەیوەستە بە گەشە و مێژووی کەسانێکی راستەقینە رووبەڕووی مەترسی ئەوە دەبێتەوە کە بگۆڕێتە کتێبێکی تری دەستاودەست پێکراو (بەردەست).

سروشتی یەکە ئەم دلۆشتنی روونکردنەوانە ناشێت تەسک و کەسێتی نەبێت وەدەشێت روو لەمەترسی ئاناشکرایی بێت بۆ ئەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە وە ئەوەش زۆربەی لەدەرەنجامی زمانی کاری خۆم و کاری هاوڕێکانمەوە دێت کە بە تێپەڕبوونی کات بونیادمان ناوە هەندێک جار وەک ئەوە وایە کە زمانێکی ناوەکی مەتەڵ ئامێز بێ.. کاتێک بینگەیەکی نوێ دەکرایەوە لە کاروانی کارەکەدا بیرم ددکردەوە.. ئاد کەواتە

ئەمەیە کە مایر هۆلد یان (ستا نسلافسکی و تزیامن دەربارەی دەدوا و کاتێک دەیگوت... ) ئەو ڕێگەیەی کە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانمانی پێ‌دادەڕێژین زیاتر لەوەی تۆزێک بێت بەڕێکەوت ( إستیعاب )ی ئەوە ڕاوبکات کە دەیخوێنێتەوە. زیاتر لەوەی کە ئاماژەی وردبێت بۆ کارکردن. گرنگ استیعاب کردنی ئەوەیە کە لە پشت ئەو ئەنجامەوە حەشاردراوە کەڕێ دەدات بە ئەوەستان لەلای. دەشێت ئەکتەر بزانێت چۆن هەڵدەستێ بەئەنجام دانی ژمارەیەک مەشق بەشێوەیەکی ورد، وەدەشێت بزانێ چۆن بەشداری نمایشی زۆر باش پێشکەش بکات. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت ئەکتەرێک بێت بەبێ ئاسۆ ئەوەش وەک ئەوە وایە کە لە یادەوەری خۆیدا دەیان یان سەدان ڕستەی زمانێکی دەست نیشانکراوی لەبەر کردووە ئەوەی کە دەمێنێتەوە نایزانێت مەعریفە بە واتای استیعاب نی‌یە، کۆنترۆڵ کردنی ڕێڕەوی کارەکە شتێکە بەمەودای سالانێکی زۆر هەڵدەمژێت لە دوو توێی پەیوەندی و بارودۆخی دیاری کردنی کار وەتەنیا لە حالەتی ( دۆخی ) مژینیدا و لەکاتی استیعاب کردنیدا دەشێت ئەوەشی کە دەیزانێت استیعاب بکەیت. ئەگەر ئەکتەرێکی فرەخواز لەئارادابێت بیەوێت هاتن بۆ ( ئۆدن تیاتەر ) هەلبژێرێت و داوای وەرگرتنی بیرۆکەی پەلە دەکات دەربارەی ئەوەی کە دەشێت چاوەڕوانی بکات لەو پەیوەندی‌یە. من هەندێک خالی بۆ دەچەسپێنم دەشێت ببێتە زیندەوەرێک لەلای و دەشێت هەندێک جار هەندێک جەختی بۆ بخەمە روو، بەلام خوێنەر پێش وەخت دەزانێت کە بریتی‌نیە لە دیاری کردنی جوانکاری دەربارەی هونەری نواندن و نە ئامۆژگاری ئەو تۆشە واتێبگەم بۆ هەموو کەس باشە ودەشێت لە هەموو شوێنێک و لەلایەن هەموو ئەکتەرەکان و لە هەموو شانۆکاندا پراکتیک بکرێت. ئەمانە روونکردنەوەی ئاشکرای هەلبژاردنەکانم و هەلبژاردنی هاوڕێکانمە لەکاردا. ئەووە دەرەنجامی ئەنجامەکانە بەلای من و ئێمەوە هەردەم کە لە ئەکتەرە فردخوازەکان دەپرسم دەربارەی ئەو بنەمایانەی پالی پێوەدەنێت بێتە ناو بواری ئەم پێشەیەوە وەلامم چنگ دەکەوێت وە بەگشتی وە بەشێوەیەکی نا ئاشکرا داڕێژراون، وەلامی ئەوتۆ کە خەریکە پێویستی گەوهەریی کەشف بکات. بەلام لە پشتەوە تەلەی شاردۆتەوە لەتوانایدایە قیبلە نۆما بێت، بەلام زۆر سەرەتاییە. بەجۆرێک دەشێت بە ئاسانی ببێتە قیبلە نۆمایەکی شێت ڕێڕەوی ڕێبوارێکە بگۆڕێت. بەزۆری دەووترێت: دەمەوێت ببمە ئەکتەر بۆ ئەوەی گوزارشت لەخۆم بکەم، بۆ ئەوەی خۆم کەشف کەم، بۆ ئەوەی تلقایی بم.. بۆەوەی کەسانی دی بدوێم یان بۆ ئەودی دروستکەر بم.

١- التلقائیة ( لەخۆوەیی )

Pinochio کە بوونێکی تەختەیی بوو بەخردکاری دەدوا و ددڕۆیشت بڕیاریدا بەدوای خۆیدا بگەڕێت، بگەڕێت بەدوای رەچەڵەکە ( سروشتی )یەکەیدا. رۆیشت و ددگەڕا

وەبەڕاستی شتێکی دۆزیەوە. بەشەکانی‌تر لەسروشتی ئەو بریتی بوو لە دەسکی تەختەی تفەنگێک.. دەرگای میحرابێکی بچووک.. قاچی مێزێک لە سوورخانەیەک و پارچەی بەلەمێکی تێک شکاو... دۆزینەوەی خود سەرلەنوێ واتای نی‌یە.. پینۆکیۆ وەک هەر یەکێک لەئێمە خاوەنی تەنها یەک شیانی راستەقینە بوو: کە خۆی چۆنە بەوە قایل بێت، واتە ئەو شێوەیەی بەخۆیەوە دی وەهەوڵی گەڕانەوە نەدات بۆ دولوە لەپێناو ئامەزرۆی بۆ یەکێتی ( Unita ) وون بوو. وەهەوڵی خنکانی ئەوە نەدات کە بە لایەنێک نێگتیفی دادەنێت لە خۆیدا.. بەڵکو بگەڕێت بەدوای بەخاوەنبوونی ئەو نێگەتیڤانە وە بیگۆڕێتە شێوەیەک لە ووزەی نوێ.

وەکو وزەکانمان شێوەیان نەبێت لەتواناماندایە بالا دەست بین بەسەریاندا یان بەسەرماندا بالا دەست بن. باروئۆخی دەوروبەرەکە بەهاکەیان دیاری دەکات. ئەوەی لەسەدە رۆشنەگەرەکەماندا تەنیا وەک هیستریا دێتە بەرچاو لە دەوروبەرێکی کۆمەلایەتی و رۆشنبیری تردا ئامـاژە دەبێت نیشانەی توانای لەڕادەبەدەری کەسێکە دەتوانێت پەیوەندی بکات بەواقیعێکی ترەوە.

ئەفسانەی ( تلقائیەت ) لەڕاژی نەبوونمان لەخۆمانەوە هاتووە. بەوەش ئەفسانەیەک دروست دکرێت بۆ ئەو وێنەیەی کە جیاولزە لێمان.. وێنەیەک لە واقیعدا سەختە لەسەرمان بیهێنرێتە دی. ئەوەش دەبێتە هۆی جۆرێک لەتوندوتیژی دژ بەو چۆنیەتیەی کەهەمانە وەئامانەوێت وابمێنێتەوە. بەگەڕان بەدوای ئەم وێنەیەدا واز لە خۆمان دەهێنین بکەوینە دوای ئەوەی کە رۆشنبیری و کۆمەڵگەکەمان جیادەکاتەوە توندوتیژی وەک مەرجێک بۆ جەنگ کەوتنی ئەنجام. ئەو هزرەی تر پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ریفۆرم، وەجۆرێک لە دابڕان ( القطیعة ) استیعاب بکەین.. جۆرێک لە دابڕان نەک وەک ڕەوتێکی سروشتی و ئەندامی. ئەوەیە کە ئەکتەر پاڵپێوەدەنێت بۆ جۆرێک لە هەڵچوونی کوێرانە بۆ شەکەت کردنی جەستەیی بە شێوەیەکی دەستکرد. زۆر جار دەبینین وێنەی ( التلقائیة ) لەو کەسانەدا بەرجەستەیە کە سەربە رۆشنبیری ترنو وا دێتە بەرچاو بەئازادی‌یەکی گەورەتر و سووکتر لەئێمە دەبزوێن و سەما دەکەن وەک ئەوەی ئامادەبوونێکی تەواویان هەبێت بۆ خۆیان. لەو کاتەی ئەوانیش لەواقعدا ملکەچی کۆنترۆڵی یاساکانی ئەو رۆشنبیریەن کە تیایدا پێکهاتوون. وەمەرجەکانی ئەو جیاوازیانەی کە دروستی کردوون ئەوەیە کە بە تلقائی تێ‌دەگەینو بەئاراستەی دەڕۆین. هیچ نیە. بێ لەشتێک کە لەبەر جیاوازیەکەی کارمان تێ‌دەکات وا دێتە پێش چاومان وەک ئەوەی شتێکی جیاوازە لەوەی کە ئێمە لەسەری راهاتووین. رەفتاری رۆژنەمان شێکی ـمعقـول )ە فرمانڕەوای سەرکردایەتی دەکات و لە بچووکی‌یەوە دیاری کراوە بەجۆرێک لەتوانای بەخشینی ئەوتۆ کە پێویستیمان تیادا ناهەژێنێت و وامان لێ‌ناکات

ئەوپەڕی ڕادەی توانستە بەدەنی و دەروونی هزرییەکانمان بناسین؛ ئەوە ئەو دۆخی تەنکێتییە (Aureamed iocritas)یە کە هەرگیز جۆرە بارگەو سۆزی گەورەی پیادا تێنەپەڕیوە. بۆیە واتێ دەگەین کە تەقینەوە (تلقائیە)تە. بەوەش دەگەڕێین بەدوای تێکشکاندنی زەنگی شووشەی یاساکانی ڕەفتارای ڕۆژانەی ڕاهاتوو وەدەرەنجام هیچ نییە بێ لە پارچە شووشەی تێک شکاو.

بەلام (التلقائیة) زاراوەیەکە بەناوەخنی لە ڕەگەکانیدا چەمکی هەلبژاردنی ئازادی لەخۆ گرتووە. تلقائیەت شتێکی تایبەتمەندی ئازادی مسۆگەرییەوە: ئازادی هەلبژاردن لەبەردەم ئەلتەرناتیڤە جیاوازەکان دا بەبێ زۆرلێکردن بۆ هەلبژاردن بێ گلان لە کۆستەمەتریالی یان دەروونیەکان و بێ ئەوەی بۆت دەربکەوێت (خۆت بدۆزیتەوە لەدەست و پێ کەوتوویت بەهۆی کەمی مەعریفەی تەکنیکی یان ترسەوە بۆ نمونە لەوەی کە ئەوانی دی دەیلێن دەربارەت.

ناشێت تلقائیەت شتێک بێت دژی فیرتۆ سیزمۆ (المهارە البارعە) (Virtuosismo) بەلکو شتێکە لەدوایئەوە دێت. پیانۆژەن کاتێک زیاتر دەبێت لەتەنها پیانۆژەنێکی (ماهر بارع) فیرتۆ سیزمۆ ئەوسا دەتوانێت لەمیانەی ژەنینەوە شتێکی کەسی تایبەتی ڕەت بکات. واتە دەتوانێت گوزارشت لەخۆی بکات خۆی فڕێ بدات ڕووەودەرەوە. لەمیانەی ئەو بەرگرییەی کە ڕێسا مۆسیقیەکان و ئەو ئامێرەی هەلیبژاردووە دەیسەپێنن بەسەریدا. دۆخی تلقائی کە دەشێت بیبەستینەوە بە دۆخی (کەشف کردنی خود) لە خۆیدا دۆخێک نیە بەلکو سێبەری ڕەوتێکی زۆر دیاری کراوە، ئاشکرایە و ملکەچی ڕێسای وودە. تاکەکەس لەمیانەیەوە هەست دەکات بە مسۆگەری و متمانە.

ئەمەیە کە ڕوودەدات لەگەل ئەوەی قسەکردن یان نووسینی و خوازتنی: ناتوانین هیچ نیشانەیە یان هەر دەنگێک بێت بەکار بهێنێت، بەلکو لەسەریەتی لەمیانەی ڕێساو وشەکانی زمانێکەوە ڕەت بێت. لەتوانایدایە وشەی نوێ دابهێنێت (Neologismi) بەلام دەکەوێتە شوێن لۆژیکی سەپێنراو لەلایەن ئەو ڕەچەلەکانەی لە ئاراداان لەو زەمانەدا.. ئەم بەرگریە کە ڕێ دەدات بە پراکسیسکردنی ئازادی. ئەوە شتێکی ئاشکرای بەرچاوە. بەلام بەزۆری ئەکتەر (مجازفة) پرکێنشی هەستان بەکردار دەکات وەکو ئەوەی لەبیر بچێتەوە. بەلای ئەتەوە ڕۆشنبیریەکەماندا وادیارە لەوێدا ڕێسا لەئارادا نیە.

دۆخی ئەکتەر لە کۆترەکەی کانت (Kont) دەچێت کە لە یەکێک لە نمونە بەناوبانگەکانی دا دەربارەی دەدوێت: بەرگری هەوا بالەکانی شەکەت دەکات بەلام بەبێ ئەو هەوایە بەقورسی جەستەیەکی مردوو دەکەوێتە سەر زەوی.

بەم شێوەیە ئەکتەر کار دەکات وەک ئەوەی پال بە دیوارێکەوە بنێت تا وەلای بنێت و ئەو کۆسپەکان و ئەو دۆخانە لابەرێت کە سەپێنراوە بەسەریدا جیا بەندە لەنێوان ئەو

کەسانی دی لەنێوان ئەوو ئەو وێنەیەی خۆی کە دەیەوێت. بەلام ئەو رێگەیەی کە نیولرەکەی پێ پاڵ دەنێت ئەو رێگەیەی هەموو وزەکانی خۆی پێ بەکار دەهێنێت لەپێناو وەلامدانەوەی ئەو کۆسپانەی لەبەردەمیدا وەستاوون. ئەوەیە کە ئەکتەر دەخاتە روو. بەلام لال دەبێت. ئەگەر نیولرەکەی وەلاناو خۆی دیەوە تەنیا لە بۆشایدا و بەبێ بوونی بەرگری. هەولی وەلانانی بەرگری دەبێت بەدلرشتەی تر بێت: هەولی بە خاوەن بوونی و خستنە ناو دۆخی تر پێ‌بەخشینی واتایەکی نوێ کە بەرێگەی بۆ ژیان دیاری کراوە.

ئەکتەر دەکاتە بونیادی ئەندامی (Bios) و ژیان. وەک پیشەمەندێک وەبوونەوەرێکی کۆمەلایەتی و لەمیانەی ئەو کردار و پەرچەکردارانەوە کە شوێن لۆژیکێکی ورد دەکەون لە هەموو جارێکدا هەلناسێت بە کردارێکی ملکەچی حوکمە هەرچۆنیەکان. بەلکو هەلدەستێت بە پێکەهەلنانی رێسای ورد بەوێنەی ئەوەی کەرێمان پێ دەدات لە زمانێک دا گوزارشت لە وتووێژێکی کەسیی بکەین.

ئەکتەر خۆیەتی کە دەشێت بریاری ئەو لۆژیکە بدات کە بۆنیشانەکانی دەگونجێت، بەلام کاتێک بریاری دەدات لە هەموو جارێک دا دەبێت هەتا کۆتایی پێی قایل بێت: بۆ نمونە: بریاری کارکردن دەدات لەسەر چۆنیەتی فرین ئاشکرایە کە ناتوانین بفرین بۆیە هەول دەدات بازبدات بۆ بەرزترین ئاست کە بشێت. هەول دەدات سوکیەکی جیاکراوە بەچنگ بهێنێت وەلە دەرچوونیەوە، لێرەوە لە هەلبژاردنە کەسیەکەیەوە دۆخێکی کار دەستنیشان دەکات کە بەسەریدا دەسەپێت.

لەوەو دوا رێسای ووردی بەسەردا دەسەپێنێت بۆ کردارەکانی: بۆ نمونە، رۆشتن لەسەر سەری پەنجەکان بەبێ ئەوەی پاژنە لە زەوی بدات، وەنایخاتە سەر زەوی. نەک لەپێناو سەرنج راکێشانی بینەردا، بەلکو بەرلە هەموو شتێک لە پێناوی خۆیدا، چونکە ئەوە دەبێت بەرێسایەک ململانێ لەگەل دەکات، وەبەووشەیەکی تر گوزارشت لەخۆی دەکات.

کات ئەکتەر دەکات بەخاوەن بوونی هەموو ئەو رێسایانەی کە بە سەر خۆیدا سەپاندووە. بەو توانایەوەکە لەمیانەیانەوە گوزەر بکات بیریان لێبکاتەوە و ئیستیعابیان بکات و لە دوو توێی کارەکەیدا دەتوانێت هەمەرەنگی بکات لەریتمەکانیان دا ئەو کاتە دەگاتە شێوەیەک لە مسۆگەری و ئازادی ئەوتۆ کە بۆ بینەر وادیارە وەک ئەوەی (تلقائی) بێت.

بەلام لەپشت ئەم یەکەیەوە (مفردد) چی لە ئازادیە؟ جۆرێک لەو دۆخە مەرج دارە هەیە، ئەکتەر هەلیبژاردووە و هەستاوە بەهەلمژینی. کە بینەر وا هەستی پێ ناکات کە دروست کراو زۆر لە خۆ کردەبێت. هەردەم رەفتاری مرۆڤ شوێن لۆژیککی بەدەنی و

سۆزداری و مێشک دەکەوێت. وەتەنها لە شانۆدا ڕوودەدات کە هەندێک (الموهومین) دەبینین ڕووە ئاماژەو وردە پارچەکراوی ناپەیوەست بەیەکەوە دەخەنە ڕوو واتێ‌دەگەن لەمیانەی ئەم ڕەفتارە و شڵەژاوو نادەربڕە وەدەتوانن ئازادی بنوێنن.

کاتێک ئەکتەر هەڵدەستێت بەکاری وەک ئەوە- هەندێک جار- هەست بە خۆی دەکات ئازادە (هەست بە شتێک دەکات لەنێوان خۆیو دەروونی‌دا ناوی دەنێت(ئازادی)) بەلام بینەر بەندی قورێک ڕوەئاماژە دەمێنێتەوە کە ناتوانێت هیچ لۆژیکی گوتار نیە (Discorso) دەشێت بینەر هیچ گوتارێک یان چیرۆکێک یان ئەوەی بەر لە نواندن نمایش لە ئارادیە (-Presentaien re) نەدۆزێتەوە (نەناسینەوە) لەپشت کردارەکانی ئەکتەرەوە. بەلام لەمیانەی کردەوەکانەوە دینامیکیەتی کردارو پەرچەکردارەکان دەدۆزێتەوە، وەشتێک دەژی و گەشە دەکات و جیا دەبێتەوە لەڕەوتێکی دیالێکتیکی دا ئامادەبوونی بەدەنی ئەکتەرێک دەکات کە هیچ پەیوەستی نیە بەڕێی ڕژانی مردووی کەفووکو لە سۆزدارییەکان وێڵیەکی تر لەئارادایە دەشێت سەرکردایەتیمان بکات لە گەڕانمان‌دا بەدوای تلقائیەتدا: وێنەی پیاوو ژن کاتێک یەکتریان خۆش دەوێت وەهەست بە قبوول کردنی بۆی و متمانە دەکات لەگەڵیدا: ئەو کاتە هەموو کردارەکانی ئاوێنە دەبن بۆ بەرزکردنەوەی ووزەکان بەشێوەیەکی زۆر وورد، لەپێناو بەرزکردنەوەی دەستی و دەستبازی یان ڕاکێشانی قژی. دڕک دەکات تا چ سنوورێک دەشێت هەستێت بەوە و لەچ سنوورێکدا بوەستێت بۆ ئەوەی لەو سنورە لانەدات کە تیایدایێ ژیانەوە لەپێناوی لەدەست نەدانی پەیوەست لەگەڵ ئەوی دی داخران لە جۆرێک لە (خود تیژی)دا. هیچ شتێکی ڕاگوزاری لەڕەفتاریدا نیە جۆرێک لەڕیتم (لۆژیکی) لە ئارادیە کە ساتە بەدوایەکدا هاتووەکانی تامەزرۆیی ئەو شەپۆڵ زیندەگیە گەورانە ڕێک دەخات کە لەدەرەوەدا دیارە وەک ئەوەی کرداری توندوتیژ بێت وەپەرچەکراری ئازار بێت.

بۆیە ئاسانە ببینین ئەگەر ئەکتەرەکە درۆ بکات: ئایا بەم ڕەفتارە دەگرێتە بەر کاتێک ئازار تلقائی بێت. کاتێک بەیەکەوە دەبێت لەگەڵ ئەوەدا کە خۆشی دەوێت؟ لەواقعدا بەنزیکەیی ڕونادات هەست بەخۆی بکەین بەم متمانەیەوە لە نێو ژمارەیەک کەس‌دا. بۆیە دەشێت بڵێین شانۆ بریتیە لە (تظاهر) (Finzione) بەلام (التظاهر) هاوتای دەرۆنی‌یە. درۆ بەلای ئەکتەرەوە ڕواندنی شتێکە بەپێ‌ی ناوەند بە ڕێگەیەکی نادیالێکتیکی.

وەدانانی بەشێک (رەسەن) لەباروۆخی دروستکراودا: بازنەی التظاهري شانۆ.

سەرچاوە:

مسيرة المعاكسين

انثروبولوجية المسرح

بۆجینۆ باریا ت:- د. قاسم البياتي

الطبعة العربية الاولى 1995 دار الكنوز الادبية

# ڕۆڵی سیاسی ڕۆشنبیران

میشال فوکو

و: حەسەنی مەجید

پێشەکی:

بابەت و دیاردەی ڕۆشنبیری لە ڕۆژهەڵات و لە ڕۆژئاوادا لەو بابەتانەن بەهۆی ئامادەگی و بەشداری کردنیەوە لە هەموو بوارە فیکری کۆمەڵایەتییەکاندا. پێویستی بەلێپێچینەوە و توێژینەوەی وورد هەیە، هەرچەند لەم ناوچەیەی لەمەڕ خۆماندا وەک پێویست و بەشێوەیەکی زانستیانە نەدراوەتە بەرمەحەکی تاقی کردنەوە.. بڵاوبوونەوەی ئەم نووسینە لەلایەن (میشال فۆکۆ)وە، وەک فەیلەسوف و ئەندیشەمەندێکی هاوچەرخی فەرەنساوی کە ڕاستەوخۆ لەم بابەتە دواوە، چەند لایەنێکی نوێی لەم بابەتە واتا -ڕۆشنبیری- خستۆتە بەرچاو و هەڵێکی لەبار دەرەخسێنێ تا خاوەن ڕاکان و بیرمەندانی کە لەم بوارەدا بەووردی بیری لێدەکەنەوە، لەڕوانگەو دیدێکی نوێ وە لێی بکۆڵنەوە و لەکاتی گەڵاڵەبووندا بیخەنە بەر دیدی خوێنەران.

....(میشال فۆکۆ) فەیلەسوف و مێژوونووس (مێژووی سیستەمە فیکریەکان) خوێندنی لە ئەنیستیتۆی باڵای پاریس تەواو کردووە و، بڕوانامەی لیسانسی فەلسەفی لەساڵی-١٩٤٨- ولیسانسی دەروون ناسی لەساڵی-١٩٥٠-و دیبلۆمی کێشە دەرونیەکانی لەساڵی-١٩٥٢- دا وەرگرتووە.

بەرلە بەدەست هێنانی کورسی ئوستادی کۆلیژی (دوفرانس)، لەزۆربەی دانیشگاکانی ئەورووپادا وانەی ووتوەتەوە. لەم سەردەمەدا وەک یەکێک لەگرنگترین فەیلەسوفان و ئەندیشەمەندانی دوای جەنگ لەئەورووپادا دەناسرێت. لەنوێترین نووسینیدا دەبارەی ناساندنی بەرهەمەکانی دەڵێت: (لەماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییدا مەبەستی من نەشیکردنەوەی دیاردەی دەسەڵات و، نە ڕێکخستنی بنەڕەتی ئەم شیکردنەوەیە بووە..بەڵکو ئامانجی من تۆمارکردنی مێژووی چەندین ڕواڵەتی جیاوازە لەنێو فەرهەنگی ئێمەدا، کە تێیدا مرۆڤ دەکێشرێتە ژێربار، یان دەسەڵاتیان بەسەردا دەسەپێنرێ).

(فۆکۆ) لەم بۆچوونەیدا لەسێ شێوەی پێکهێنەری مرۆڤ دەدوێ، کە ئەم شێوانەش لەخۆیاندا ئامرازگەلێکی لەبارن بۆ خستنە ڕووی ناوەڕۆک و کاکڵەی کاری دیاری کراوی ئەو.

(فۆکۆ) شێوەی یەکەم بە (کردەوە جیاکەرەوەکان) ناودەبات. دەتوانین لەنێو نوسینەکانیدا دیارترین نمونەی ئەم کردەوەیە، لەدابڕینی ئەوانەی لە سەدەکانی ناوەندا توشی پەتای گولی بووبوون و زیندانی کردنی هەژاران و شێت و وێڵگەردوکان لە نەخۆشخانەگشتی یەکانی پاریسدا لەساڵی -١٦٥٦- دا و. پۆلێنکردنی ئەو نەخۆشیانەی لەسەرتای سەدەی نۆزدەیەمدا دەبینران دەست نیشان بکەین. (فۆکۆ) لەم پەیوەندیەدا لەو زانستانە دەکۆڵێتەوە، کە ڕاو بۆچوون و کار و کردەوەیان لەم بولرەدایە، وەك نۆشداری سەریری (طب السريري) کە لەپەیوەند لەگەڵ ئەو پۆلینکردنەی سەرەوەدا پێکهات. هەروەها نۆشدلری دەرونی (طب النفسي) و بەکارهێنانی لە نەخۆشخانەو زیندان و ئاسایشگا دەرونی یەکان دا. کە پاڵپشتی تێگەیشتنی تەواو لە واتای هۆشمەندی و سەرشێتی، هۆشمەندی و نەزانی دەستی دایە ئاشکراکردنی نەخۆشی دەرونی.. (فۆکۆ) بە دیدێکی رەخنەیی‌یەوە پەیوەندی دەربڕینی مەعریفە و دەسەڵات بەرجەستە دەکاتەوە.. بەشێکی بەرچاوی کارەکانی (فۆکۆ) لەسەرەتادا وەك (مێژووی شێتی لەسەردەمی کلاسیك) دا، لەچاپی ئینگلیزیەکەیدا (شێتی و شارستانیەت) لەپەیدابونی دەرمانخانەو، دواتر لە پەرتووکی (کۆنسرۆڵ و سزا) دا لە ئەرك و پەیدابوونی گرتوخانە کۆڵیوەتەوە، بەتابەتیش سەرنج دەداتە پەیوەندی هاوتەریبی کردەوە جودا کەرەوەکان، لەگەڵ پێك هاتن و بەرکەماڵبوونی زانستە کۆمەڵایەتیەکان و. پەیوەندی مێژوویی شێوەکانی پۆلین و. کۆنترۆڵکردن و دەست بەسەرداگرتن بەهۆی ئەو گوتارە مرۆییانەی لەمەڕ چارەسەر و بەرەو پێشەوەبردن و. بەکارهێنانی کاریگەری پێکهاتەی دەسەڵات و مەعریفە پێشکەش دەکران.

شێوەی دووەم (فۆکۆ) بە (پۆلێنکردنی زانستی) ناودەبا. ئەم ڕەوشە لەوشێوە لێکۆڵینەوانە دەکەوێتەوە، کە پلەو پایەی زانستی بۆ خۆیان لەبەرچاو دەگرن. بۆنمونە شێوەی پێکهاتەی مرۆڤ وەك تاکی قسەکەر (متكلم) لەزانستی زمانەوانی و وازە ناسی و ڕێزمانی گشتی زوبانێك، یا شێوەی بەدیهاتنی مرۆڤ وەك بەرهەمهێنەر لەشیکردنەوەی سەرمایەیان توێژینەوە ئابووریەکان، یا شێوەی پێکهاتەی مرۆڤ وەك تاکێکی زیندوو لەمێژووی سروشتی (ئیکۆلۆژی) ژینگەدا. ئەمەش کورتەیەکی ناوەڕۆکی جەنجاڵترین کتێبی (میشێل فۆکۆ) یە بەناوی (وشەکان شتەکان)ەوە.

لەم لێکۆڵینەوە گرنگەی (فۆکۆ) دا ئەوە دەردەکەوێ کە چۆن دەربڕین لەڕێی زوبانەوە، بووە مایەی رێکخستنی کارو زوبان وەك چەند بەشێکی زانستی و، هەروەها چۆنیەتی سەربەخۆیی دەرونی و. گوجاندنێکی مەزنی تیا دروست بووە بەپێچەوانەی بیروڕای گشتی یەوە کە دەڵێ: بابەتی ئەم بەشانە بەپێی ڕەوتێکی دیاری کراوی لۆژیکی ئەشونمایان کردووە و پوختەبوون. ئەم بەشانەش گۆڕانی بنەڕەتیان بەسەر

دادێت. (فۆکۆ) لەم کتێبەیداو هەروەها لە (دێرینە ناسی زانست) دا جەخت لەسەر گۆڕانکاری بنەڕەتی و جیاواز لە پێکهاتەی دەربڕینی زانستە مرۆیی یەکان‌دا دەکات. ئامانج لە خستنەڕووی ئەم پرسیارە: (شێوەی کارکردنی دەرخستنی زانستە مرۆیی یەکان)و، خستنەڕووی هونەرەکانی دەسەڵاتداری کە بەدەگمەن ئەنجام درابوون.

سێیەمین شێوە پێکهاتەی تاکەکەسە، کە دیارترین دەسکەوتی (فۆکۆ) یەو دەتوانین ناوی بنێین پاشوەرۆیی (تابعیت). ئەم شێوەیە ئەوەمان نیشان دەدات کە چۆن مرۆڤ خۆی دەکات بە تاکێکی پاشکۆ (تابع). ئەم دەرکەوتەیە جیاوازە لەو دووانەی پێشوو ولایەنێکی تری نووسینەکانی، لەدوو شێوەی پێشوودا تاک پایەیەکی پاشکۆو ژێردەستەیی هەبوو، کەچی لە شێوەی دوای‌دا تاک رۆڵێکی چالاکانەی لە خۆدروست کردن‌دا هەیە وەهەوڵی ئەوە دەدا لە رێگەی ئەم هونەرانەوە چالاکانە بوونی خۆی بسەلمێنێ. (فۆکۆ) ئەم جۆرە هونەرانە بە (هونەرەوەری خۆیی) ناوزە دەکات و لەو باوەڕەدایە بۆ توێژینەوە لەڕەچەڵەک ناسی تاک لە ژیواری خۆرئاوادا نەک هەر (هونەروەری خوێن) بەڵکو دەبێ هونەری دەسەڵاتیش بخەینە بەر دیدو سەرنج.

دەسەڵات خاڵی دەستپێکردنی (فۆکۆ) بووە لە توێژینەوەی پەیوەندیەکانی دەسەڵاتداری دا، (فۆکۆ) بۆ خۆی لەدواترین کتێبی‌دا بەناوی (مێژووی رەفتاری سێکسی) لە هونەرەکانی خۆ (نەفس) ەوە دەست پێ دەکات و. هەروەها پەیوەندیەکانی دەسەڵاتیشی داوەتە بەر سەرنج و ڕونیان دەکاتەوە. ئەم هونەرانە ئەو توانایانە دەدەنە مرۆڤ کە لە ئاستی ئامانجە خۆیی یەکاندا کاریگەری لەسەر لەش، دەروون، ئاکار و بیر هەبێت. هەروەها شێوازێکی خۆناسینیشی تێدایە کە بەهۆی کەسێتیەکی بەتوانای وەک-ئیعتراف وەرگرێک- یا توێژەرەوەیەکی دەروونی یەوە دەردەخرێ..

(فۆکۆ) لە نووسینەکانیدا جەخت دەکاتە سەر چینە سەردەستەکان، بەتایبەت چینی بۆرژوازی فەرەنسی لە سەدەی نۆزدەداو هاوڵاتیانی یۆنانی و، پیاوە ئایینی یەکان و، زاهیدە سەرەتایی یەکانی مەسیحی. بۆ نمونە ئەوە نیشان دەدا کە لە سەدەی نۆزدەدا هۆی بڵاوکردنەوەی ئەو رێژە زۆرەی نووسین و وتاری زانستی لەسەر - غەریزە سێکسی یەکان- دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارە کە دەزانرا-غەریزە سێکسی‌یەکان-کلیلی تێگەیستنن لە مرۆڤ. (فۆکۆ) لەم نووسینەی دا (رۆڵی سیاسی رۆشنبیران) رەخنە لە دیدگای زاڵ بەسەر رۆشنبیرە مارکسیە کاندا دەگرێت. هەرچەندە ئەمە تێگەیستنێکی باوو سونەتی یەو، تەنها لە مارکسیستەکانەوە نی یەو لەوانەوە سەری هەڵنەداوە، لانی کەم لە رەگەزە رۆشنبیریەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە تا ئێستاش ئەم لێ تێگەیشتنانە لە زۆربەی وڵاتان دا هەن.. (فۆکۆ) لەژێر تیشکی گۆڕانکاریە ئابووری و کۆمەڵایەتی و

فەرهەنگی یەکان دا، لێ تێگەیشتنێکی نوێی لە ڕۆشنبیر هێنایە گۆڕ، کە وەک شارەزایەک خستویەتیە بەرچاو پەیوەندیشی بەسەر و سامان و دانی هەقیقیەت و دەسەلاتەوەهەیە، نەک وەک هۆکاری هۆش و داد پەروەری و هەقیقیت هەروەک (فۆکۆ) خۆی دەڵێ: ئەم دیدو بۆچوونانە تەواو (قطعي) نین، بەڵکو هەر هەمان تێگەیشتنی سونەتی باو هەیە، خستنەڕووی ئەم کێشانە دەتوانن هۆیەک بن بۆ سەرهەڵدانی ئەندێشەی نوێو داهێنەرانە..

× × × × × ×

ماوەیەکی دورو درێژ ڕۆشنبیری چەپڕەو وەک کەسێکی دادوەرو ڕاستگۆ دەدواو ئەم ڕاستیەشی لەلایەن خەڵکیەوە جێی باوەڕ و متمانە بوو، ووتەکانی وەک بەیانی ڕاستی یە گشتی یەکان هەمووان دەدرایە قەڵەم. یا لەو باوەڕە دابوون کە دەبو وەک نیشاندەری ڕاستی یەگشتی یە کان سەیر بکرێت. بە واتایەکی دی ڕۆشنبیر وەک نوێنەری ئاگایی و ویژدانی ئێمە لە قەڵەم دەدران. ئەوە دەبینین لەگەڵ تێڕوانینێک ڕووبەڕووین کە لە مارکسیزمەوە یان لە ڕاستی دا لە مارکسیزمێکی کاڵەوە بوە وە وەرگیراوە. بەهەمان شێوە کە چینی کرێکار بەپێی پێویستی یە مێژوویەکەی هەڵگری هەندێ ڕاستی و گشتی و سەراپاگیرە، بەڵام خۆی وەک هەڵگرو خاوەنی ڕاستەقینەو بێئاگا لەم ڕاستیانە بە پیی پێویست ئاگای لە ڕۆڵی مێژوویی خۆی نیە..

لە ئاکامی هەڵویست گرتنی ئەخلاقی و، تیۆری و، سیاسی یەکانی یەوە ڕۆشنبیریش هەوڵ دەدات کە هەڵگری ڕاستیەگشتی یەکان بێت لەشێوازێکی ئاگایانەو مۆدێرندا. دەبووایە ڕۆشنبیر تاکە سیمای ساف و بێ گەردی ڕاستیە یونفیرسالیەکان بێت، کە تێی دا چینی کرێکار شێوازی گشتی و شاراوەیەتی. چەند ساڵێک بەسەر ئەوەداچووە کە ئەم شێوە ڕۆڵ بینینە لە ڕۆشنبیر دەخولزرا، شێوەیەکی نوێ لە پەیوەندی (تیۆەر و پراکتیک) جیگیر بووە.. ئیتر ڕۆشنبیران لە ئاستێکدا نین دەستە بەرکەری (نمونەیی، پێشڕەوایەتی، گشتی و جیهانگیری و، سیمای گشتی دادوەری و ڕاستیەکان) بن. بەڵکو دەبێت لەبوارو شوێنگەیەکی دیاریکراو وەکار بخرێن کە هەلومەجی ژیانی و پیشەییان پێویست دەکات. بۆ نمونە ئەو شوێنانەی وەک (نەخۆشخانەکان، ئاسایشگا دەرونیەکان، ئازمایش گاکان و دانیشتگاکان و کۆمپانیاو بەرە سازەکان و، بوارەکانی پەیوەندی خێزانی و سێکسی). بێ گومان ئیدی ئەوان لەم بارەدا ئاگایی دیارتر و ئاشکرا تر لە هەوڵ و کۆششەکانیانا بەدەست دێن. چیدی سەرو کاریان لەگەڵ کێشە گشتی یە کان نابێت، بەڵکو لەگەڵ کێشەو ئەرکە تایبەتەکان دا ڕوو بەڕو دەبنەوە. چەند کێشەیەک کە جودان لە کێشەی چینی کرێکار و جەماوەری خەڵک. لەگەڵ ئەوەشدا من

لەو باوەڕەدام کە رۆشنبیران بە دوو هۆوە نزیک بوونەتەوە لە چینی کرێکارو جەماوەری خەڵک: لەلایەکەوە بەهۆی ئاوێتە بوونی ڕاستەوخۆی رۆشنبیران لە کێشە ڕاستەقینە مادی و رۆژانەکان دا و لەلایەکی ترەوە، بەم هۆیەوە کە رۆشنبیران سەرجەم ڕوو بەڕووی هەمان نەیاران دەبنەوە کە کرێکاران و جەماوەر بە شێوەیەکی تر لەگەڵیان دا لە نژایەتی دان: وەک (دامەزراوە فرە ڕەگەزەکان. دەزگاکانی دادوەری پۆلیس و مەدەکارەکان) ئەم جۆرە رۆشنبیرانە بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە بەشێوەیەکی باو بەرۆشنبیری (گشتی) ناودەبرێن، ناویان دەنێین رۆشنبیری (تایبەت). ئەم پایەو ئاستەنوێیەی رۆشنبیران چەند دەسکەوتێکی سیاسی تری بە دواوەیە: ئەگەر هاتوو نەشبێتە هۆی یەکگرتنی چینەکان یان گروپە کۆمەڵایەتیەکان، لانی کەم دەبێتە هۆی سەرلەنوێ داڕشتنەوەی پەیوەندی نێوان چەند گروپێک کە لەوەوپێش پەرش و بڵاو بوون.

بەشێوەیەکی باو نووسەری رۆشنبیر وەک ڕەگەزی سەربەخۆ و هوشیاریی گشتی لەبەرامبەر رۆشنبیرانێک دا ڕاست دەکرانەوە کە تەنها وەک کەسانێکی پسپۆر لە خزمەتی سەرمایە یان دەوڵەت دا بوون، وەک تەکنیککاران و، دادوەران و، مامۆستایان. لەو کاتەوە کە چالاکی پیشەی تایبەتی هەر سێکیان رۆڵی بنەڕەتی دەبینێ لەبە سیاسی بونی دا.. ئیتر دەست دانە کاری نووسەری بە مەرجی رۆشنبیری و شکۆمەندی نادرێتە قەڵەم، لەوە بەدوا بواری پەیوەندی لاوەکی نێوان بەشە جیاجیاکانی زانست و کۆمەڵە سیاسی یە جیاوازەکان فراوانتر بوو: دادوەرەکان و، پزیشکە دەروونیەکان، پزیشکان، یارمەت دەرە کۆمەڵایەتی یەکان، تەکنیک کارە لابوریەکان و کۆمەڵ ناسان، هەریەکەیان توانیان بەهۆی چالاکیان لەبواری کارەکەی خۆیانداو، ئاڵوگۆڕی پشتیوانی بەرامبەر لە ڕەوشی گشتی و بوون بە کەڵە سیاسی دا بەشداری بکەن. ئەم ڕەوتە پیشان دەدات نووسەران وەک میراتگرانی خەیاڵی رۆشنبیران، بەرەبەرە ئاوا بوون یان لە بیر چوونەوە و، دانشگاو ئەوانەی لە دانشگادان نەک وەک ڕەگەزی سەرەکی، لانی کەم وەک هۆکاری (ئاڵوگۆڕی زانیاری و بیروڕا) و بەشێوەی دیاردەی هاوبەشی رۆشنبیران سەریان هەڵدا.

گەر دانشگاکان و فێرکردن و ڕاهێنان لە ڕووی سیاسی یەوە بوونە مەیدانی گرنگ. لە ڕاستیدا بەم هۆیەوەیە. ئەوەی کە بە قەیرانی دانشگاکان ناودەبرێت و بەهۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی دانشگاو دانیشگاییەکانەوە نی یە، بە پێچەوانەوە بەهۆی زیادکردنی دەسەڵاتیان و زیادبوونی رۆڵیانە وەک سەنتەری ئاراستەکردنی دەسەڵات. سەنتەرێک کە دەبێ هەموو رۆشنبیران بچنە ناویەوە یان پەیوەندیەکی پێیانەوە هەبێت.

هەموو ئەو هەوڵی تیۆریزە کردن و بانگێشەی بێ پایانە لەمەڕ نووسەر و نوسەریەوە، بێگومان هیچ نەبوو جگە لە ناقوسی مەرگی چەندین ئیمتیازی تایبەتی سیاسی. کە

نووسەر تا ئەو سەردەمە هەیبوو. لەسەر بنەمای تیۆرییەکانی سەرەوە هەوڵی پاراستنیانی دەدا. بەڵام ئەو راستیە کە نووسەر بۆ پاراستنی پلەو پایەی خۆی پێویستی بە شیکاریەکی تایبەتی تیۆری هەبوو. وەک ئەوەی کە نووسەر پێویستی بە متمانەیەکی زانستی پشت بەستو و بەچەند دەستکەوتێک هەبوو لە بواری زمان ناسی و نیشان ناسی و دەرون ناسی دا. ئەم تێزرانەی سەرەوە پشتی بە بۆچوونەکانی (دی سۆسێرو، چۆمسکی) و کەسانی تر دەبەست و. بەری راستەقینەی ئەم تیۆرانە چەند بەرهەمێکی ئەدەبی لاواز بوو، ئیتر هەمووان ئەو راستیە دەسەلمێنن کە نووسەریی ئەلقەی هەموو چالاکیەکان پێکناهێنێت.

وا بزانم ئەو کەسایەتی یەی وەک رۆشنبیری (تایبەت) ناومان لێ نا، لە دەوروبەری جەنگی جیهانی دا سەری هەڵدا. کە دەتوانین لێکۆڵەرەوەی فیزیکی ئەتۆمی (ئۆبن هایمەر) وەک خاڵی وەچەرخان و تێپەڕین. لە رۆشنبیری (گشتی) یەوە بۆ رۆشنبیری (تایبەت) ناو ببەین. زانای فیزیکی ئەتۆم بەهۆی پەیوەندی بابەتی و راستەوخۆی بە زانست و ئۆرگانە زانستی یەکانەوە، توانی دەست وەرداتە کاروباری سیاسی، بەڵام بەهۆی پەیوەندیەک کە مەترسی جەنگی ئەتۆمی هەی بوو بە مرۆڤایەتی و چارەنووسی جیهانەوە، لە هەمان کاتدا وتەکانی بوونە دەربڕینی گشتی و هەمەلایەنە. پسپۆری فیزیکی ئەتۆمی بەو بەهانایەوە کە نارەزایی دەربڕین دژی مەترسی جەنگی ناوەکی پەیوەندی بە هەموو جیهانەوە هەیە، پایەی تایبەتی خۆی لە سستەمی زانستی جیهان دا جێگیر کرد. وابزانم ئا لێرەدا بۆ یەکەمین جار رۆشنبیرێک نەک بە هۆی ووتەو وتارێکی گشتی و هەمەلایەن کە دەری دەبڕی، بەڵکو بەهۆی زانستێکەوە کە هەی بوو، بووە مایەی لێپێچانەوەی لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی یەوە: چونکە لەو بوارەدا مەترسیەکی سیاسی دروست کردبوو. لێرەدا تەنها لە رۆشنبیری رۆژئاوایی دەدوێین، ئەوەش بەسەر رۆشنبیری داهات لە شووروەوی، تا رادەک بەنیسبەت رۆشنبیرەوە... یەک هەل و مەرجی هەبوو وەک رۆژئاوایی یەکان، بەڵام لە هەندێک رووەوە لێک جیاوازن. لە راستی دا دەبێت لێتوێژینەوەیەکی وردو تەواو لەبارەی ئەو نارەزایی و دژە کردەوە زانستیانەی رۆژئاوا و وڵاتە سۆسیالیستەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهان ئەنجام بدرێت،

دەتوانین ئەوە بڵێین کە رۆشنبیری (گشتی) ئەو رۆشنبیریەی کە لەسەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست دا، لە مێژوودا رۆڵیان بینیووە، لە کەسایەتی مێژوویەیی تایبەتی یەوە سەرچاوەیان گرتووە: مرۆڤی پارێزەر و بەرگریکەر لە داد و یاسا، واتە کەسێک کە هەموو کات لە بەرامبەر دەسەڵاتداری زۆرداروو ستەمکارو هەڵپەرست و، ماف

پێشێل کەر بەهۆی سامانەوە وەستاوە و هەوڵی جێگیر کردنـی دادوەری گشـتی و یەکسانی داوە. لە بەرامبەر یاسا دا و لەم کارەشی دا وەک نموونە و پێشڕەو ناسراوە.

هەوڵدان و خەباتی مەزنی سیاسی لە سەدەی هەژدەیەم دا لـە بـواری یاسـا و، مـاف، یاسای بنەڕەتی و ئەوەی لە دیدی هۆش و یاسا وە عادیلانەبووەو دەبێ هـەموو لایـەک بگرێتەوە سەری هەڵدا.

وابزانم سەرچاوەی دروست بوونی ئەوەی لەم سەردەمەدا بە ڕۆشـنبیری نـاو دەبـەین (ڕۆشنبیر) بە واتای سیاسی نەک بە واتای کۆمەڵ ناسـی یەکـەی. یـان ڕونـتر مەبەسـت کەسێکە بە لێودشایی یەوە سود لە زانـین و توانـای پـەیوەندی خـۆی لەگـەڵ ڕاستی‌دا، لەبواری خەباتی سیاسی دا وەردەگرێت. ماف ناس یان لانـی کـەم کەسـێکە لـە پێنـاوی سەلماندن و بەرگری کـردن لـە سـەرلیاگیری و هەمەلایەنـەیی یاسـایەکی عادیلانـە دا، ئامادەی ئەوەیە تەنانـەت لـە پلـەو پایـەی دادوەری بکەوێتە گومانـەوە. (ڤۆلتـێر) لـە فەرنسادا نموونەی ئەم جـۆرە ڕۆشـنبیرانە بـووە. ڕۆشـنبیری گشـتی لـە مـاف نـاس یـان کەسێتی ناودارەوە وەرگیراوە و دەربڕینی تەواویشی لە نووسـەرێک دا دەبینێتـەوە. کـە هەڵگری چەندین واتاو بەهادارییەو بۆ هەمووان بەنرخن.

ڕۆشنبیری (تایبەت) لە کەسێتی مێژوویی زۆر جیاوازی-زانا یـان پسـپۆڕ- کـە مـاف نـاس یـان بـەناوبانگ نی‌یـە، سـەرچاوە دەگـرێ، پێشـان وتمـان بـەهۆی زانـای فـیزیکی ئەتۆمیەوە بوو کە سیمای ڕۆشنبیری (تایبەت) لە مێژوودا خۆی نواند. پێشـان ووتمـان لەوەو بەر ڕۆشنبیری (تایبەت) نا ڕاستەوخۆ لە مەیدان دا ئامادە دەبوو.

دەتوانین بڵێین لانی کەم نزیکـی کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەم لـە گۆشـەیەکی بـواری مێژوودا خۆی نواند. بێگومان سەرهەڵدانی سیمای ڕۆشنبیری (تایبەت) لەگەڵ (داروین) دا یان پەیڕەوانی بیروڕای (نەشونما) دا دوای (داروین) دەستی پێ‌کـرد. پـەیوەندی بـە مشتومڕی بـاوەڕدارانی تیـۆەری (نەشـونما) و سۆسیالیستەکان و هـەروەها کـاریگەرەی گرنگی تیۆری (نەشونما) لەسەر (کۆمەڵناسی و، ئەستێرەناسی و، نۆشداری دەرونـی و، زانستی چاککردنی نەژاد) هەلومەرجی گرنگی ئەم شێوازە ڕوون دەکاتەوە. کە بەهۆیەوە زانایەک بە ناوی ئەوەی کە لە یەکێ لە بەشەکانی زانست دا وەک ڕاسـتی یـەکی زانسـتی دەدرێتە قەڵەم. بێ گوێ دانە گرنگی گشتی ئەو بەشەی زانست. ئیدی هەوڵی چوونە نێو سیاسیەت و بەشداری کردنی لە کێشەو ململانێی سیاسی سەردەمدا دەدات.

لەنێو ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا دا (داروین) وەک ئەم خاڵی وەرچەرخانـە لێـک دەدرێتـەوە، (زۆلا) یـش لـەم ڕووەوە جـێی سـەرنجەو لـە دەسـتەی ڕۆشـنبیرانی گشـتی دا پۆلێـن دەکرێت. هەرچەندە خولزیاری یاسـا و هـەوڵدانی ڕێگەی دادپـەروەری و یەکسـانی بـە، کەچی وتەو باساکانی پڕن لە تیۆەرەکانی (نەخۆشی ناسـی و، نـەش ونمـا) و نموونـەیان

لێ دەهێنێتەوە، سەرەڕای کەمی زانیاری دەربارەیان، بەڵام باوەڕی بە گرنگی زانستی‌ی یان هەبووە، لە ڕاستی دا کاریگەری ئەم پشت پێ بەستنانە بە پێ‌ی دەربڕین و لێدوانەکانی (زۆلا) گەلێک ئەم و مژاوین. بۆ تاو توێکردنی وردتری ئەم بابەتە دەبێت ڕوونی بکەینەوە کە چۆن زانای فیزیکی ئەتۆمی سەرلەنوێ هاتەوە ناو ململانێ‌ی سیاسییەوە.. لەم ڕووەوە باس و خواسی خاوەن ڕایانی سۆسیالیست و ڕێژەییەکان گەلێک گرنگن. بەشەکانی (بایەلۆژی و فیزیک) بەتایبەت لەم ڕەوە تایبەتەکانی سەرهەڵدانی ئەم سیما نوێیەن، واتا ڕۆشنبیری (تایبەت). بەکار هێنانی دەست کەوتە زانستی و تەکنیکی یەکان لە قەڵەم ڕەوی ئابووی و ستراتیژیدا، گرنگیەکی تەواو شایستەی بەخشیە ڕۆشنبیری تایبەت و، کە سایەتیەک کە کاری کردوو متمانەو ئیعتیباری ڕۆشنبیری نوژەن تیایدا ڕەنگی دایەوە یان دەداتەوە، ئیتر نووسەری (هەڵکەوتوو )نی یە، بەڵکو زانایەکە بە تەواوی مانا. ئیتر کەسیەتێکی هەڵگری بەها گشتی و هەمەلایەنی یەکانی یەو دەنگی نارەزایەتی بەرز ناکاتەوە دژی بێ عەدالەتی ڕژێمە دەسەلاتدار و وەزیرەکانیان و، بانگەشەی عەدالەت خوازی ناگەیەنێتە گوێ‌ی هەمووان. بەڵکو کەسێکە هاوڕێ‌ی چەند کەسێکی ترە، چ لە خزمەت دەوڵەتدا یان لە دژیدا لە توانای دایە ژیان نەهێڵێت. یان ژیان خۆش بکات و ئاسوودەیی و خۆش گوزەورانی بهێنێ، ئیتر گێرەرەوەو ویژدانی ئەبەدیەت و ئەمری نی‌یە، بەڵکو داڕێژەرو بەرنامە ڕێژی ژیان و مردنە. ئالێرەوە شایەتی لەنێو چوون و ئاوابوونی نووسەری (بەرزین).

ئەگەر لە وردەکاریەکانیش بکۆڵینەوە، دەبێت باوەڕ بەوە بێنین، لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر پێکهاتە زانستی و تەکنیکی یەکاندا هات، لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا، ئیتر ڕۆشنبیری (تایبەت) گرنگی خۆی پەیدا کرد. بە تایبەت ئەم ڕووداوە دوای دەیەی (١٩٦٠) پەرەی سەندووەو، ڕۆشنبیری (تایبەت )یش ڕوو بەڕووی هەندێ کەند و کۆسپ و تەگەرەو مەترسی دەبێتەوە، وەک مەترسی ئاوێتە بوون یان نقوم بوون لە جۆرێکی دیاری کراو لە چالاکی و خەبات، یاخود سوربوون لەسەر جۆرێک خواست کە بە تایبەت بەشێکی دیاری کراوی خەڵک دەگرێتەوە، یا مەترسی چوونە ژێر کاریگەری ئەو پارتە سیاسی و یەکیەتیانەی کە جڵەوی ڕێبەرایەتی ئەم چالاکیە بابەتیانە دەگرنە دەست. مەترسی ئەوەی کە توانای تەواو کردن و گەڵاڵەکردنی ئەم جۆرە چالاکیانەیان نەبێت. بۆچی؟ چونکە ئەم بارە پێویستی بە ستراتیژی گشتی و پشتیوانی گروپەکانی تر هەیە. یان مەترسی ئەوەی کەکەس پەیڕەوی‌یان نەکات یان ژمارەیەکی کەم وەدوویان کەون. لەم هەلومەرجەی ئێستادا لە فەرەنسادا نمونەی ئەمانەی سەرەوە کە باسمان کردن دەبینین، هەوڵی چاککردنی باری زیندانیەکان و، سیستەمی پۆلیسی داد. ئەویش

بە شێوەیەکی جیا لە هەوڵەکانی تر، لەنێوان یاریدەدەرە کۆمەڵایەتیەکان و زیندانیەکانی پێشوودا دروست بووە، کە تا دێت مەترسی دابڕان و دورکەوتنەوە لەو هێزانەی کەبۆ بە ئاکام گەیاندنی ئەم جوڵانەوانە پێویستن زیاد دەکات. ئەم جوڵانەودیە کەوتە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیایەکی کۆنەوە، کە گوناهباران دەگۆڕێت بۆ قوربانی بێ گوناه و، شۆڕشگێڕی دەکەن و، بەرخی گیانفیدای کۆمەڵ و، گورگی ڕایە ڕین و شۆڕشەکانی داهاتوو. ئەمە گەڕانەوەیەکە بۆ ناوەڕۆکی ئانار شیستی دوادوا کانی سەدەی نۆزدەهەم کە تەولو کەماڵ بوو، بەهۆی پاماڵ کردنی یەکێتی ستراتیژە باوەکانەوە دروست بووە. لە ئاکامی ئەم شالاوو ئاهەنگە کزو کڕوزانەوە بەردەوامەکەی دا تەنها گوێ بیستانێکی کەمی بۆ خۆی ڕاکێشاوەو، کەلێنێکی گەورەی کردۆتەوە نێو ریزەکانی کۆمەڵانی خەڵک. خەلکێکێک کە لەلایەکەوە بەلگەی تەواوی سەلمێنراویان هەیە کە وەک جوڵانەوەیەکی سیاسی باوەڕپێکراو سەیری نەکەن و نەدەنە پاڵی و، لەلایەکی ترەوە بەهۆی بڵاوبوونەوەو بەردەوامی ترس لە بڵاوبوونەوەی تاوان لەنێو خەڵک دا. بە پاراستن و یان ڕوونتر بڵێین بەبەهێزکردن و پشتیوانی کردنی دەزگا پۆلیسی یە دادوەریەکان ڕازی دەبن. ئیستا لە قۆناغێکدایین کە دەبێت چاو بەڕۆڵی ڕۆشنبیری (تایبەت) دا بگێڕینەوە. بەلام سەرەڕای داخ و ئەفسوسێک کە هەندێ هێمان بۆ ڕۆشنبیری گشتی دەیکێشین و، لەگەڵ ئارەزووی گەیشتن بە فەلسەفەو جیهانبینیەکی نوێ، نابێت ڕۆڵی ڕۆشنبیری (تایبەت) پشت گوێ بخرێت، تەنها ئەوە بەسە کە دەسکەوتە مەزنەکانی بواری پزیشکی دەروون ناسی بگرینە بەرچاو: ئەم دەسکەوتانە دەیسەلمێنن کە چالاکی و هەوڵی تایبەت هەڵوێستێکی هەڵە نەبووە و بێ ئاکام نەبووە. لەمەش زیاتر دەتوانین بڵێین کە ڕۆشنبیرانی تایبەت وەک لێکۆڵەرەوەی فیزیکی و ئاوکی و، شارەزای بایۆلۆژی و، ئالوگۆڕی زانیاری و، دەرمان سازی کە لە هەوڵ و چالاکی دان، ڕۆڵیان مەزنتر و گرنگترە لەو لێپرسراوی و پلە سیاسی یەی کە دەبێت وەری گرن. گەر پەنا ببەینە بەر ئەو بەهانەیە کە ئەم بابەتەی دوایی تەنها پەیوەندی بە شاردزایان و پسپۆڕانەوە هەیە (بە مانەی زیاتر: چونکە کۆمەلانی خەڵک یش ئاگایان لەو بابەتانەیە، مەسەلەکە ئەوانیش دەگرێتەوە) وەیان بڵێین ڕۆشنبیری (تایبەت) لە خزمەتی سەرمایە یان دەولەت دایە (ئەمەش خالێکە کە لە ڕاستی دا پایەی ستراتیژی ئەو دیاری ددکات). یا ئەوە بڵێین کە ڕۆشنبیری (تایبەت) بەردەو پێدەری ئایدۆلۆژیای زانستی یە (کە ئەمەش ڕاست نی یە. بەلام بەهەر حاڵ برەودانی ئایدۆلۆژیای زانستی. بە نیسبەت ئاکامەکانی خستنە ڕووی ڕاستیەکانەوە، ڕۆڵێکی لاوەکی دەبێت). لەسەر ئەم بنەمایانە ئەگەر گرنگی بە سیاسی یەکەی بەهۆی

پەیوەندیەکی تایبەت کە بەشێوەی بابەتی دەسەڵاتەوە هەیەتی کەم بکەینەوە، ئەوا دوچاری هەڵەیەکی پڕ مەترسی بووین...

خاڵی گشتی و هاوبەش ئەوەیە حەقیقەت لە دەرەوەی دەسەڵات ببینین، یان دەسەڵات خاڵی نیە لە حەقیقەت. بەپێچەوانەی وتە ئەفسانەییەکانەوە، کە مێژوو و رۆڵی ئەو وتانە پێویسیان بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی هەمەلایەنە تر هەیە. حەقیقەت پاداشی مرۆڤە بێ ئیرادەکان و ئەوانەی خۆیان پێ کۆت کردووە نی یە، هەروەها زادەی گۆشەگیری و جەورکێشانی بەردەوامیان نی یە. ڕاستی یەکان پەیوەندی یان بەم (گۆ) خاکیەوەیە، لەئاکامی هەل و مەرج و قەید و بەندی بێ ئەژماردا دروست بوون و بوونەتە سەرچاوەی هەمیشەیی دەسەڵاتداری. لە هەر کۆمەڵێک دا دارشتنی ڕاستی و (سیاسەتی گشتی) چاودێر لەسەر ڕاستی هەیە و دارای چەندین ئۆرگانە کە توانای جیاکردنەوەی ئەحکامی ڕاست و ناڕاستی، یان بە عیبارەتێکی تر هەر کۆمەڵگایەک دارای سیستەمێکی بەبانگەرە، کە لە ناوەرۆکی دا حەقیقەت کاریگەری خۆی هەیە، هەروەها هونەر و ڕەوشی جیاجیای گەیشتن بە حەقیقەت هەیە و. لە ڕاستی دا دارای کەسانێکە کە ئەرکی دیاری کردنی ئەو حەقیقەتانەیان لەسەر شانە. لە کۆمەڵگایەکی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا (ئابووری سیاسی حەقیقەت) بەهۆی پێنج تایبەتمەندی مێژوویی و گرنگەوە ئاشکرا دەکرێ: حەقیقەت بەشێوەی دەربڕینی زانستی و چەند پێوەرێکەوە کە بەدیان هێناوە و بەرجەستەی دەکەنەوە. هەروەها حەقیقەت لەژێر کاریگەری هەل و مەرجی ئابووری و سیاسی دایە (ململانێی حەقیقەت بەقەدەر بەرهەم هێنانی ئابووری بۆ دەسەڵاتی سیاسی گرنگی هەیە). ڕاستیەکان بەشێوە و شێوازی جیاواز و بە بەرفراوانی پەرەی سەندووە و کەڵکی لێ وەردەگیرێ و (لە دەزگاکانی پەروەردەکردن و زانیاری دا ڕۆڵ دەبینێ، بواری کاریگەریەکەشی سەرەڕای ڕادە بۆدانانی ئاشکراو بەرینە).

حەقیقەت ئەگەر لە پاوانی چەند دامەزراو و بنکەی مەزنی ئابووری دا نەبێت، لانی کەم لە ژێر چاودێری و دەسەڵاتی ئەوان دا داڕێژراوە و تەشەنە دەکات، وک: (سوپاو پەیوەندیە گشتی یەکان و. دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن). حەقیقەت بابەتی کۆمەڵێک باس و خواس و کێشمەکێشی کۆمەڵایەتی یە، (چالاکیە ئایدۆلۆژیەکان). بەڕای من نابێت ڕۆشنبیران بە (پەیامبەری بەهاگشتی و جیهانگیریەکان) بزانین، ڕۆشنبیران کەسانێکن کە ئاست و پایەیەکی دیاری کراویان دراوەتێ. بەڵام لە کۆمەڵێکی وەک ئەم کۆمەڵەی ئێمەدا ئەم پایە پێدانە بەستراوە بە کارکردنی گشتی دەزگای حەقیقەتەوە. بە واتایەکی تر ڕۆشنبیر بەهۆی چەند تایبەتمەندیەکی سێ لایەنەوە دیاری دەکرێن: یەکەم-تایبەتمەندی شوێنی چینایەتیەکەی (وورده بۆرژوایەکە لە خزمەتی سەرمایەدار دایە. ڕۆشنبیری (ئۆرگانیکی) چینی کرێکارە). تایبەتمەندی هەل و مەرجی پیشەو

ژیانەکەی کە بەستراوە بە ئاست و پایەیەوە، وەک رۆشنبیرێک (شوێنێک کە لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەی تیادەکات، پایەی لە تاقیگادا، باری ئابووری و سیاسی لە دانشگا و، نەخۆشخانەو... هتد. سەروکاری لەگەڵیان دایە یاخود لە نژیان دا هەڵوێست وەردەگرێت). لە دوایشدا تایبەتمەندی سیاسەتی چاودێر بەسەر حەقیقەتەوە لە کۆمەڵی ئێمەدا. پلەو پایەی رۆشنبیر لە ولاتی ئێمەدا بەهۆی ئەم هۆکارانەی سەردوە گرنگی یەکی گشتی پەیدا کردووەو، نەبەردە بابەتی یە تایبەتەکەی چەند ناکامیکی لێ دەکەوێتەوە، کە تایبەت نین بە پیشەیان بەشێکی تایبەت لە کۆمەڵ دا. دەتوانێ بە شێوەیەکی گشتی دژی ئەو کۆمەڵە حەقیقەتە دروستکراوەکە گرنگیەکی دیاریان هەیە، لە پێکهێنان و کارکردنی کۆمەڵ دا بوەستێ یان چالاکانە لەنێویان دا هەڵسوڕێ. خەبات و هەوڵدان بۆ حەقیقەتە یان لانی کەم لە (بواری حەقیقەت) دایە. جارێکی تر جەخت دەکەم کە مەبەست لە حەقیقەت (کۆمەڵە حەقیقەتێک نیە کە بیان دۆزینەوە و پێیان رازی ببین) بەڵکو (کۆمەڵە دەستورێکە لە سەرو ئەو بنەمایانەوە راست لە ناراست جیا بکرێنەوەو، بەهۆیانەوە شێوەی دیاری کردن و رونکردنەوەی تایبەتی دەسەلات بە حەقیقەتەوە گرێ دەدرێ).

دەبێت ئەوەمان لە یاد بێت کە ئامانجی ئەم خەباتە گەیشتن نی یە بە حەقیقەت، بەڵکو هەوڵدانە بۆ ئاراستەپێدانی پێوانەو شوێنی حەقیقەت و رۆڵی سیاسی و ئابووری حەقیقەت... دەبێ پلەو پایەی رۆشنبیران لەسەر ئاستی (حەقیقەت) و (دەسەلات) دیاری بکەین، نەک لەسەر ئاستی (زانست) و (ئایدۆلۆژیا). بەمجۆرە دەتوانین بە شێوەیەکی نوێ لەگەڵ کێشەی پیشەیی بوونی رۆشنبیران و دابەش کردنی کاری فیکری و دەستیان دا رووبەڕوو ببینەوە. ئەم کۆمەڵە بابەتەی باسمان کردن زۆر ئاڵۆز و نادیار دەنوێنن، بەڵێ نادیار چونکە ئەوەی لێرەدا هاتووە دەبێت وەک گریمانەیەک لەبەرچاو بگیردرێت: بۆ روونتر کردنەوەی زیاتری بابەتەکان چەند شتێک دەخەمەروو. ئەم شتانەش بڕیاری تەواو نین، مەبەستیش لەم خستنەرووە بۆ پیاداچوونەوە و تاقی کردنەوەیانە لە داهاتوودا:-

× مەبەست لە (حەقیقەت) سیستەمێکە لە رەوشی رێکو پێک بۆ بەرهەم هێنان و، دابەش کردن و، وەگەڕخستن و کارکردی فەرمان.

× حەقیقەت لەلایەکەوە پەیوەندیەکی هاوتەریبی لەگەڵ ئەو سیستەمە دەسەلاتداریانە دا هەیە، کە خۆیان حەقیقەتیان دروست کردووە و لەلایەکی ترەوە پەیوەندی بە کاریگەری و ئاکامەکانی دەسەلاتداری یەوە هەیە، کە خۆیان زادەی حەقیقەتن و لە رێگەی حەقیقەتەوە تەشەنەو بلاو دەکرێنەوە، بە واتایەکی تر دەتوانرێ لەشێوەی دارشتنی حەققیەتەوە بدوێین.

× دارشتنی حەقیقەت بە تەواوەتی لە ئاستی ئایدۆلۆژیا یان سەرخانەوە نی یە، بەڵکو یەکێکە لە مەرجەکانی پێکهاتن و دروست بوونی سەرمایەداری، (هەر ئەم دارشتنە ) بە هەندێ گۆڕانکاریەوە لە ولاتە سۆسیالیستەکان دا پەیرەو دەکرێ. (مەسەلەی ولاتی چین بە مەسەلەیەکی داخراوو کۆتایی هاتوو نازانم، چونکە زانیاری تەواوم لەسەری نی یە ).

× مەسەلەی تەوەرەی سیاسی رۆشنبیران، ئەورەخنەگرتنە لە ناوەرۆکی ئایدۆلۆژیایەک کە ئاوێتەی زانست بووە و، نە دەستەبەرکردنی دروستی ئایدۆلۆژی یە بە پەیوەندی لەگەڵ کردەوەی زانستی دا. بەڵکو بەدەست هێنانی دڵنیای یە لە بەرقەرار کردنی سیاسەتی نوێی چاودێر بەسەر حەقیقەت دا، مەسەلەکە گۆڕانکاری (هۆشیاری و بە ئاگایی ) ئاکەکانی کۆمەڵ نی یە لە باوەڕیان دا، بەڵکو گۆڕینی سیستەمی سیاسی و ئابووری یەکە، کە حەقیقەت دروستی دەکات. مەسەلەکە رزگار کردنی حەقیقەت نی یە لە کۆت و بەندی سیستەمی دەسەلاتدار، (ئەم رزگار کردنە خەیاڵی یە، چونکە حەقیقەت خۆی لە خۆی دا دەسەلاتە ). بەڵکو ئەوەی لە ئێستا دا مەبەستە جیاکردنەوەی دەسەلاتە لە شێوەکانی رێبەرایەتی کردنی ئابووری و، کۆمەلایەتی و،فەرهەنگی. کە ئێستا لەو چوارچێوەیەدا چالاکە.

بە کورتی: کێشەی سیاسی ئێمە هەلە، دوو دڵی، بەناگایی، نامۆبوون یا ئایدۆلۆژی نەبووە، بەڵکو خودی حەقیقەتەو هۆی گرنگی پێدانی ئاکامەکەیشی لەمەدایە.

× × × × × ×

تێبینی: ئەم ووتارە کورتکراوەیە کە لە گفتوگۆی (میشێل فۆکۆ ) لەگەڵ (ئەلکساندەر فۆنتانا ) و (باسکاڵ پاسکینۆ ) کە یەکەم جار لە (پولتیک هیدو ) ی ژمارە - ٢٤٧ -. - ٢٦ - ی نۆڤەمبەری - ١٩٧٦ - دا بلاوکراوەتەوە.

سەرچاوە:

لە گۆڤاری کیهانی فرهنگی ژمارە (٢ )ی سالی - ١٩٩١ - وەرگێڕاوە.

## (بەرەو ڕەخنەگرتن لە عەقلی سیاسی)[*]

نووسینی: میشال فۆکۆ

وەرگێڕانی بروا علاءالدین

(١)

دەزانم ناونیشانەکە شتێک لە پڕو پاگەندە لەخۆ دەگرێ. بەلام عەقل پۆزشی تایبەتی تێ. چونکە بیری خۆراوایی، لەسەدەی نۆزدەیەمەوە، سەرقالی ڕەخنەگرتنە لە ڕۆلی عەقل-یان پێوانی عەقل- لەناو بونیادە سیاسیەکاندا، لێرەوەیە، خۆتاودانە ناو پڕۆژەیەکی بەرفراوانی لەم جۆرە، بۆ جارێکی ترلە جێی خۆیدا نیە، بەلام زۆرینەی هەوڵدانەکانی پێشووتر بریتی‌یە لە دەستەبەر و مسۆگەرکردنی ئەوەی کە هەموو کارێکی تازە پشت بەو سەرکەوتنانە دەبەستێت کە کارەکانی پێشوو چنگیان کەوتووەو، لەهەموو بوارەکانیشدا سەرکەوتوانە دەردەچێت.

هەر لە سەرەتاوە خۆم بە شلەژاوی دەبینم وەک یەکێک کەلە توانایدا نیە جگە لە پێشکەش کردنی هەندێک هێلکاری، کە وەدەست خستنی قورسە، هیچی دی بکات. لەکاتێکی کۆنەوە فەلسەفە وازی لە هەوڵدانی قەرەبوو کردنی دەستەپاچەیی عەقلی زانستی هێناوە و چیتر هەوڵ بۆ تەواوکردنی قەلاکەی نادات. یەکێک لە ئەرکەکانی ((ڕۆشنەگەری)) بریتی بو لەوەی تواناکانی عەقلی سیاسی دوهێند بکرێن. بەلام خەلکانی سەدەی نۆزدە هەر زوو پرسیاریان لەوە دەکرد ئاخۆ عەقل لە کۆمەلگاکانماندا لە ڕادە بەدەر بە هێز نەبووە. تا ئەو ڕادەیەی دڵە ڕاوکێ دەیگرتن لەو پەیوەندیەی بە ئالۆزی پێشبینیان دەکرد. لەنێوان کۆمەلگایەکدا کە بەلای عەقلانیەتدا لادەدات و لەنێوان ئەو مەترسیە کاریگەرانەی بەسەر تاک و ئازادی تاک و بەسەر ڕەگەزی ئادەمیزاد و مانەوەشیەوە هەیە.

بە دەربڕینێکی تر، ڕۆلی فەلسەفە لەسەردەمی کانتەوە بریتی‌بووە لە ڕێگرتن لە عەقل لە تێپەڕاندنی سنووری ئەوەی لە ئەزموونی دراوە.

بەلام هەر لەو کاتەوە، واتا لەگەل بلاوبونەوەی دەولەتە نوێکان و ڕێکخستنی سیاسی کۆمەلگا-ڕۆلی فەلسەفە بووەتە ئەوەی چاودێری خراپ بەکارهێنانی دەسەلاتی

---

[*] نووسینی: میشیل فۆکۆ، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: جورج ابي صالح گۆڤاری (الفكر العربي المعاصر). ژمارە((٤٣))-١٩٨٧. ئەم بابەتە دو چاپتەرە بەلام ئەمە تەنها چاپتەری یەکەمە (و: کوردی).

عەقڵانی سیاسی بکات. کە وەک هیوایەک بە ژیانێکی دیاریکراو و تەواو بەدەستی دەهێنێ.

کەسێک نیە بێ ئاگابێت لەم پرووپوچێتیانە، بەڵام کە پڕو پووچە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە بوونی نی‌یە، بەڵکو لەبەردەم واقیعە پووچەکاندا مافی ئەوەمان هەیە ئەوە ئاشکرا بکەین، یاخود هەوڵی ئاشکرا کردنی ئەو کێشە تایبەتی و بنچیەییانە بدەین کە پێوەی بەستراوە.

پەیوەندی نێوان (عەقلانی کردن)و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی پەیوەندیەکی بەڵگەنەویستانەیە. پێویستیش بەوە ناکات چاوڕوانی بیرۆکراتیەت یا ئۆردوگای گرتووخانەکان بکەین بۆ ئەوەی دان بە هەبونی لەم جۆرە پەیوەندیانەدا بنێین. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە ئەو کات دەبێت بزانین لە بەڵگەنەوەیستێکی ئاوهادا کاری دراوەکان چیە؟

ئایا ((دادگایی عەقڵ بکەین؟)) من پێم وایە ئەم کارە بێ‌سوودە. یەکەم، چونکە چ بوارێک نیە نەبۆ تاوانبارکردن و نە بۆ گوناهکردن لەم مەیدانەدا. ئنجا ستەمە گەواهی بەعەقڵ بکرێت وەک ناوەرۆکێکی دژ بە ناعەقڵ. دواجار، لەبەر ئەوەی دادگایی کردنێکی لەم چەشنە بە ناچاری دەمانخاتە بەردەم ئەوەی لەنێوان ڕۆڵی چۆنێتی‌و بێزارکەری عەقڵانی ناعەقڵانیدا هەڵبژێرین.

ئایا ڕۆچینە ناو ئەم جۆرەی عەقڵانیەتەوە کەوا دیارە تایبەتە بە ڕۆشنبیری هاوچەرخمانەوەو مێژووەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕۆشنەگەری؟ وابزانم ئەم چارەسەرکردنەیە کە هەندێ لە ئەندامانی خوێندنگای فرانکفۆرت هەڵیان بژاردووە. کەمن لێرەدا نامەوێت ووتوێژ لەگەڵ بەرهەمەکانیانا بکەم، کە گرنگترین و بەهادارترین کارن. بەڵکو لەلای خۆمەوە پێشنیاری ڕێگەیەکی تر دەکەم بۆ لێکۆڵینەوەی پەیوەندیەکانی نێوان عەقڵانیەت و دەسەڵات:

(١) بێ گومان لە زیرەکیەوەیە کە عەقڵانیەتی کۆمەڵگایەک یا ڕۆشنبیریەک وەک گشتێکی یەکگرتوو چارەسەر نەکەین، بەڵکو ئەم ڕەوتە شی بکەینەوە بۆ چەند مەیدانێک بەو پێ‌یەی کە هەریەکەیان لە ئەزمونێکی بنەڕەتیدا چەسپاوون: شێت بوون، نەخۆشی، مەرگ، تاوان، ژیانی سێکسی... هەتا دوایی.

(٢)ووشەی ((عەقڵانی کردن)) بە ووشەیەکی سامناک دادەنێم. کاتێک هەندێک هەوڵی بە عەقلانی کردنی شتێک دەدەن، کێشە بنچینەییەکە لەوەدا نابێت بگەڕێن بۆ ئەوەی ئاخۆ پابەندی بنەما عەقڵانیەکان دەبن یاخود نا، بەڵکو دەبێت ئەوە ئاشکرا بکەین کە پەنا بۆ چ جۆرە عەقلانیەتێک دەبەن.

(٢)تەنانەت گەر ((سەردەمی ڕۆشنەگەری)) ماوەیەکی زۆر گرنگ بێت لە مێژووماندا و، لە گەشەکردنی تەکنەلۆژیای سیاسی‌دا، ئەوا من پێم وایە پێویستە لە سەرمان بگەڕێینەوەبۆ ڕەوتەکانی زۆر پێشتر، گەر بخوازین تێبگەین لەوەی چۆن ڕەوتمان کردووە بۆ کەوتنە ناو داوی مێژووی تایبەتمانەوە.
ئەوە ((میتۆد))م بوو لە کارەکەی پێشوومدا: شیکردنەوەی پەیوندیەکانی نێوان ئەزموونەکانی وەک شێتی و مردن و تاوان و ژیانی سێکسی و هەمە جۆرە تەکنەلۆژیای دەسەلات.
بەلام ئێستا لە کارەکەم تا کگەرایی لەخۆ دەگرێ یان ڕاستترَ بڵێم شوناس لە پەیوەندیدا بەمەسەلەی ((دەسەلاتی بەتاک بووە))وە. هەموو دەزانین کە دەسەڵات لە کۆمەڵگا ئەوروپیەکاندا بەرەو شێوەی مەرکەزی زۆرتر و زۆرتر گەشەی سەندووە. وەچەندین مێژونوس هەیە لێکۆڵینەوە لەو ڕێکخستنی دەوڵەتە دەکەن بە بەڕێوەبردنی و بیروکراتیەتیەوە، لە ماوەی دەیان ساڵدا.
ئەمەوێت لێرەدا ئاماژە بە توانای شیکرنەوەی جۆرێکی تر لەو گۆڕانکاریە بدەم کە درێژە بەم پەیوەندیە دەسەلاتیانە دەدات. ڕەنگە ئەم گۆڕانکاریەش تا ڕادەیەک هێندە زانراو نەبێت. بەلام پێم وایە بێ بایەخیش نیە، بەتایبەت بۆ کۆمەڵگا نوێکان.
لەم ڕووکەشەدا ئەم پەرەسەندنە ناکۆک دەبێت لەگەڵ پەرەسەندندا بەرەو دەوڵەتی مەرکەزی لە ڕاستیدا من بیر لە پەرەسەندنی تەکنیکەکانی دەسەلات دەکەمەوە کە بەرەو ئاراستەی تاکەکان دەڕوات و تەرخانیش کراوە بۆ ڕابەرایەتی کردنیان بە شێوەیەکی هەمیشەیی و بەردەوام، وەئەگەر دەوڵەت بریتی بێت لە شێوەی سیاسیانەی دەسەلاتی مەرکەزی و چەقبەستوو. ئەوا با دەسەلاتی تاکانەیی ناو بنێین شوانگەرایی (الرعائیة).
لێرەدا ئامانجم ئەوەیە بە هێڵی گەورە وەسفی سەرهەڵدانی ئەم شێوە شوانێتی‌یەی دەسەلات بکەم، یاخود بە لایەنی کەمەوە لەهەندێک دیمەنە مێژووییە کۆنەکانیدا. وە لەوانەی دووهەمدا هەوڵ دەدەم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە چۆن ئەم شوانێتیە بووە هاوەڵی دژەکەی خۆی: دەوڵەت.ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت خوا و پاشا یان سەرکردە بریتیە لەو شوانەی ڕانە مەڕێک شوێنی دەکەوێت، بیرۆکەیەکی باو نەبوو لای یۆنان و ڕۆم. دەزانم هەلومەرجی ئاولرتن (استثناء) هەبووە لەسەرەتادا لە ئەدەبی هۆمیرۆسی، پاشان لە هەندێ لە دەقەکانی ئیمپراتۆریەتی بیەزنتیدا. دواتر دەگەڕێمەوە سەر ئەمە.
بەلام بەگشتی دەتوانین بڵێین خواستنی مێگەل بزر بووە لە دەقە سیاسیە گەورەکانی یۆنان و ڕۆمدا. هەمان بار لە کۆمەڵگا کۆنەکانی خۆرهەلاتدا وانەبووە، لە میسر و ئاشورو (جولەکە) دا، فیرعەونی میسری شوان بووە. وەڕۆژی تاج کردنەسەری گۆچانی

شوانیەکەی لەسەر شێوازێکی سرووتی دەگرتە دەست، وەشیاو بوو پاشای بابل ناودێر بکرێت ((بە شوانی ئادەمیزاد)) وەک یەکێک لە چەندین نازناوی تر، بەڵام خواش هەروەها شوان بووە و خەڵکانی بەرەو لەوەڕگا دەبرد و بژێویشی بۆ دەرەخساندن.
نزایەکی میسری هەیە کە بەم شێوەیە لە خوا دەپاڕێتەوە: ((ئەی ئەو یەزد
انەی بێدار دەمێنێتەوە کاتێ هەموو خەڵکی دەنوون، تۆی کامە چاکە بۆ گایەلەکەت، بۆ ئەوە دەگەڕێیت)).
کۆکردنەوەی نێوان خواو پاشا شتێکی سروشتیە لەبەر ئەوەی هەردووکیان هەمان ڕۆڵ دەبینن: ئەو مێگەلەی پاسەوانی دەکەن یەک شتە، ئەوەتا شوانی پاشایی پاسەوانی بوونەوەرەکانی شوانی خواوەندی مەزن دەکات ((ئەی هاوەڵی بەناوبانگی لەوەڕگا، تۆی بایەخ بە زەویەکەت دەدەیت و خۆراکیشی پێ دەدەیت، تۆ ئەی شوانی هەموو خێر و خۆشیەکان)). بەڵام وەک دەزانین عیبرانیەکان بوون بابەتی شوانێتیان بڵاو کردەوە و بە تایبەتمەندیەکی زۆر بێ وێنە بەرفراوانیان کرد: خوا، تەنها خوا خۆی شوانی گەلەکەیەتی. جگە لە یەک باری پۆزەتیڤی جیاواز نەبێت: کە ((داوود))ە، بەو پێیەی دامەزرێنەری پادشایەتیە بەناوی شوانەوە لێی دەپاڕێتەوە لەبەر ئەوەی خوا گردکردنەوەی یەکێک لە مێگەلەکانی پێسپاردووە.
بەڵام باری جیاوازی نێگەتیڤیشی هەیە: پادشا بەدکارەکان بە شوانە بەدکارەکان بەراورد دەکرێن، ئەمانە مێگەل پەرش و بڵاو دەکەنەوە، لە تێنوێتیدا دەیمرێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان نەبێت نایانلەوەڕێنن. ((یەهو))[×] تاکە خوای ڕاستەقینەو تاک و تەنهایە. ئەو خودی خۆی گەلەکەی دەبات بەڕێوە، تەنهاش بەیاریدەدەری پێغەمبەرەکانی و بەس. وەختێک کە داوودی پادشا دەڵێت ((وەکو مێگەل لەسەر دەستی موسا و هارون گەلەکەت برد بەڕێوە)). بێگومان، ناتوانم ئەکێشە مێژووییە پابەندەکان بەسەر هەڵدانی ئەم بەراوردکاریەوە چارەسەر بکەم و نەگەشەکردنیشی لەبیرکردنەوەی جولەکەدا. تەنها حەز دەکەم خۆم بدەم لە قەرەی هەندێ بابەتی نمونەیی سەبارەت بەدەسەڵاتی شوانیی. وەدەمەوێت ئەو ناکۆکیە ڕون بکەمەوە لەگەڵ بیری سیاسی یۆنانیدایە، ئەو گرنگیە ڕوون بکەمەوە، کە دواتر ئەم بابەتانە لەناو بیری مەسیحیەت و دامەزراوەکاندا وەریانگرتووە.
(١) شوان زیاتر پراکتیکی دەسەڵات بەسەر مێگەلدا دەکات وەک لەوەی بەسەر زەویەکدا بیکات. زۆربەی باوەڕەکان وایە کە شتەکان زۆر لەوە ئاڵۆزترە، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی، پەیوەندی نێوان خواوەند و زەوی و خەڵک جیاوازە لەوەی لای

---

[×] ناوی خوای سەرەکی جولەکەکانە

یۆنانیەکان هەیە. خواوەندی ئەوان خاوەنی زەوی‌بوو، وەئەم خاوەنێتیە بنەڕەتی و رەسەنەش پەیوەندیەکانی نێوان خواوەند و ئادەمیزادی دەستنیشان دەکرد. لەم بارەشدا، پەیوەندی خوا-شوان بەمێگەلەکەیەوە بە پێچەوانەی پەیوەندی رەسەن و جەوهەریەوەیە. خوا زەویەک بە مێگەلەکەی خەڵات دەکات یان پەیمانی پێ دەدات.

(٢) شوان مێگەلەکەی کۆدەکاتەوەو، رێ نیشاندەری دەکات و رابەرایەتی دەکات. ئەوەی گومانی لێ ناکرێت، ئێمە لە بیرکردنەوەی یۆنانیدا ئەو بیرۆکەیە دەبینینەوە کە دەڵێ ئەرک و فەرمانی رابەری سیاسی ئەوەیە کە دوژمنایەتی لەناو شارەکاندا نەرم بکاتەوە و یەکێتیش بەسەر بەربەرەکانێدا زاڵ بکات. بەلام شوان ئەو کەسانە گرد دەکاتەوە کە پەرش و بلاو بوون. لەگەڵ بیستنی دەنگیدا گرد دەبنەوە ((فیکە لێ دەدەمو گرددەبنەوە)). وەبەپێچەوانەشەوە هەر ئەوەندەی شوان دیارنەما ئیدی مێگەلەکە لەیەکتر جیا دەبنەوە. بەمانایەکی تر، هەبوونی مێگەل پابەندە بە هەبوونی راستوخۆی کاری دەست بەجێ‌یانەی شوانەوە. هەر کە یاسا دانەری تازەی یۆنانی، وەک (سۆلۆن)، ئەو ململانێ‌یانەی چارەسەرکرد کە لەئارادابوو، ئیدی پاش خۆی شارێکی بەهێزی وای بەجێهێشت کە بێ ئەویش توانی بمێنێتەوە.

(٣) رۆڵی شوان بریتیە لە دەستەبەرکردنی ئاسودەیی مێگەلەکەی. یۆنانیەکانیش ئەڵێن (خوا شار رزگار دەکات). تا ئەو رادەیەی کە بەراوردی سەرکردەی چاک بکەن بەو ئاژێردەرەی بە ئامازەکەی کەشتیەکەی لە مەترسی دووردەخاتەوە. بەلام ئەو رێگەیەی کە شوان مێگەلەکەی پێ رزگار دەکات زۆر جیاوازە. لەهەمان ساتدا، تەنها مەبەستیش لەوە نیە لەکاتی نزیک بوونەوەی مەترسیدا، هەموویان رزگار بکات. مەسەلەکە هەمووی بریتیە لە سۆزێکی بەردەوام، چونکە شوان بێدار دەبێت بۆ خۆراک پێدانی مێگەلەکەی، وەڕۆژانەش ئالیک و ئاوی بۆ ئامادە دەکات. بەلام لە خواوندی یۆنانی داوای زەویەکی بەپێت و بەروبومی زۆری ئامادەکراو دەکرێت. داوای لێ نەدەکرا رۆژ بەرۆژ خۆراک بدات بە مێگەلەکە .. ئەمەش سۆزێکی تایبەتە، چونکە شوانەکە بەبێ جیاوازی ئاگایی ئەوەی دەکرد کە هەموو مەڕەکانی تێر بکات.

دواتر، دەقە عیبریەکان بە شێوەیەکی تایبەتی جەختی لەسەر ئەم دەسەلاتە سۆزاویە دەکرد: وە راڤەیەکی حاخامی هەیە بۆ سەفەری دەرچوون تیایدا هۆی هەڵبژاردنی (یەهو) بۆ موسا وەکو شوانی مێگەلەکەی روون دەکاتەوە:

دەبوو مێگەلەکەی جێبهێڵێ لەبەر گەرانی لەدووی یەک مەڕی وون بوو دواجار، شتەکە پابەندە بە سۆزێکی ئامانجداریوە!

شوان ئامانجێکی تایبەتی خۆی هەیە لە مێگەلەکەی یان ئەوەتا بەرەو لەوەڕگای وەڕێ بخات، وەیان دەبێ ، بەرەو گەورەکەی بگەڕێنێتەوە.

( ٤ ) جیاوازیەکی تر هەیە پابەندە بەو بیرۆکەیەی دەڵێ [پراکیس کردنی دەسەڵات (( ئەرک ))ە]. پێویست بوو سەرکردەی یۆنانی بڕیارەکانی بۆ بەرژەوەندی گشتی بدات. وەئەگەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆی پەسندتر کرد ئەوا سەرکردەیەکی بەدکارە.
بەڵام فەرمانەکەی فەرمانێکی پیرۆز بوو: تەنانەت گەر ناچار بوو لە کاتی جەنگدا ژیانی بکاتە قوربانی، ئەوا قوربانی دانەکەی بە خەڵاتێکی زۆر بەهادار بار دەکرێتەوە کە: (( ئەمری ))یە. هەرگیز نەدەدۆرا، بەڵام سۆزی شوانیەتی پتر نزیکترە لە (( خۆ قوربانی کردن ))ەوە. شوان هەرچیەک دەکات لە پێناوی بەچاکەی مێگەلەکەیەتی، ئەوە خەم و پەژارەی هەمیشەیی‌یەتی، کاتێ مێگەل دەنوێت ئەو بێدار دەمێنێتەوە.
بابەتی بێداری گرنگە، کە دووڕووی خۆ قوربانی‌دانی شوان دەردەخات.
یەکەم، ئیش و کار و خۆماندووکردنی لە پێنـاوی ئەوانەیە کە نوستون، دووەم، بێدار و شەو نخون دەبێت بە دیاریانەوە.
خەمی هەموویان دەخوات بەبێ ئەوەی یەکێکیان لە یاد بکات.
وا دەکات کە وەکو گشت و وەکو یەک بەیەکیش بیانناسێ نابێ تەنها شوێنی لەوەڕگای مرۆ یاسای وەرزەکانو سروشتی شتەکان بزانێت، بەڵکو دەبێت پێداویستیەکانی هەموو تاکێک بەشێوەیەکی تایبەتی بزانێت. جارێکی دی، ڕاڤەیەکی حاخامی هەیە بۆ سەفەری دەرچوون کە بەم دەستەواژەیە وەسفی ڕەوشتی شوانێتی موسا دەکـات. هـەموو مەڕەکانی بە ڕێک و پێکی دەبرد بۆ لەوەڕاندن- بەم شێوەیە:
یەکەم، بچوکترین تەمەن بۆ ئەوەی فریای نەرمترین گژو گیا بکەوێت. ئنجا تەمەنێکی گەورەتر، پاشان لە دوا جاردا، بەساڵاچووترین کە توانای جووینی ووشک و برنگترین گژو گیای هەیە.
کەواتە دەسەڵاتی شوانێتی بایەخێکی تاکانەیی دەدات بەهەر ئەندامێک لە ئەندامەکانی مێگەل.
ئەمانە چ شتێک نین جگە لەو بابەتانەی کە دەقە عیبریەکان هاوتای دەکەن لەگەڵ زاری (( خوا- شوان و گەلەکەی- مێگەل ))دا.
من هەرگیزیش ئەوە ڕاناگەیەنم کە دەسەڵاتی سیاسـی لـە کۆمەڵگای جولەکـەدا بـەر لـە کەوتنی قودس، بەم ئاڕاستەیە ڕەفتاری کردووە.
تەنانەت بانگەشەی ئەوەش ناکەم کە ئەم چەمکـەی دەسـەڵاتی سیاسـی بـە جۆرێـک لـە جۆرەکان بریتیە لە چەمکێکی پێکەوە بەستراو.
ئەمانە جگە لە بابەتی لێکە جیاواز و ناکۆک چیترنین.
وەدەشبوو مەسیحیەت بایەخێکی گەورەی پێبدات. چ لە سـەدەکانی ناوەڕاستداو چ لـە سەردەمە نوێکاندا، لەنێوان هەموو کۆمەڵگاکانی مێژووشدا، ڕەنگە کۆمەڵگاکانی نیمـە-

مەبەستم لەوڵنەدایە کە لە کۆتایی سەردەمە کۆنەکاندا، لە لاپاڵە خۆرئاواییەکەی کیشوەری ئەورووپیدا دەرکەوتن دوژمنکاری ترین و داگیرکاریترینیان بێت. کە توانای زەبرو زەنگێکی سەیری هەبوو دژی خۆی وەک چۆن دژی کۆمەڵگاکانی تریش بوو. ژمارەیەکی زۆری لە شێوە سیاسیە جۆراو جۆرەکان داهێناوە، وەچەندین جار لەگۆڕنکاری قوڵی لە بونیادە یاساییەکەیدا ساز کردووە. نابێت لەوە غافڵ بین کە تەنها هەر ئەوە پەرەی داوە بەتەکنەلۆژیای ئەو دەسەڵاتەی مامەڵە لەگەڵ زۆرینەی زۆری خەڵکدا دەکات وەک مێگەلێک لە دەستی ژمارەیەکی کەمی شوانەکانیدا. ئاوەها لەنێوان خەڵکدا زنجیرەیەک پەیوەندی ئاڵۆزو ناکۆک هاتە ئاراوە. کە بەڕاستی شتێکی نایابە لە رەوتی مێژوودا.

ئەوەتا پەرەسەندنی تەکنەلۆژیای شوانێتی)) لە بەڕێوەبردنی مرۆڤدا بە ئاشکرا بونیادەکانی کۆمەڵگای کۆنی سەرەو ژور وەرگەڕانەوە.

تاوەکو توێژینەوەیەکی باشی گرنگی ئەم ڕوداوە بکەین، هەنوکە حەز دەکەم بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی بەکورتی سەبارەت بە یۆنانیەکان گوتم، چونکە من پێشبینی ئەو نارەزاییانە دەکەم کە ئاراستەم دەکرێتەوە. یەکێک لەو نارەزاییانە بریتیە لەوەی کە چامەکانی (هۆمیرۆس) ئیستیعارەی((شوانێتی))بەکار دەهێنا بۆ هێمایەک لەسەر پادشاکان.

لە (ئەلیادەو ئۆدیسەدا) دەستەواژەی ((Pomiën -Laôn)) چەند جارێک دەگوترێتەوە. کە هێمایە بۆ سەرکردەکان و ئاماژەشە بۆ مەزنیەتی دەسەڵاتیان.

سەرباری ئەمەش شتەکە پابەندە بە نازناوێکی سروتیەوە. کە تەنانەت لە ئەدەبی هیندی - ئەورووپی کۆندا دواتر دووبارە بۆتەوە.

لە ((Beouvulf))دا پادشا بە شوان دادەنرێت. بەڵام خۆبینینەوەمان لەناو هەمان نازناودا لە چامە داستان ئامێزە کۆنەکاندا، وەک لە دەقە ئاشوریەکاندایە، کارێکە بە تەواوەتی نابێتە مایەی سەرسامی. لە ڕاستیدا کێشەکە وا پێشنیار دەکرێت کە پابەندە بە بیری یۆنانیەوە. چونکە لەوێدا بەلانی کەمەوە کۆمەڵێک دەق هەن ئەو ئاماژانە لەخۆ دەگرن کە بۆ نمونەکانی شوانێتی کراوە. ئەوانیش دەقە (فیساگۆرسیەکانن). ئەوەتا زاراوەی شوان لە (کۆپلەکانی) ئەرشیتاسدا دەردەکەوێ، ئەوانەی ستۆ بی ((Stobëe)) ناوی هێناوون. ووشەی یاسا ((Nomios)) پەیوەستە بە ووشەی شوانەوە (Nemeios)؛ شوان شتەکان دیاری دەکاتو یاسا شتەکان دیاریو تایبەتمەند دەکات. وەک چۆن (زیۆسی خواوەند) ناودەبرا بە ((Nomios))و ((Nëmeios)) چونکە بۆ خۆراک پێدانی ڕانە مەڕەکەی بە بێداری دەمێنێتەوە. دواتر دەبێ والی خۆشەویستی مرۆڤ بێت، واتا خۆپەرست نەبێت. وەدەبێت پڕ گوڕ و تین و بابەخدان بێت وەک شوانێک بێت.

گروبە (( Grube )) پەخشکەری ئەڵمانی کۆپلەکانی (ئەرشیتاس) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە ئەو کاریگەریە عیبریە ئاشکرا دەکات، کە لەناو ئەدەبی یۆنانیدایە. لەکاتێکدا لێدووەکانی تر، وەک دیلاتە (( Delatte )) جەخت لەوە دەکەن کە بەراورد کردنی نێوان خواوەندەکان و والیەکان و شوانەکان، لە یۆناندا شتێکی باو بووە، بەو واتایەی کە سوربوون لەسەری چ کەڵکێکی نیە.

بەتەنها ئەدەبی سیاسی دەهێنمەوە. ئەنجامەکانی گەڕانەکەش ئاشکرایە: نیستیعارەی شوانی سیاسی نەلای (ئیزۆکرات) نەلای (دیمو ستینۆس) و نەلای (ئەرستۆ) دەرناکەوێ. ئەمەیە سەرسامی دەهێنێ کاتێ کەبیردەکەینەوە ئیزۆکرات لە کۆکراوەکانی (( Areo Pagitique )) دا زۆر پێی لەسەر ئەرکەکانی والی دادەگرێت: جەخت لەوە دەکات کە والیەکان دەبێ لەخۆ بوردووبن و بایەخ بە لاوانیش بدەن. لەگەڵ ئەوەشدا، چ پریشکێکی شوانێتی نیە.

لە بەرامبەر ئەمەدا، (ئەفلاتۆن) زۆر جار سەبارەت بە (والی-شوان) دەدوێت. ئەم بیرۆکەیەش لە (کریتیاس) و (کۆمار) و (یاساکان)دا باس دەکا لە (سیاسەتمەدار)دا بەقووڵی لێی دەدوێت.

مەسەلەی شوان لە دانراوی یەکەمیدا بە جۆرێک لە جۆرەکانی لاوەکیانەیە، ولە (کریتیاس)دا هەندێ یاد کردنەوەی ئەو ڕۆژە کامەرانیانە دەبینینەوە کە تیایدا مرۆڤایەتی ڕاستەوخۆ لە خواوەندەکانەوە فەرمانڕەوایی دەکرلو، لە لەوەڕگا مرەکاندا دەلەوەڕێنرا.

هەندێجاریش (ئەفلاتون) جەختی لەسەر پەسەندکاری پێویستیانەی والی دەکرد لە بەرامبەر بەنەنگی کۆماری. دواجار، هەندێ کات مەسەلەکەدەبێتە دیاری کردنی ڕۆڵی لاوەکیانەی والیەکان: لە ڕاستیدا، وکو سەگی پاسەوانی، هیچیان لەسەر نیە، جگە لە گوێڕایەڵی ((ئەوانەی لە لوتکەی پەیژەکەدان)) ((یاساکان)).

بەلام دەسەلاتی شوانێتی مەسەلەیەکی سەرەکیە لە ((سیاسەتمەدار))دا، کە بە فراوانی پێشاندراوە. ئایا دەتوانین سەرکردەو خاوەن بڕیار لە شاردا وەک شوان پێناسە بکەین؟

شیکردنەوەی (ئەفلاتون) تەواو زانراوە، بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارەش پێویست بە دابەشکردن دەکات.

ئەو جیاوازی دەکات لە نێوان ئەو مرۆڤەی فەرمانەکان بۆ شتە بێگیانەکان ڕاگوێز دەکات (ئەندازیاری میعماری) وەئەو مرۆڤەی فەرمان بە گیانەوەران دەدات، لە نێوان ئەو مرۆڤەی فەرمان بە ئاژەڵە تەریوەکان دەدات (وەک گا شاخدارەکان) وە ئەو مرۆڤەی مێگەلێک بەڕێوە دەبات. وەلە دوا جاردا، لەنێوان یەکێکدا کە مێگەلی ئاژەلان

بەڕێوە بەرێت وەیەکێک کە مێگەلی مرۆیی بەڕێوەبەرێت. لێرەدا دەگەین بە رابەری سیاسی: (شوانی مرۆڤ). بەلام ئەم دابەشکردنی یەکەمە ناگاتە ئەوەی ڕەزامەندمان کات و پێویستیشی بە لێدوانی زۆرتر دەبێ. چونکە بەراورد کردنی مرۆڤ بە هەموو ئاژەڵەکانی تر چاک نیە، لەبەر ئەوە گفتوگۆکە سەر لەنوێ لە سفرەوە دەست پێ دەکاتەوە بە نیازی پێشنیارکردنی زنجیرەیەکی تازە لە تایبەتمەندیەکان: لەنێوان ئاژەڵە دڕندەکان و ئاژەڵە مالیەکان، لەنێوان ئەوانەی لە ئاودا دەژین و ئەوانەی لە ووشکانیدا دەژین، لە نێوان ئاژەڵە شاخدارەکان و ئەوانەی بێ شاخن، لەنێوان ئەوانەی سەرپێیان پەنجەدارەو ئەوانەی سەر پێیان یەک لەپە، لەنێوان ئەو ئاژەلانەی کە بە جووتبوون زۆر دەبن و ئەوانەی ئەمە ناتوانن، گفتوگۆکەش لەم لق بەندیە بێ کۆتاییەدا وون دەبێ.

کەواتە، ئەم گەشە بنەڕەتیەی گفتو گۆ و شکستی دوایشی چی دەردەخات؟ ئەوە دەر دەخات کەرێگەی دابەشکردن ناتوانێت چ شتێک بسەلمێنێ مادامەکی بە شێوەیەکی دروست پیادە ناکرێت.

هەروەها ئەوەش ئاشکرا دەکات کە بیرۆکەی شیکردنەوەی دەسەلاتی سیاسی بە پێی پەیوەندی نێوان شوان و ئاژەڵەکانی ئەو کاتە بابەتی ووتوێژ بوو بێ گومان، ئەمە یەکەمین گریمانەیە کەلای گفتوگۆکەران سازدەبێ، کاتێ هەوڵ بۆ ئاشکراکردنی جەوهەری سیاسی دەدەن.

بەلام ئایا بیرۆکەیەکی پڕو پووچ بووە؟ یان دروستتر ئەفلاتون لەسەرکێشەیەکی (فیساگۆرسی) دواوە؟ وا پێدەچێت.. پێولری بوونی ئیستیعارەی شوانیی لە دەقە سیاسیە هاوچەرخەکانی تردا بکەوێتە بەرژەوەندی گریمانی دووەمەوە. بەلام دروستتر دەتوانین لێدوانەکە بەکراوەیی جێ بهێڵین.

ئەام گەرانە تایبەتیەی من ئەو رێگەیە دەگرێتە خۆی کە ئەفلاتون هێرشی پێ دەباتە سەر ئەم بابەتە لە پاشماوەی دیالۆگەکەدا.

یەکەم شت لە رێی بەڵگەی میتۆدیەوە هەڵدەستێ بەو کارە، پاشان پشت بەستن بەو ئەفسانە ناودارەی باس لەو جیهانە دەکات کە بەدەوری خۆیدا دەسورێتەوە.

بەڵگە میتۆدیەکان زۆر مایەی بایەخدانە، بەلام بە راپۆرتی هیچ رەگەزێک ناکرێت مێگەلێک پێک بهێنرێت، بەلکو بە شیکردنەوەی ئەوەی شوان دەیکات، دەتوانین بلێین داخۆ پادشا لە شوان دەچێت یاخود نا؟

ئەرکی شوان بە چی دەناسرێتەوە؟ یەکەم، شوان خۆی بە تەنها لە پێشەوەی مێگەلەکەیدایە.

دووەم، کاری ئەو بریتیە لە شەونخونی کردن بۆ خۆراک پێدانی ئاژەڵەکانی و، چارەسەرکردنی لە کاتی نەخۆشکەوتنی و، کەمێکیش مۆسیقا ژەنین بۆی، بۆ گرد کردنەوەو رابەرایەتی کردنی، وەرێکخستنی زۆربوونی بۆ دەستکەوتنی چاکترین رەچەڵەک. ئاوەها، جارێکی دی بە تەواوی رێکەوتی بابەتە نمونەییەکانی ئیستیعارەی شوانێتی دەکەینەوە، کە لە دەقە خۆرهەڵاتیەکاندا هەیە.

ئەی ئەرکی پادشا بەرامبەر ئەوە چیە؟ ئەمیش وەک شوان وایە، بەتەنیا خۆی لەسەروو شارەوەیە. ئەی ئەوانی تر کە ماوون، کێ بژێوی دەدات بە مرۆڤایەتی؟ پادشا؟ نەخێر. جوتیار و نانەوا. ئەی کێ سەرپەرشتی خەڵکی دەکات لە کاتی نەخۆش کەوتنیان دا؟ پادشا؟ نەخێر پزیشک. ئەی کێ بەهۆی مۆسیقاوە رێ نیشاندەریان دەبێت؟ مامۆستای وەرزش - نەک پادشا. لێرەوەیە خەڵکانێکی زۆر دەتوانن بە وێنەیەکی رەوا رازی ئەم نازناوە بخوازن ((شوانی مرۆڤ)).

سیاسەتمەدار، وەکو شوانی مرۆیی دوژمنی زۆری هەیە. ئنجا گەر بخوازین سیاسەتمەدار لە هەقیقەت و گەوهەریدا چیە، دەبێ هەموو ئەوانەی لێ دوور بخەینەوە کە گەمارۆی دەدات، وەروونی بکەینەوە بەچی لەگەڵ شوان دا جیاواز دەبێت.

(ئەفلاتون) پەنا دەباتە بەر ئەفسانەی ئەو جیهانەی بە جوڵە یەک لەدوای یەکەکان و دژە ئاراستەکاندا لەسەر تەوەرەکەی خۆی خول دەخوات.

لە قۆناغی یەکەمدا، هەموو رەگەزی ئاژەڵ سە ربە مێگەلێک بوون، شوانێکی بلیمەت بەڕێوەی دەبردن. مێگەلی مرۆڤیش راستەخۆ لەلایەن خوداوە بەڕێوە دەبرا. وە دەیتوانی بەروبوومی زەوی زۆر بە دەست بهێنێت، پێویستیشی بەچ پەناگەیەک نەبوو. پاشی مردنیش، مرۆڤەکان دەگەڕانەوە بۆ ژیان. گوزارشتێکی جەوهەری هەیە کە دەڵێت ((لەبەر ئەوەی خوا شوانیانە، مرۆڤەکان هەرگیز پێویستیان بە بونیادی سیاسی نەبوو)).

لە قۆناغی دووەمدا، جیهان بە ئاراستەی پێچەوانە سوڕایەوە، خواوەندەکان، چیتر وەک شوانی مرۆڤ نەمان. ئەوانەی وا خۆیان بینیەوە کە لەو کاتەوە بۆ خۆیان جێهێڵراون. چونکە ئاگریان بەرکەوتوو. ئەو کاتە رۆڵی سیاسیتمەدار چی دەبێ؟ ئایا دەبێتە شوان لە جێی خودا؟ نەخێر؟ هەرگیز. رۆڵی دەبێتە چنینی تۆڕێکی گەورە بۆ شار. گەر مرۆڤ سیاسی بێت ناکاتە ئەوەی خۆراک بۆ وەچەکانی پەیدا بکات و بایەخ بە تەندروستی و پەروەردەیان بدات. بەڵکو مانای کۆکردنەوەیە: کۆکردنەوەی خەسڵەتە جیاوازەکان، کۆکردنەوەی میزاجە ناکۆکەکان، (توندەکان و رەواکان)، بەبەکارهێنانی (مەکوک) رای گشتی میللی.

هونەری فەرمانڕەوایی پادشایی بەندە لەسەر کۆکردنەوەی زیندووەکان لە (یەکەیەکدا کەلەناو تەبایی و دۆستایەتیدا چەسپیوە)).

واتا بەندە لەسەر (( چنینی رازلوەترین چنراو کە تیایدا هەموو میللەت لە کۆیلەکان و سەربەستەکانیش لە چرچەکانیدا هەبن)).

لەسە رنەمەوە. وا پێدەچێ ((سیاسەتمەدار)) بریتیە لە بیرکردنەوەی سەردەمە کۆنە زۆر میتۆدیەکان سەبارەت بە بابەتی شوانیی، کە جێی بایەخدانێکی زۆر بووە لە خۆرئاوای مەسیحیەتدا. گەر لەمەش بدوێین ئەوە دەسەڵمێ، جێگایەک، کە ڕەنگە لە بنەڕەتدا خۆرهەڵاتی بێت، لە سەردەمی ئەفلاتوندا ئەوەندە گرنگ بووە کە جێگای لێدوان بێت.

بەڵام لە یادمان نەچێ کە جێگەی نارەزایی بووە، بەڵام بە شێوەیەکی هەمەکی نا. لەبەر ئەوەی ئەفلاتون بە تەواوی دانی نابوو بە پزیشک و جوتیار و مامۆستای وەرزش و پەروەردەدا وەکو شوان. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەوەی ڕەت کردەوە کە چالاکی سیاسی بگرنە دەست.

بە ڕاشکاوی دەیگووت: سیاسەتمەدار ئەوهەموو کاتەی لەکوێ بوو بە تەنها سەردانی هەمووان بکات و خۆراکیان پێ بدات و ئاهەنگی مۆسیقایان پێشکەش بکات و لەکاتی نەخۆشکەوتنیدا چاودێریان بکات؟

تەنها خوای سەردەمی زێڕین دەتوانێت ئاوەها مامەڵە بکات. یان وەکو پزیشک و پەروەردگار لەبەردەمی ژمارەیکی کەمی تاکەکاندا بەرپرسیاربێ. بەڵام ئەوکەسانەی دەسەڵاتی سیاسیان هەیە و، دەکەونە نێوان هەردوو-خواکان و شوانەکانەوە-. ئەوانە شوان نین. ئەرکیان بەند نیە لەسەر پاراستنی کۆمەڵە کەسانێک، بەڵکو بەندە لەسەر یەکێتی شار و مسۆگەر بوونی. بەکورتی مەسەلەی سیاسەت بریتیە لە مەسەلەی پەیوەندی نێوان یەک و زۆرینە لەچوارچێوەی شار و هاوڵاتیەکانیدا. بەڵام مەسەلەی شوانیی پابەندە بە تاکە کەسانەوە.

وا دەردەکەوێت هەموو ئەمانە زۆر دوورن. کە پێ لەسەر ئەم دەقە کۆنانە دادەگرم. لەبەر ئەوەیە ئەمانە ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە مەسەلەکە- یاخود دروستتر بڵێین ئەم کۆمەڵە مەسەلەیە- زۆر کۆن بوون. وەسەرڕاپای مێژووی خۆرئاوایان داپۆشیووە.

ئیستاکەش بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ کۆمەڵگای هاوچەرخ. کە تایبەتە بە پەیوەندیەکانی نێوان دەسەڵاتی سیاسی بەکار هاتوو لەناوەندی دەوڵەتدا وەکو چوارچێوەیەکی یاسایی بۆ یەکێتی و دەسەڵاتێک کە دەکرێ ناوی بنێین (شوانیی)، کە هەڵدەستێ بە پاراستنی بەردەوامی ژیانی گشت و هەموو تاکێک. وەیارمەتی دانیان و سازکردنی چارەنووسیان.

مەسەلەی بە ناوبانگی ((دەوڵەت-پارێزەر)) تەنها پێداویستیەکانی فەرمانڕەوایی جیهانی هاوچەرخ و تەقەنیەتازەکانی ڕوون ناکاتەوە. بەڵکو دەبێ بەوشێوەیەی کە هەیە دانی پێدابنێ: یەکێک لەو نوخانەی کە زوو زوو دەردەکەوێتەوە بۆ گونجاندنەوەی ووردی نێوان ئەو دەسەڵاتە سیاسیەی بەسەر کەسە شارستانیەکاندا پراکتیک دەکرێ و ئەو دەسەڵاتە شوانیەی بەسەر تاکە زیندووەکاندا پراکتیک دەکرێ.

بێگومان هیچ نیازێکم نیە بۆ وێنەکێشانی گەشەکردنی دەسەڵاتی شوانیی بەدرێژایی مەسیحیەت.

وەدەکرێ بە ئاسانی تەسەووری ئەو کێشە بەرفراوانانە بکرێت کە ئەوە دەیوروژێنێت: لە مەسەلە مەزهەبیەکانەوە وەک نازناوی ((شوانی چاک)) کە دراوە بە مەسیح، بۆ کێشە دامەزراوەییەکان، وەک ڕێکخستنی ڕەعیەت، یاخود دابەشکردنی بەرپرسیارەتیە شوانگەراییەکان لە نێوان قەشەکان و مەترانەکاندا.

تاکە ئامانجم بریتیە لە ڕوونکردنەوەی دوو یان سێ ڕوو کە لەبەردەم گەشەکردنی شوانیتیدا بە گرنگی دادەنێم، مانای لە تەکنەلۆژیای دەسەڵاتدا.

با لە سەرەتادا بینای تیۆەری ئەم بابەتانە لەئەدەبی مەسیحی سەدەکانی یەکەمدا بپشکنین: کرینرۆستۆم، سانت سیبریان وەسانت ئەمبراوز وەسانت جیرۆم، وەلە ژیانی ڕەبەنیدا، کاسیین یاخود بۆنوا.

بابەتە عیبریەکان زۆر گۆڕاوون بەلانی کەمەوە لە چوار ئاستەوە: (١) یەکەم، سەبارەت بە لێپرسراویتی. وەک بینیمان شوان بەرپرسیارە لە (ئەستۆ گرتنی) چارەنووسی سەرجەمی مێگەلەکەی وەسەرجەمی تاکە تاکە مەڕەکانیشی. بەلام لە چەمکی مەسیحیدا شوان نەک دەبێ سەرپەرشتی هەموو یەکێکی مەڕەکانی بکات، بەڵکو بەهەموو ڕەفتارەکانیانەوە، بەهەموو ئەو چاکەو خراپانەی کە دەشێ بیانکات، وەبەهەر شتێکیش کە لێی ڕوو بدات.

سەرباری ئەمەش مەسیحیەت لە نێوان هەر مەڕێک و شوانەکەیدا تەسەووری ئالوگۆڕ و وەرگرتنێکی ئالۆزی چاکەو خراپەکان دەکات. بۆیە گوناهێک بزنێک بیکات پەیوەندی بە شوانەکەشەوە هەیە. کە دەبێت لە ڕۆژی دواییدا سزابدرێت. وەبەپێچەوانەشەوە شوان ڕزگاری بوونی خۆشی لەوە دەبینێتەوە کاتێ یارمەتی ڕەعیتەکەی دەدات بۆ ڕزگار بوون. بەلام بە ڕزگارکردنی ڕەعیەتەکەی خۆی تووشی مەترسیەکی کوشندە دەکات.

گەر ویستیشی خۆی ڕزگار بکات، ئەبێت سەرسەختی بەخۆیەوە بکات لە پێناوی ئەوانی تردا.

وەئەگەر ماندووش بوو، ئەوا ڕەعیەتەکەی دووچاری مەترسیەکی گەورە دەبێتەوە. بەلام با ئەم بەراوردکاریانە بخەینە لاوە. ئامانجم تەنیا بریتی بوو لە پێدا گرتن لەسەر

هێز و چڕوپڕی ئەو پەیوەندیە ڕەوشتیانەی شوان و هەر ئەندامێک لە ڕەعیەتەکەی کۆدەکاتەوە. بە شێوەیەکی تایبەتیش، دەمەوێ ئەوە بهێنمەوە یاد کە ئەم پەیوەندیانە تەنها تایبەت نەبوون بە ژیانی تاکەکانەوە بەڵکو هەروەها بە کارەکانیشیانەوە لەوپەڕی وردکارییاندا.

(٢) دووەم گۆڕانی گرنگ پەیوەندی بە مەسەلەی چۆکدادان وەیاخود گوێڕایەڵیەوەیە، بەو پێیەی کە خودا لە چەمکی عیبریدا شوانە، ئەوا ئەو ڕەعیەتەی شوێنی دەکەوێ، چۆک بۆ خواست و یاساکانی ئەودەدات.

بەڵام مەسیحیەت پەیوەندی نێوان شوان و ڕەعیەتەکەی وەک پەیوەندیەکی پاشکۆیەتی تاکە کەسی تەواو دەبینێت. کە بێگومان ئەمەش یەکێکە لەو خاڵانەی کە لە ڕەگەوە شوانێتی مەسیحی لەبیری یۆنانی جیاواز دەکات.

ئەگەر لەسەر یۆنانیەک بوایە گوێڕایەڵ بێت، دەیکرد چونکە یاسا و ئیرادەی شاربوو، ئەگەر وابوو شوێن ئارەزووی کەسێکی دیاریکراو ،کەوێ (پزیشک، ووتاربێژ، پەروەردیار). لەبەر ئەوە بوو کە ئەو کەسە بە عەقڵ ڕەزامەندی کردبوو وابکات.

دەبوو ئەوەش بە ئامانجێکی دیاریکراوی وردەوە بێت (( چاک بونەوە، بەدەست هێنانی بڕێکی دیاریکراو، هەستان بە چاکترین هەڵبژاردن )).

لە مەسیحیەتدا، پەیوەندی لەگەڵ شواندا پەیوەندیەکی تاکانەییە و پەیوەندی گوێڕایەڵی تاکە کەسیە. خواستی ئەو کە لەبەر چاوە لەبەر ئەوەنیە کە هاوشانی یاسایە، بەڵکو هەر بەتەنها لەبەر ئەوەی خواستی ئەوە. لە (( دامەزراوە ڕەهبانیەکانی )) کاسیین دا. چەند لایەنێکی بەهێزکردن دەبینین کە تیایدا ڕەبەن ڕزگار بوونی خۆی لە جێبەجێ کردینی ئەو فرمانانەی سەرۆکەکەیدا دەبینێتەوە کە زۆر نەفی کەری عەقڵە.

گوێڕایەڵی چاکەیە، واتە بریتی نیە لە وەسیلەیەکی کاتی بۆ گەیشتنە ئامانجێک، وەک لای یۆنانیەکان هەیە. بەڵکو لەڕاستیدا خۆی لەخۆیدا ئامانجێکە.

ئەمە حاڵەتێکی هەمیشەییە. کە دەبێت ڕەعیەت بەبەردەوامی چۆک بۆ شوانەکانی دابدات.

وەک قدیس بۆنۆ دەڵێت. [ڕەبەنەکان بەپێی ئازادی ئیرادەی خۆیان ناژین. ئاواتیشیان ئەوەیە کە چۆکدادەری دەسەلاتی یەکێک لە سەرۆکەکانی خانەی ڕەبەنەکان بن]. مەسیحیەتی گریکی ئەم حاڵەتی گوێڕایەڵیەی ناو دەنا بە تەوەزەلی (تەمەڵی) (Apathëia)، وەپەرەسەندنی ئەم ووشەیەش مەغزای هەیە.

لەفەلسەفەی یۆنانیدا دەستەواژەی (ApathËia) هێمایە لەسەر ئەو کۆنترۆڵەی تاک بەهۆی ڕاهێنانی عەقلی یەود بەسەر ئارەزووەکانیدا ڕەفتاری پێ دەکات. لە بیری

مەسیحیشدا زۆری ئارەزوو ( Pathos ) واتا هێزی ئیرادەی پراکتیک کراو بەسە رخود دا، لە پێناوی خوددا.

بەڵام تەمەڵی لە لاساریەکی ئاوەها ڕزگارمان دەکات.

( ۲ ) شوانێتی مەسیحی جۆرێک لە زانینی تایبەت لە نێوان شوان و هەر تاکێکی رەعیەتەکەی دەسەپێنێ ، وەئەم زانینەش تایبەتیە، تاککردنە. ئەوەندە بەس نیە شوان بزانێت رەعیەتەکەی لە چ حالەتێکدایە. بەڵکو هەروەها دەبێ باری هەر تاکێک لە تاکەکانی بزانێت.

ئەم کێشەیەش زۆر پێش شوانێتی مەسیحی هەبووە، بەڵام بەرفراوانتر بووە لەناو سێ ئاراستەی جیاوازدا. دەبێ ماتەریالیەکانی هەر ئەندامێکی رەعیەتەکە پێشانی شوانەکە بدرێت و. وەلەکاتی پێویستیشدا بۆی دەستەبەر بکرێت. دەبێ بزانێت چی ڕوودەدات و هەر ئەندا.ێک چی دەکات -گوناهەگشتیەکانی دواجار. دەبێ بزانێ لە دەروونی ١٠٩ر ئەندامێکدا چی ڕوودەدات. گوناهە نهێنیەکانی بزانێت وەبەرێگەی پیرۆزی ( القداسە ) پێشکەشی بکات.

مەسیحیەت بۆ ئەوەی ئەم زانینە تاکگەراییە بۆ خۆی دابین بکات. بووە خاوەنی دوو وەسیلەی بناغەیی بەکارهاتوو لە جیهانی یۆنانیدا: پشکنینی ویژدان و ئاراستەکردنی ویژدان. هەردوکیانی گرتۆتە خۆ بەلام گۆڕانکاری گەورەی تێدا کردوون.

وەک دەزانین، پشکنینی ویژدان بەربلاوبووە لە نێوان فیساگۆرسیەکان و ڕواقیەکان و ئەبیقۆریەکان و ئەوانەی کە تیایدا وەسیلەی لێپرسینەوەی ڕۆژانەیان دەبینی بۆ چاکەیان خراپەی بەدیهێنراو دەربارەی ئەرکەکان. ئاوەها، دەشیا بە ڕێگەی بەرکەماڵ بوون پێشکەوتن لەبەر چاو بگیرێت، واتا دان بەخۆداگرتن و کۆنترۆڵی پیادەکراو بەسەر حەزە تایبەتمەندەکاندا.

وەئاراستەکردنی ویژدانیش لە هەندێ ناوەندی ڕۆشنبیریدا باو بووە، بەلام ئەوکات شێوەی ئامۆژگاری پێدانی وەردەگرت- هەندێ جاریش شایستەیی - لەبارو دۆخی زۆر سەختدا: لە گێچەلێکدا یان کاتێک مرۆڤ بە بەدبەختیەوە دەناڵێنێ.

شوانێتی مەسیحی بەشێوەیەکی توند پابەندی ئەم دوو پراکتیکە بوو، ویژدان ئاراستکردن پەیوەندیەکی هەمیشەیی پێک هێنابوو: ئەندامێکی ئەو رەعیەتە بەتەنها بۆ ئەوە بەرێ نەدەکرا کە بەسەرکەتوییەوە یەکێک لە تولە ڕێیە ترسناکەکان ببرێت.

بەڵکو لە هەموو ساتێکدا بەرێ دەکرا، ئەو لە حاڵەتی ئەوە دابوو کە ئاراستەکرلو بێت، وەهەر هەوڵدانێکیش بۆ دەرباز بوون لەمە، هەڵبەت دووچاری لەناوچونی دەکردەوە. وەک ئەو پەندە نەمرەی کە هەمیشە لەسەر وێردی زمان بوو ئەمە بوو: (( ئەوەی ئامۆژگاری لە ئەستۆ نەگرێت وەکو گەلای مردوو دەپوکێتەوە )).

بەلام ویژدان پشکنین، ئامانجی بریتی نەبوو لە پتەوکردنی هەست بە خۆ کردن، بەڵکو توانینی تاکەکەس بوو کە بەشێوەیەکی هەمەکی بەسەر ئاڕاستە دەردا بکرێتەوە و قولایی دەرونی بۆ ئاشکرا بکات.
لەسەدەی یەکەمدا ژمارەیەکی زۆر لە دەقە رەبانیەکان هەیە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ویژدان ئاڕاستەکردن و پشکنینی ئەو دەقانەیش ئەوە نیشان دەدەن کە تا چ رادەیەک ئەم تەکنیکانە بناغەیی بوون بۆ مەسیحیەت، هەروەها ئەو رادەی ئاڵۆزیەش نیشان دەدەن کە لە بنەڕەتدا هەیبووە.
ئەوەی ئەمەوێت پێی لەسەر دابگرم ئەوەیە کە گوزارشت لەسەرهەڵدانی دیاردەیەکی زۆر سەیر دەکات لەناو شارستانیەتی یۆنانی - رۆمانی واتە دەربارەی پەیوەندی نێوان گوێڕایەڵی تەواوەتی خود ناسین و دان پێدانان بە کەسی دیدا.
( ٤ ) گۆڕانێکی دی هەیە- کە رەنگە گرنگترینیان بێت، بۆ هەموو ئەم تەکنیکانەی مەسیحیەت. تەقەنیەی ویژدان پشکنین و ئاڕاستەکردنی و دان پێدانان و گوێڕایەڵی، ئەمانە هەموو ئامانجێکی بەر چاویان هەبووە: هاندانی تاکە کەسەکان بۆ کارکردن لە پێناوی (( مراندنی جەستەیان )) لەم جیهانەدا. بێگومان مراندنی جەستە بریتیە نیە لە مەرگ، بەڵکو زوهدە لەم دونیایەدا و وازهێنانە لەخود. ئەمەش جۆرێکە لە مردنی رۆژانە. مردنێکە لە جیهانەکەی تردا ژیان دەبەخشێتەوە. ئەمەش یەکەم جار نیە کە ببینین بابەتی شوانێتی هاودڵی مەرگ بێت، بەلام واتاکەی جیاوازە لەوەی لەبیر کردنەوەی یۆنانیدا سەبارەت بە دەسەلاتی سیاسی هەیە. مەبەستەکەش بریتی نیە لە قوربانی دان لەپێناوی شاردا. لەبەر ئەوەی مراندنی جەستەی مەسیحیەت بریتیە لە جۆرێک پەیوەندی خود بە خودەوە، ئەمەش رەگەزێکەو بەشێکە لە ناسنامەی مەسیحیەت و لێشی جودا نابێتەوە.
دەکرێت بڵێین شوانێتی مەسیحیەت یاریەکی هێناوەتە ئاراوە کە نە یۆنانیەکان و نە عیبرانیەکانیش بیریان بۆی نەچووە.
گەمەیەکی سەیرە توخمو بنەماکانی بریتین لە ژیان و مەرگ و راستی و گوێڕایەڵی و تاکەکەسەکان و ناسنامە. گەمەیەکە بەهیچ جۆرێک پەیوەندی نیە بە گەمەی شارەوە. کە لە رێی قوربانیدانی هاولاتیانیکانەوە خۆی رادەگرێت. وەبەسەر کەوتنی کۆمەلانی ئێمە لە جووتکردنی ئەم دوو گەمەیە- گەمەی شار و هاولاتی و گەمەی شوان و رەعیەت- لەوەدا کە ناوی دێنین کە دەوڵەتە نوێکان، بەراستی ئەهریمەنانە دەرچوو.
وەک تێبینی دەکەن هەوڵم داوە پێشنیاری نزیک بونەوەیەک لەم مەسەلەیە بکەم، نەک مەسەلەیەکی بەرچاو شیکار بکەم. ئەم نزیکبوونەوەیەش لەو جۆرانەیە کە هەر لە یەکەم کتێبمەوە سەبارەت بە شێتی و نەخۆشی عەقڵی چارەسەریان دەکەم. وەهەر وەک گوتم

ئەمە تایبەتمەند بوو بەپەیوەندی نێوان ئەزمونەکانی وەک ((شێتی و، نەخۆشی و، یاسا پێشێل کردن و، ژیانی سێکسی و، ناسنامە))وە زانیاریەکانی وەک ((شیکردنەوەی دەرونی و زانستی تاوانکاری و زانستی سێکس و زانستی دەرون)) وە لەنێوان دەسەڵاتدا ((وەک ئەو دەسەڵاتەی کە لە دامەزراوەکانی شیکاری دەرونیدا ڕەفتاری پێ دەکرێ. وەک چۆن لە هەموو دامەزراوەکانی تردا چاودێری کردنی تاکەکەسی چارەسەردەکات)).
شارستانێتیەکەمان سیستەمی زانینی تێرتر پەرە پێداوە و دەسەڵاتێکی ئاڵۆزتریشی هەڵچنیوە: کەواتە ئەم جۆرە زانینە و ئەم تەرزە دەسەڵاتە چی پێ کردین؟
ئەم ئەزمونە بناغەییانە. ئەزموونی شێتی و، ئازار و، مەرگ و،تاوان و، ئارەزوی تاکەکەسی بەچ شێوەیەک بە زانین و دەسەڵاتەوە دەبەسرێنەوە؟
من دڵنیام کە هەرگیز وەڵامێکم نەبینیوەتەوە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دەست لە پرسیارکردن هەڵگرین؟

# چی لە کانتەوە فێر بووین..؟

*نووسینی: لویس وایت بیک*

*وەرگێڕانی: لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی/ دیمەن رەزا*

ئاوات ئەحمەد/ کردویەتی بە کوردی و لەگەڵ تێکستە ئینگلیزیەکەدا بەراوردی کردووە.

بەر لە دوو سەدە، بڵاوکردنەوەی (رەخنەی عەقڵیپەتی) کانت، لەلای خەڵکانێکی زۆر بایەخی هەبوو، تەنیا لەلای فەیلەسوفەکان گرنگ نەبوو. هەرچەندە (رەخنەی عەقڵیپەتی) بۆ فەیلەسەفە پسپۆرەکان نووسرا، بەڵام گومانی تێدانیيە کە بوو بە بەردی بناغە بۆ نوسینەکانی تری کانتکە نزیکەی نیوەیان ئاراستەی جەماوەری گشتی خوێندەواران کراوە.

فەیلەسوفە مەزنەکان، لە وێنەی کانت، تەنیا لەگەڵ مامۆستاکاندا نادوێن، بەڵکو روو دەکەنە هەموو ئەوانەی کە لەگەڵ قسەی سوکرات دان: [ژیانێک تاقی نەکرابێتەوە شایانی ژیان نىیە]، لەمەوە کانت بە راشکاوی لە نوسینەکانی خۆیدا پێڕەوەکان و مرۆڤ لە یەکتری جیا دەکاتەوە. بایەخدان بە پێڕەوەکان (مذاهب) کاری فەیلەسوفە پسپۆرەکانە، بە بڕوای کانت بایەخدان بە پێڕەو، ملکەچی بایەخدانە بە سروشتی مرۆڤ. (کانت)ی لاو لە یاداشتەکانی خۆیدا نوسیویەتی:

(من ئارەزوی پرسیارکردن دەکەم وتینووی زانیم وئەو دڵە راوکێیەشم تێدایە کە لەگەڵ مەیلی پێشکەوتنی زانیندا هەیە وخاوەنی ئەو قەناعەتەشم کە هاوشانی هەموو پێشکەتنێکی زانینە. کاتی وا هەبووە کە بڕوام وابووە ئەوە پایەیەکی شەرەفمەندانەیە بۆ مرۆڤایەتی و رقم لەو کەسانەوەبووە کە هیچیان نەدەزانی. (بەڵام) فێری ئەوە بووم کە رێز لە مرۆڤ بگرم، خۆم دەبینی لە کرێکارێکی ئاسایی زیاتر سووم نیە ئەگەر باوەڕم بەم هەڵوێستەم نەهێنم (وەکو پرسیش/ تسأول کە بایەخ دەدات بە هەمووان لە بینا کردنی مافەکانی چەشنی مرۆڤدا. سۆزی کانت بەرەو هەردوو شۆڕشی فەرەنساوئەمریکا بە ئاشکرا جوڵاوە لەو سەردەمەشدا دەربڕینی سۆزی لەو بابەتە خەتەرێکی گەورە بوو لە ئەڵمانیا دا. کە (مافەکانی مرۆڤی نوسی) مەبەستی مافە سیاسیو یاساییەکانی ئەو چەشنە بوو کە شۆڕش بەلایەوە ئاسایش دەگەیەنێت بەڵام چەمکەکانی کانت دەربارەی ماف زۆر زیاترن لە مافە سیاسیەکان. ئەو وای بۆ دەچوو کە مافە سیاسیەکان بناغەی مافەکانی ترن، ئەو مافانە مەرجی مەشق کردنن لەسەر هەموو مافەکانی تر- مافی مرۆڤ بە رۆشنکردنەوەی خودی خۆیان، بۆ بەکارهێنانی بەهرەکانیان بە سەربەستی بۆ

دۆزینەوەی حەقیقەت، لەگەڵ پەرەپێدانی خەسڵەتە ڕەوشتییەکانی خۆیان. ئەم شتانە هەموویان ئەوە پێک دەهێنن کە پێی دەوترێت (سیستەمی مرۆڤ). بۆ دیاری کردنی سیستەمی مرۆڤ، فەلسەفە پێویستە. کانت بە درێژایی کات تێبینی خۆی تۆمار کردووە، نوسیویەتی (ئەگەر زانستێکی وا هەبێت کە بۆ مرۆڤ پێویست بێت، ئەوا ئەو زانستەیە کە فێری دەکات چۆن لەناو ئەفراندندا جێگەی خۆی بکاتەوە، لێوەی فێر بێت کە دەبێ بە چی بێت تابێت بە مرۆڤ، بەلام مرۆڤ چیە؟ ئەمەیە پرسیارە سەرەکیەکەی فەلسەفە. ئەم پرسیارە سێ پرسیاری تری لێ دەبێتەوە: دەتوانم چی بزانم؟ دەبێ چی بکەم؟ ئومێد بە چی بخوازم؟ ڕەخنەیەکی تەرخان کراو بۆ تێگەیشتن لە هەر یەکێک لەم پرسیارانە هەیە، بەلام ئەوانە تەنیا ڕێخۆشکەرن بۆ وەلامدانەوەی پرسیارە سەرکیەکە. ئەم سێ پرسیارە لەناو ڕەخنەکانی خۆیاندا وەلامی دیاریکراویان هەیە، بەلام پرسیارە سەرەکیەکە وەلامێکی سادەو ڕاشکاوی نیە. وەلامەکانی کانت بۆ ئەو سێ پرسیارە نابن بە وەلامێکی بێ هەلەی پرسیارە سەرەکیەکە، بۆیە لە هەموو ڕەخنەیەکدا بیرۆکەیەکی تایبەتی وا هەیە کە هەمیشە دەگاتەوە سەر ئەوەی: مرۆڤ چیە؟

فەلسەفەی زانست:

کانت کەوتە ژێر کاریگەری ئەوەی کەپێی دەلێن شۆڕشی کۆپەرنیکۆس (کانت خۆی ناوی وای نەهێناوە). کۆپەرنیکۆسی وا بینی کە ئەگەر جولانەوەی زەوی ڕەچاو بکرێت ئەوا لە دیاردەی هەسارەکان باشتر تێ دەگەین. جوولەی ڕاستەقینەی ئەو چاودێرەی چاودێری ئاسمان دەکات کە سیستەمێکی چاودێری لێوە هەلدەهێنجرێت، بەدی نایەت ئەگەر ئەلەکزانەکان نکوڵی جوولانەوەی زەوی بکەن یان: زەوی ڕاوەستاو بێت. پێویستە حیسابی جوولە لە هەموو شوێنەکاندا بکرێت بۆ ئەوەی جوولانی ڕاستقینەی تەنە چاودێری کراوەکان بدۆزینەوە کانت لە هاوشێوەیی نێوان ئەو جوولانەوانەو فاکتەرەکانی تری دیوی چاودێری بەکار هێنا بۆ دیاری کردنی بەش لە گشت و، خۆیی لە بابەتی (کە ئەمەش بەناویەکاچوونێکی نابابەتیانەی ئەوەیە کە چاودێری کراوە. ئەگەر بابەتەکەمان زانی دەتوانێت لە هەموو دیاردەیەکی جیهان تێبگەین (حیساب بۆ جوولە کرابێت یان نا). ئەگەر بەشداریەکەی لە پێش‌چاوبگرین (گۆڕانێکی ڕووکەشی لە جوولەی خۆیدا یان هەندێ فاکتەری تر بێت). بەشداریکردنی چاودێر نەک تەنیا ڕێژەییەو بایخی نیە و سیفەتی سانەوی لێلی هەیە، بەلکو زۆر بابەتیە لە هەموو پێکهاتەو خەسلەتە دیار و سەرەکیەکان. لە ئەزمون و پالنەر و یاساکانیدا، ئێستاش وەک جاران لە ناو ئەزموندا لێی کۆلراودتەوە لە توێی عەقلانیەت و هونەرە پراکتیکە زانستیەکانی چاودێری و شرۆڤەکردنی عەقلی کانت دەلێت (تێگەیشتن یاسای خۆی دروست ددکات و سروشت لەو کارە ناگات، بەلام تا ڕادەیەک دەتوانێ وەسفیان بکات) ئێمە بە ئەزمونی یەک لە

دوای یەک ڕۆشنبیر دەبین وەک لەو گشتاندنە-تعمیم- دیاریکراوەدا دەیبینین لە بەرهەمی یاسادا. پسپۆری لە چەمکەکاندا پێشینیەیە-قبلت- هەروەکو لە: هۆ. مادە شوێندا هەیە. هەروەکو کانت دەڵێت (سروشت بریتی یە لە کەینونەی شتەکان و دوورترە لەوەی سنووریان بکات بەهۆی یاساکانی گەڕدوونەوە) بەم جۆرە ناتوانین عەقڵی مرۆڤ وەک و ڕوون کەرەوەیان دارێژەری یاساکانی سروشت دابنێین و هیچی تر. بەڵکو عەقڵی مرۆڤ بریتیە لە دروست کەری سروشت نەک مادەی سروشت. دیارە دەبێ عەقڵی مرۆڤ لەو مادانەدا کاربکات کە بە هەندێ سەرچاوەدا دەست دەکەوێن. بەڵام سروشت وەکو سیستەمێک بۆی دەڕوانرێت کە دەکەوێتە سایەی ئەو یاسایانەی زانین کە تێگەیشتنی سروشت ئاسان دەکەن. (کە ئایدیالیستەکانی ئەڵمان سنووردلریان ڕەت کردەوە. کانت شوێنی خۆی لە مەودای زانینی نێمە داگیرکرد، ئەوان وا بیریان لە عەقڵ دەکردەوە کە خوڵقێنەری سروشتە و لەمەشدا زۆر زیادەڕۆییان دەکرد نابێ لەبەر ئەم هەستەی ئەوان گلەیی لە کانت بکەین کەلە ڕاستیدا ئەو زۆر هەوڵی داوە وانەبێت). کانت لە نێوان پێڕەوی (نیکولوس) لەسەر سەبەبیەت و پێڕەوی (ڤیکتۆر)دا ڕاوەستا (ڕاستی ئەوەیە کە کراوە، نێمە تەنها ئەو شتە دەزانین کە دەتوانین بیکەین). (نیتشە)ش قسەیەکی هەیە کە دەڵێت (بەر لەوەی بیر لە شتێک بکرێتەوە؛ دەبێ جڵەوەکەی بگیرێت). تاکە فیزیایەک کەکانت زانیبێتی فیزیای (نیوتن) بووە، تەنیا ئەندازەی (ئەقلیدیسی) زانیوە، هەر لۆژیکەکەی (ئەرستۆی) ناسیوە. لەبەر ئەوەی ئەم زانستانە پووچەڵ کراونەتەوە یان بژار کراون، بۆیە هەندێ جار دەگوترێت کە ڕەخنەی عەقڵی پەتی پشتی ئەوانی گرتووەو داکۆکی لە بیرۆکە کۆنەکە کردووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کانت ئەبستەمۆلۆژیا بۆ هەر یەکە لە فیزیای (نیوتن)ی و ئەندازەی (ئیقایدیس)ی دامەزراندووە، با ئەوەش بیر بخەینەوە کە فیزیای (نیوتن)ی و ئەندازەی (ئەقلیدیس)یش هەر لەسەر بناغەی ئەبستمۆلۆژیا دامەزراون. ئەم دووانەی دوایی خۆیان شرۆڤەی خۆیان ناکەن و پاساوی خۆیان نادەن، بەڵکو دەبێ وەکو دەرەنجامێکی بەرزی زمانەکەی کانت دابنرێن. ئەوە خاڵی دیالەکتیکە لە زانستە فەلسەفییەتازەکاندا جا چ ئەو بناغانە پێویستیان بن بۆ ئەم هاوشێواندنە تازەیەتا زیاتر لەیەک بچن. یان جیاواز بن. بەپێی نمونە کلاسیکیەکەی فیزیای کانت. چ ئەگەر هاوشێوەی چارەسەرکردنەکەی ڕەخنەی عەقڵی پەتی بێت یان نا، کە پێویستە دوای هەموو شۆڕشێکی زانستی بنوسرێتەوە. لەیەک چوونی ڕەخنەی عەقڵی پەتی و فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمی نوێ پەیوەندی بە پرۆسێسە جەنگیەکان و بیردۆزە تازەکانەوە هەیە. جێگای سەرنجە هەموو ئەم بیردۆزە بەراوردکارانە لە پرسیش (تسأول) کردندا، ئەوانە هەموویان بەدەو سروشت و لەوەوە پێچەوانە دەبنەوە. شتێکی سرووشتیە کە ئەم بیرۆکەیەی کانت دەسکاری

کراوەو زۆربەی ئەو دەسکاریی کردنانەش بە یەک ئاراستەدا دەڕۆن. ئەمەش دوور لەوەی کە (ستیفان کۆرنەد) پێی دەڵێت ئەتروحەناوازەکەی کانت بە واتایەکی تر تاقەیەک ڕێگا لەو پێڕەوەدا هەیە بۆ ڕێکخستنی ئەزمونەکان. بۆیە دەتوانین هەموو داواکارییەکی مەعریفی پێک بهێنین، تەنانەت هی مەڵەش. گومان لەوە دانیە کە دەبێ ئەم دام و دەزگا ڕەق و تەقانەی کانت خاو بنەوە و ئەلتەرناتیفەکانیان سەرپشک بکرێت. دەبێ زانین پەیوەندیی بگرێت لەگەڵ سیستەمی ڕۆشنبیریی گۆڕاودا. چالاکی ئەفرێنەرانەی عەقڵ و بیرۆکەی مەرکەزیی لەناو ڕەخنەی عەقلی پەتیدا لەلایەن ئەو کەسانەوە بینا کراوە کە ئەرکی ئەوەیان خستۆتە سەر شانی خۆیان کە بایەخ بەو پێداچوونەوانە بدەن، لە خودی کانت زیاتر: مادام لەلای کانت ئەفراندن تا ڕادەیەک شتێکی ئەبستراکت و نێپەرە و لێکۆڵینەوە تازەکانی جەخت لەسەر گۆڕینی حەقیقەتە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکان و فاکتەرە شەخسیەکان دەکەن و مانایەکی ئەزموونی ئەخشرێتە چەمکی پێکهاتەی ئیدراک، ئەو نوسینانە کانتیان بردە سەر ئەوەی کە ڕەخنەی عەقلی پەتی بڵاو بکاتەوە. ئەفراندنێکی سەربەست، عەقڵ چۆن شەرعیەتێکی بابەتی پێدەدرێت؟ ئەم پرسیارە لەناو بیر و بۆچونی کانت دا وەکو ئەفراندنێکی ناوازەی عەقڵ دەمێنێتەوە و ماوەیەکی درێژ وەکو ئەلتەرناتیفێک دەبینرێت یان ڕاستتر تا ئەو کاتەی کەپێشکەوتنی زانست جێگەی گرتەوە.

سۆسیۆلۆژیای زانینی هاوچەرخ جەخت لەوە دەکات کە فاکتەرە کولتورییەکان دەوریان هەیە لە قبوڵکردنی ئەلتەر ناتیفی وەسفیی جیهاندا. لەلایەکی ترەوە کانت تاقە یەک سیستەمی ڕێزمانی دەزانێ. لەوانەیە هەر لەبەر ئەو هۆیەش بێت پێی وایە کەتەنیا یەک چەشنە عەقلی خاوەن ئیدراک هەیە وەک سیستەمی زانین و زانستیش هەیە. کانت لەم بەشەی عەقڵ دا بیری لە لای یەک چەشن لە عەقلی بە ئیدراکو یەک سیستەمی ئەبستمۆلۆژیا هەیە. ئەو بەسەر ڕەهەندە کۆمەڵایەتیە گۆڕاوەکانی بیرکردنەوەدا دەڕوانێت وکەم بایەخ بە فەلسەفەی زمان دەدات (لە ڕاستیدا کەم حەزی لەزمان بوو) پێی وابوو (کەزمان ئامرازێکی ئاشکرایە) و هۆی ئەمەش ئەوەیە کە سیستەمی چینایەتی دەخستە ڕوو وەکو چەند یاسایەکی سنور بەزێن. لەمەوە دەر دەکەوێت کە کانت سەربەو ڕەخنەگرانەیە کە (چۆمسکی) پێیان دەڵێت (زمانەوانە دیکارتیەکان).

بەڵام لەوانەیە زماەوانە ئەنتی دیکارتیەکانیش سەرچاوەی کانتیان هەبێت. وەکو لە نوسینی قوتابیەکانیدا دەردەکەوێت لەوێنەی (هیردەر و هومبلدێت) و لەم سەدەیەشدا لەناو کانتیە تازەکانی وەکو (جۆرج سیمێل و ئەرنست کارسیرەر)، وێنەی ئەلتەرناتیفی گەردوون و کۆمەڵ پشت بەسیستەمی ڕەمزیی بەکارهێنراو دەبەستێت کە سیمایەکی

پێشینەی ئەو ئەزمونانە دیاریی دەکات کە لەناو تۆڕی گۆڕینەوەی پەیوەندییەکاندا قبووڵ دەکرێت. ئەگەر تاقەیەک ڕێسای گەردوونی هەبێت یان نەبێت ئەوا زمانەوانی لە ناو فەلسەفەدا کە هاوشێوەی شۆڕشێکی کۆپەرنیکی بووە. جا چ لەگەڵ یان ئەتروحە ناوازەکەدا بێت. چ سەنتەری ئەبستمۆلۆژیی (وەکو خۆر لە ئەستروئۆمیای کۆپەرنیکۆسیدا) بریتی بێت لە تاقە ڕێسایەک بۆ گەردوون یان ئەوەیە کە قوڵاییەکی کۆتای و جیاواز بێت و کورت کردنەوەی یاساکانی کارێکی نەشیاو بێت لە ئیشکالەکانی ئەزموونی ئاشکراو توکمەدا کە دەشێ ئەوەی بینومانە باسی لێوە بکەین هەموو نمونەیەکی زانستی و ڕۆشنبیریی، هەموو سیستەمێکی زانستی پێویستی بەوە هەیە تۆزێک لە ڕەخنەی عەقڵی پەتی بچێت بۆ ئەوەی لەوە تێبگات کە چۆن پرنسیب و یاساکانی زانستی کۆزمۆلۆژی و چەمکە شارستانیەکان وەردەگرێت. بۆیە تووشی سەرسوڕمان نەهاتم کە (ئارنست گەلنەر) لەم ماوەیەدا وتی کانت بە سەرۆکی یەکەمین دادەنرێت لەناو پێشینە بونیادگەرەکاندا.

سیاسەت و زانستی ڕەوشت:-

ڕاست هەروەکوبۆچوونەکانی کانت دەربارەی شۆڕشی کۆپەرنیکۆسی کەبڕوای وایە بڕیاری زانستی شکڵێکی یاسایی دەدات بە ڕووداوەکانی ناو سروشت، یاساکان بەرەو ناو سروشت دەخوێنێتەوە سنورەکانی ئەو چوارچێوەی شتە گۆڕاوەکان بەهۆی لێکۆڵینەوەی ئەزمونیەوە دیاریی دەکات. لە فەلسەفەی ڕەوشتی کانتدا شۆڕشێکی هاوشێوەبوون، ڕوویدا کە من ناوی لێ دەنێم (شۆڕشی ڕۆسۆیی)، ڕۆسۆ نوسیودیەتی (سەربەستی بریتی یە لە گوێڕایەڵیی بۆ ئەو یاسایانەی کەمرۆڤ خۆی هەڵیان دەبژێرێت). مەبەستی سەرەکی (ڕۆسۆ) لێرەدا چەمکە سیاسیەکانە، هەروەها بیرەکەشی بریتی‌یە لە بەڕێوەبردنی خود بەوەی بەشداری بەکردەوە لە دەسەڵات دا نەک تەنیا ڕازی بوونی ناوەکی، کە ئەمیان پۆزش هێناوەیە بۆ دەسەڵات. کانت بیردۆزەی سیاسی خۆی زیاتر بەرەو فەلسەفەی ڕەوشت پەرەپێدا. ئەو یاسای ڕەوشتەی فەیلەسوفەکانی پێش کانت دایان ناوە بریتی بووە لەئارەزوی خواوەند یان یاسای سروشت یان ئارەزووی مرۆڤایەتی بۆ کامەرانی. کانت (مەجازی سیاسی) لە ئۆتۆنۆمیدا بەکار هێنا. لەوانەیە بۆ یەکەم جار بووبێت کە جیاوازی نێوان ڕەوشت و زرنگی خراپێتە ڕوو. ڕەوشت بریتیە لەو پەڕی پاشکۆیەتی و لە دەرەوەی ڕێزگرتندا وەکو یاسایەک بۆ سەردتا شایانەکان. ڕێز بریتیە لە هەستێکی ناوازەکە بەهۆی یاسایەکەوە بیر هێنراوەتەوە کە هیچ مۆڵەتێکی زرنگانەی تێدانیە، بریتیە لە گوزارشت کردن لە مەودای هۆشمەندیی کە هەر یەکە لە دروست کردن و داهێنەریی کردنی زانست پێشان ددات بۆ گەیشتن بە بڕیاری کردەیی. من دەتوانم ملکەچی ئەو یاسایانە بم کەپەیوەندییان بە

خەلات و سزاوە هەیە، ئەگەر زرنگ بم هەمیشە هەر وا دەکەم. بەلام من تەنیا کاتێ دەتوانم ڕێزیان لێ بگرم کە بنچینەکەیان لە لۆژیکی تایبەتی منە وە هاتبێت لەگەڵ توانای من بۆ داڕشتنی یاساکان، ئەمەیە نیگەرانی هۆشمەندانەی من.

لە ڕەخنەی یەکەمدا هاوشێوەییەک بەدی دەکرێت لەنێوانی پرنسیپەکانی ڕەوشت وپرنسیپە ڕەهاکان. تاقە یاسایەک کە من دەتوانم وەکو شتێکی پێویست دانی پێدابنێم بریتیە لەو چەمکەی کە من لێی تێدەگەم بۆ سروشت (دان پێدانان وەک پێویستیەک بریتیە لە (ڕەخنەی یەکەمدا) بۆ ئەپستمۆلۆژیاو هاوشێودیی ڕەوشت - (لە ڕەخنەی دووەمدا) ئۆتۆنۆمی بریتیە لە مەرجی سەرەکی بۆ دەرک پێکردن و چالاکی کاریگەر. چونکە ئەم ووشەیە تاکو کۆتایی ساڵی ١٧٨١ نەهاتە ناو زاراوەکانی کانتەوە. لە ڕەخنەی یەکەمدا زۆربەی خوێنەران مەسەلەکەیان لە کیس چوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەیەکچوونەکە زۆر ئاشکرا بوو. عەقڵی عەمەلی لەسەر هەمان پەیوەندی ڕاوەستاوە لە نێوانی ڕەوشت و جیهاندا (جیهانی کۆتایی). تێگەیشتنی پەتی لە دونیای سروشت. هەردووکیان سەرچاوەی یاسا پێشینەکانن (القوانین القبلية) یەکێکیان هاوتای ملکەچی ئێمەیە بۆ شرۆڤەکردنی سروشت کەئێمە بە هاوتای ئەو ملکەچیەی دادەنێین کە سروشت خۆی بۆ یاسا هەیەتی و ئەوەی تریشیان بۆ ملکەچی ئێمە بۆ گەڕان بەدوای بەختیاری ومافی مرۆڤ و چاکەدا، بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە ئەوەی ئایا سروشت سازە بۆ هەڵەکانمان یان تەگەرەی تێ دەخات. چ ئەگەر چاکەبێتە هۆی کامەرانی کە هەندێ جار لەسەر مرۆڤایەتی ڕاناوەستێت، سنوری هێزەکانی، بەمەیە و دەبێ بایەخ بەچی بدات! کە بایەخ بە کامەرانی دەدات. ملکەچی بۆ یاسایەک کە لە یەکێتی لۆژیکی سروشتەوە هەڵقوڵابێت، ئەمە مەرجێکی گرنگە، بەلام دەبێ ئەوەش بلێین کە شتێکی پێویست و هاوتاشی نی‌یە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانی مرۆڤدا.

گەلێ کەس نارەزایی دەردەبڕن کە گوایا کانت ملکەچی بە چاکەیەکی مەزن داناوە لە ڕاستیدا بە تاقەچاکەی دادەنێت - کە بەبنچینەو زنجیرەی یاسا دادەنرێت وەکو ڕەوشتێک لەدەرەوەی بابەت. بۆیە بڕوایان وابوو کە کانت ناتوانێ جیاوازی لە نێوانی یاسای شەرعی و ناشەرعیدا بکات و ناتوانێت هەندێ دەمارگیری لە بەرامبەر چەند ئامانجێکی نا ڕەوشتی تاوانبار بکات. هەروەها ناتوانێ لە دیوی ڕەوشتەوە ڕەخنە لە هیچ حکومەتێکی ڕاستەقینە یان هەر ستەمکارێکی ڕاستەقینە بگرێت. بە پێچەوانەشەوە هاوڕێیانی هەردوو شۆڕشی ئەمەریکا و فەرەنسا وەکو داکۆکی کەر لە سیاسەتێکی ستەمکارانە دەبینران.

پێویستە گەواهی ئەوە بدەن کە ناکۆکی‌یەک هەیە لە فەلسەفەی سیاسی کانت دا، بەتایبەتی لەوەدا کە لایەنی (لۆسەر) دەگرێت کە دەڵێت (( شۆڕشیش تاوانبارە )).

ئەمەش بەرەو ئەوەی برد کە لە مەسەلەکانی شۆڕش و ویژداندا زۆر سەلار نەبێت. سەرباری ئەوەش کانت بە ڕاشکاوی یاسای ڕەوشت کە لە عەقڵەوە گەردان دەکرێت جیا دەکاتەوە لە یاسای پۆزەتیڤیزمی کە لە هێزە پەیوەندی دارەکانی بڕیاری ئەزموونیەوە هەڵدەستێت. تەنانەت کاتێک کە فێڵی شەرعی لە یاسا ڕووکەشیەکانی شۆڕشی فەرەنسا کرد هەرگیز لەودا پەکی نەکەوت کە ڕەوشت بخاتە پێش سیاسەتەوە. کانت دەڵێت ((پێویستە هەمیشە سیاسەت سەر بۆ ڕەوشت نەوی بکات)) ئەو یاسایەی ئێمە ڕێزی لێ دەگرین تەنیا بڕیارێکی ستەمکارانەی پاداشت و سزانیە، بەڵکو چەشنە یاسایەکی وایە کە ئێمە وەک بێلایەن و بێهەوا سەیری دەکەین یان بەلایەنی کەمەوە توانیومانە بۆ خۆمانی دابنێین. ڕێسایەکە لە ژێر پەردەی تاوانی ئەزمونیدا لەگەڵ پاکیزەیی ڕەوشتی کۆترێکدا لە جێگەی حیکمەتی سیاسی مارێک ئیشی کردووە. یاسای لەم بابەتە کاری پێ دەکرێت و دەچێتە چوارچێوەی ماقوولەوە. لێرەدا ماقووڵ مانای ئەوە نیە کە زۆر دوورترە لە گونجانی دەروون. بەڵکو مانای بەستراوەیە بە مانای گەردوونیەکانەوە سوودی پێرەو گەردوونیەکانی چەشنی مرۆڤ. کەواتە یاسای ڕەوشت یاسای پەتی پۆزەتیڤیزم نیە بەڵکو پێرەوێکی عەقڵانیە کە شەریعەت و یاسا دایان ناوە. یاسای ڕەوشت بریتیە لە شکڵە عەقڵانی و دونیایەکی یاسای خواوەندیان سروشت بریتیە لەو وەزیفانە. چونکە بیرە مەزنەکان بەبێ ویستی خۆیان خزمەتی هێزە سیاسیە ستەمکارەکان دەکەن.

من بەراوردی نێوان بیردۆزەکەی کانت و پێرەوە تەقلیدیەکانم کردووە لە یساکانی سروشت و یاساکانی خواوەندا. بەڵام باشتر وایە بپرسین؟ لەفەلسەفەی ڕەوشتی کانتدا ژیان چیە؟ بەڕاستی شۆڕشێک لە ژیانی ڕەوشتدا بەرپا کرابوو کە بەقەدەر بەرپاکردنی شۆڕشێک لەو بۆچوونە زانستی و وێنەییەکاندا بایەخی هەبوو. پێدەچێت کەسێک بڕوای وابێت کە هیومانیزمەکەی کانت لەگەڵ ڕەوشتناسە جولەکە و مەسیحیەکان، پێکهاتەی ڕەو واقی و هەمەڕەنگیی بروسیای پرۆتستانت دا بگونجێت، وەک ئەندازەی تەقلیدی و فیزیای نیوتن کەکانت لایەنگریان بووە. حاڵی حازر ئێمە ئەو باوەڕەی کانتمان لادەست ناکەوێت دەربارەی عەقڵانیەت و سەرتاپاگیری ڕەوشت. ووشەی عەقڵانیکردن گومانی شیکردنەوەی دەروونی دەوروژێنێت وهاوسەنگی ڕاگرتنی کانت بۆ کردەوەی ڕەوشت و کار بەرەو دەوری هەستکردن بە ئەرکەکان دەبیات یان بۆ دەرەوەی عەقڵی پەتی کە ئیمڕۆ بە زەحمەت پێی ڕازی دەبین. گەلێ فاکتەر سەربەستی مرۆڤ دیاری دەکەن کە لە ڕووی ڕەوشتیەوە پەیوەندیان بە کانتەوە نیە.

لای من هەندێ لەو تەدارەک (إحتیاط)انە شەرعین و گرنگیش، بگرە تا ڕادەیەک ڕووکەشن بەڵام لەم مەسەلەی دەم تێوەردانی مەسەلەی ویژدان و ڕەوشتدا کانتیان بە

هەڵەدا بڕیو خۆی نەدا لە خاڵە سەرەکیەکانی فەلسەفەی ڕەوشت. دوای هەموو شۆڕشێکی ڕەوشت دەبێ دیسان ڕەخنەی عەقڵی عەمەلی‌یەکی تازە بنوسرێت یان هەر هیچ نەبێ دەبێ جارێکی تر کتێبەکانی کانت بخوێنرێنەوە. لەوانە ڕاو بۆچوونە ڕەوشتیەکانی ئەمڕۆ لەوانەی کانتەوە دووربن، ئێمە ئەو بنەچە فەلەسفیانەی هیچ سایکۆلۆژیایەکی ئیکلینیکی یان لە شێواز و تەرزەکانیدا نا دۆزینەوە ئەوانە پێویستیان بەوەیە کە کانت بە ناسەرەکی حیسابیان دەکات و پێی دەڵێت (میتافیزیکای ڕەوشت). پێویستە بناغەی هەموو ڕەوشتەکان لە چەمکە نمونەییەکانی سروشتی توخمی مرۆڤ دا هەبن، ڕەنگە کانت وای بە خەیاڵدا هاتبێت کە سروشت زۆر عەقڵانیە، لە هەوڵیدا بۆ بەدیهێنانی زانستی ڕەوشتێک کە بۆ هەمو بوونە عەقلیەکان دەست بدات نەک تەنیا بۆ ڕەگەزی مرۆڤ. بەڵام بونیادی پشتەوەی سیستەمە ڕەوشتیەکان کە لەسەر بناغەی میسالی جیاجیا دەربارەی سروشتی مرۆڤ دامەزراون، دەبێ وەکو مافی کانت ڕەچاو بکرێت.

زۆربەی خەڵک بە ڕێژەی جیاجیا لەزانستی ڕەوشتی لە بەرامبەر زانستی ڕەوشتی مرۆڤ دا تورەن و دەڵێن ((لەوانەیە لە ڕووی تیۆرییەوە ڕاست بێت بەڵام لە ڕووی پراکتیکەوە نا)) لەبەردەمی ئەم پرۆتێستەدا وەڵامە توندەکەی کانت وەردەگرینەوە کە وەڵامی ئەو کەسە چاو نەترسانەی دا بۆ وەکە ویرابوویان ڕەخنە لە (ئەفلاتوون) بگرن لەسەر مەرگەساتی پرۆژە جێبەجێ نەکراو بەدی نەهێنراوەکەی لە بیردۆزە سیاسیەکەیدا. هیچ شتێک ئەوەندە ئازاری فەیلەسوف نادات یان بۆ ئەو پووچ و بێ مانانی‌یە لەوەی کە بانگەشەی شتێک بکات بەناوی دژە ئەزموونەوە، ئەزموونی لەو بابەتە هەرگیز مایەی خۆشحاڵی نەبووە. ئایا مێژوو دوای گریمانەکانی ئەفلاتوون کەوت؟ دەبێ مەسەلەی ڕەوشتی کانت لەگەڵ بنچینە نا پراکتیکەکانیدا نا تەبا نەبێت. ڕەنگە یەکێک لە شێمانەکان بریتی بێت لە بەکارهێنانی وریا کەرەوەی دژ بۆمەیلە واقیعیەکان کە ئامانجی دامەزراندنی خواوەندی نیە لە سەر زەوی (یان جیهانی کۆتایی بەپێی فەرهەنگەکەی کانت) واتە هەبوونی عەقڵانی وەکو کۆتایی خۆیان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت نەک تەنیا وەک مانا.

فەلسەفەی هونەر

یەکێک لە غەریب ترین دیاردەکانی ناو مێژووی فیکر ئەوەیە کەکانت بەرەو شۆڕشێکی بردین لە چەمکە هونەریەکانمانا. دیاردەیەکی غەریبە چونکە کانت لە ژیانی خۆیا حەزی لە هونەر نەبووە. لەوانەیە کانت ماوەی نەبووبێ سەیری تابلۆیەک بکات یان لە ئاهەنگێکی مۆسیقای نایابدا چێژ وەربگرێت کە بۆ مۆسیقا ژەنێکی مەزن ساز کرابێت. هەردوو شۆڕشە کۆپەر نیکۆسی و ڕۆسۆییەکەی ئەو بریتی بوون لە مێژووی ڕاستەقینەی

ئەو. ئەو دوانە زانست یان ڕەوشتیان نەشۆڕشاند بەڵکو بنەمای شۆڕشگێڕانەو نوێیان بۆ ئەو زانست یان ڕدوشتە پەیدا کرد کە لەو کاتەدا باو بوون، لەلایەکی تریشەوە شۆڕشەکەی کانت لە ئێستاتێکادا بریتی بوو لەتەرکێ دانی پێوانە ڕەخنەییەکانی ئەو سەردەمە، ڕێگا خۆشکردن بوو بۆ ئەو پەرەسەندنە هونەرییانەی کە دوا بەدوای نوسینەکانی ئەو ڕوویان دا، ئەوەی کانت نووسی کاری کردە سەر ڕۆمانسیەتی ئەڵمانیش.

لێرەدا جارێکی ترلەگەڵ هاوتای شۆڕشێکی کۆپەرنیکۆسیدا پێک دەگەینەوە. (م.هـ.ئەبرامز) لە کتێبەکەیدا دەربارەی (ویردس ورنس) دەڵێت. شۆڕشێکی کۆپەرنیکۆس لە ئەبستمۆلۆژیادا... بیرۆکەی سەرەکی ئەوەیە کە عەقڵێکی هۆشیار تا ڕادەیەک کارەکانی خۆی کەشف دەکات. لە ئینگلتەرادا کاریگەری لەسەر ڕەخنەگران و شاعیران پێش ئەوەی لە پێڕەوی فەلسەفی ئەکادیمی دا دەربکەوێت، جێهێشت، بەڵام لە ئەڵمانیادا ئەو شۆڕشەی ئێستاتیکا یەکەمین جار لە فەلسەفە ئەکادیمییەکەی کانتدا بەرچاو کەوت.

کانت دژی هەردوو پرنسیپەکەی ئێستاتیکا بوو کە جڵەوی بیری ئەوروپایان گرتبوو سەبارەت بە هونەر، ئەگەر هونەر خۆیشی نەبێت: هونەر بریتییە لە لاسایی کردنەوەی سروشت و مەبەستی هونەر ڕۆشنکردن ومشت و ماڵکرنی ڕەوشتە. کانت هەردوو پرنسیپەکەی ڕەت کردەوە چونکە هونەر دەکەن بە مشە خۆرێک لەسەر جەستەی مەعریفە یان ڕەوشت. کانت لە ڕەت کردنەوەی ئەو بیردۆزانەدا دەڵێت (وەلامەکانی ئێستاتیکا وەلامی ناوەڕۆکی حەقیقەتەکانی هونەرە) کانت پێی وابوو کە بایەخی جوانی بەستراوە بە ئیعتیرافکردن بە پێکهاتەو بەکارهێنانی ووشەوە نەک بە زانستی سیمانتیک وەپەرەسەندنی سینتاکس و نە ڕەهەندەکانی ماناش. تەنیا بەم شێوەیە هونەر سەربەست دەبێت تا بەبێ هیچ مەبەستێک شتی خاوەن ئامانج بخولقێنێت.

ناتوانین داکۆکی لەوە بکەین کە کانت لە جیاکردنەوەی ڕەوشت لە سنورەکانی جوانیدا بە تەواوی سەرکەوتووە. لەوانەیە کانت بەپێی پێویست لەبیرە ڕەخنەییەکانیدا لەکاتی خۆیدا بۆ جیاکردنەوەی ئەو دووانە سەربەخۆ نەبووبێت. لەبەشەکەی تری بیردۆزەکەیدا هەر ڕوون نیە کە شتی وای کردبێت یان توانیبێتی بیکات. لەڕووی مێژووییەوە، هەرچەندە ماندەری سەرەکی گفت و گۆکانی کانت کە بە ئاراستەی ڕزگارکردنی هونەر بووە لە پێوانەی هونەری زیادە ڕۆیی تادەگاتە چەندەیەک لە ڕاستگۆیی و واقیعیەت و بەهای ڕدوشتی.

کانت دوو پرنسیپی ڕەخنەی سەردەمی خۆی گۆڕی، لاسایی کردنەوەی سروشت و مشت و ماڵکردنی ڕدوشتی گوێگران بەرامبەر بە بیردۆزەکەی دەربارەی بلیمەتی.

بلیمەتی یاسایەکە بەرەو ناوەوەی خۆی و سروشتێکی دی دروست دەکات و فۆتۆکۆپی سروشتی یەکەم ناکات. لە توێی بلیمەتەوە بەرنامەی خۆی پێش خست.

چونکە زیابوونی خێرایی بلیمەتی رۆمانسی بەلای کانتەوە شتێکی باش نەبوو. رەنگە هەندێک وای بۆ بچن کە رۆمانسیەت و جوڵانەوە ناکلاسیکی‌یەکانی ئەم دواییە لە هونەردا، بوونی بەهۆی دروست بوونی زانستی ئیستاتیکاکەی کانت وەکو ڕەتدانەوەی رایەکانی ئەوان کە داکۆکیان لە نیوتن و زانستی ڕەوشتی مەسیحی و یاسای رۆمانی دەکرد. حەزی کانت لە (گوڵە زەنبەق)- وئادابێسک/ (هونەری زەخرەفەی عەرەبی)، لەگەڵ ئەوەی کە دەیتوانی لە تابلۆی (دۆقەی رووت و قووت کە بە پلیکانەکاندا دێتە خوارێ) بسێنێ.

شۆڕشە فیکریی‌یەکانی هونەر لە هەردوو سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم دا (تەنیا مارکسیزم نەبێت) وا دێنە پێش چاو کە داکۆکی لە بیرۆزەکەی کانت دەکەن، کە بریتی‌یە لە پێڕەوی هونەر بۆ هونەر. دامێنانی هونەری بریتی‌نی‌یە لە حاڵەتێکی لەناکاوی شتەجوانەکان یان بەهرە، سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەیان لەسەر تابلۆ وەک وێنەیەکی تەواو لە ئەسڵ چوو. ئەگەر بە خەیاڵ وا دابنێین کەکانت زیندوو دەبێتەوە و سەرێک لە مۆزەخانەو تاقیگەکانمان دەدات، بەبڕوای من دوای ڕاچڵەکینێکی کورت بۆ ئەوەی بێتەوە سەر خۆی، هەست دەکات لە ماڵی خۆیدایە، هەروا من وای بۆ دەچم کە لەپاڵ (دۆقەی رووت و قووتی سەر پلیکانەکان) هەروا هەست بە ئارامیەکی زۆر دەکات، زیاتر لەوەی لە بەرامبەری ژنە رووتەکانی (تیتان)دا هەستی پێ‌دەکات، چونکە تێوەرەکەی ئەو لەسەر جوانی مرۆڤ بە هیچ جۆرێک لەگەڵ شیکردنەوەی شکڵانی‌یەکان‌دا ناگونجێت، بەڵام بە ئاشکرا لەگەڵ ئارابیسکدا تەبایە و کەمتر لەگەڵ پۆزەتیڤیزم‌دا دەگونجێت، خەت و نەخشەی بێ‌ناوەرۆکی وێنەیی یان بێ‌نامەی ڕەوشتی کەخەیاڵ دەخاتەجووڵە بریتی‌یە لە نمونەی بیردۆزەی جوانی کانت و بەتایبەتیش دزێوترین سیفەتی هونەری کانتی‌یە.

شۆڕشی پرۆمیسۆس/

لەوەی رابردوو دەتوانین کارەکانی کانت لە زانست و ڕەوشت و هونەردا ڕەچاو بکەین. هەمان بیرۆکەش بناغەی بیردۆزەکانی کانتە لە ماتماتیک و مێژوو و ئایین و سیاسەتدا. هەموو کارەکانی کانت بەرەو یەک وەڵام مل دەنێن- پرسیاری: مرۆڤ چی‌یە؟- وەڵامی کەونی ئەوەیە کە مرۆڤ خولقێنەرە. من لەپاڵ شۆڕشە کۆپەرنیکۆسی و رۆسۆیی‌یەکەی کانتدا، شتێکی تریش دەڵێم: کارەکانی کانت نمونەی شۆڕشێکی پرۆمسۆسیشن لە فەلسەفەدا. پرۆمیسۆس ئەو کەسەیە کەمافی خواوەندانی دزی و بنیادەم لە ڕێگای خاوەندارێتی ئاگرەوە دای بەبەنی ئادەم، بێ‌گومان دەوری

پرۆمیسۆس ڕەوشتی نی‌یە، پاڵەوانەکانی زوو شەهید دەبوون. بەڵام دەورەکەی پرۆمیسۆس بوو بەهۆی لەخوبایی بوون. کانت خۆی لە قەدەریش وخراپەش لادا بەوەی هەرگیزاو هەرکیز لەبیری نەچوو کە مرۆڤ سنوردارەو بوون خۆی لە خۆیدا سنوری هەیە. ئەو جیهانەی لەلایەن مرۆڤەوە دروست بکرێت جیهانێکی سنورداری مرۆڤانەیە. مەرجە بنەڕەتی و مادی‌یەکانی ئەو دیوی سنوری سنورداری. زانین و هێزی مرۆڤایەتی‌یە، مرۆڤ خواوەند نی‌یە بەلام دەشێت لە داهێنانەکانی‌دا لە خواوەند بچێت، زۆربەی ئەرکەکانی پێشووی خواوەند بۆ خوڵقاندن‌و ڕێکخستنی جیهان لەلایەن کانتەوە دران بە مرۆڤایەتی. جیهانی فەرمانڕەوایی یان توێژینەوە لە فەرمانەکان بریتی‌یە لەو بەشەزانراوە لەودی هەمووی نەزانراوە. کانت ئەو زانا ئەنترۆپۆلۆژیایەی ڕەگەزی مرۆڤە کە لەسەر خاکی بوون دەژی، خاکی حەقیقەت. کە مەملەکەتی دونیایەو مرۆڤیش یاساکانی ناوی داناوە. جیهانی حەقیقەت دورگەیەکە کە چولر دەوری بە دەریای تووڕە گیرابێت، نیشتمانی وەهمە و لەوێدا زۆر لاولزیی تەماویی و چیای بەفرینی خێرا تواوە هەیە کە سیمای وەهمی کەنارە دوورترەکان دا دەپۆشن. هەمیشە موغامەرە خەڵێتەنەرەکانی دەریاوان بریتی بووە لە ئومێدی بۆش و هەوڵی لەبەرچاو بۆ گەیشتن. کە هەرگیز ناتوانی بەجێی بهێڵی یاخود بەرەو دوورگەی کامڵ بوون هەڵی بگرێت، کێڵانی ئەم دورگەیەو کەشف کردنی ئەم دەریایە، زانینی مرۆڤە. لەم دووانەی ڕۆشنەکردنەدا مرۆڤ نیە تەنیاو سەربەخۆ ڕاوەستاوە. سروشت مرۆڤی کردووە بە جانەوەر، دەبێ خۆی بگاتە بەرەنجامی هەموو شتێک کە لە پشتی میکانزمی بوونی ئاژەڵی‌یەوە خۆی حەشارد داوە، نابێت لە هیچ کامەرانیەکدا یان گەشکەیەکدا بەشدار ببێت، زیاتر لەوەی کە خۆی بەسەربەخۆ و ڕەمەکی دابنێت کە لە عەقڵی تایبەتی خۆیەوە خوڵقاندویەتی. ئەگەر لەبەر هەردوو وشەی بەختیاری‌و عەقڵ نەبێت، لەم پارچە نوسینەدا کە من وەرم گرت، لەوانەیە بیر لەوە بکەیتەوە کە لە واقیعییەتی (سارتەر)ەوە وەرگیراوە، سەربەخۆیی لە داهێناندا کە لە پەشێوی و حاڵەتی دروست نەبوون لە ژیان‌دا دێت. دەرەوە وەکو سیفەتە فێرکاری یەکانی کانت کە لە فیکری وجودای تازەشدا هەیە، بەلام عەقل و بەختیاری لەو وەرگرتنە دەر ناهێنرێت لەلای کانت مرۆڤی ماقووڵ سەرباری هەڵەکانیشی دەتوانێت ئەو جیهانە بخوڵقێنێت کە تۆزێ خۆشگەزەرانی و بەختیاری تێدا چنگ دەکەوێت، تەنیا بە ڕەخنەو دیسپلینی عەقل دەتوانین بگەینە ئەو داناییەی کە پێویستە.

ئەوساش هەروەکو ئێستا لۆژیکە عەقلانی نەبووە، ڕۆشنبیرانی ئەڵمانی بیری ڕۆناکبیریان هەبووە، وەکو چۆن ئێمە بیری کولوتوریمان هەیە. کانت لە سەردەمێکدا ژیاوە کەوەکو سەردەمی ئێمە گۆڕانکاری‌یەکان بەخێرایی روویان دەدا، ئەوساش شتی

کۆن کەوتبووە بەر هەڕەشەیەکی زۆر، هەروەکو ئەمڕۆ، لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە: ئێمە دەتوانین بۆدابینکردنی دەزگاکەو بۆ پیادەکردنی ئەوەی دەبێ بگۆڕێت یان ڕەت بکرێتەوە، پارێزگاری لەچی بکەین؟ ئەو سەردەمەش شتی وا هەبوو کە مرۆڤیان دەخستە گومانەوە، هۆکەشی تەقینەوەی زانیاری و ململانێ بوو لەسەر سوودمەندی. تەنانەت لەشاری (گویگلیسیدگدا) خەڵکێک هەن کە باوەڕیان بە ژیانی لۆژیکی نی یە لە ناو پەرۆشی ناعەقلانی یەت و باوەڕی پڕو پووچ دا بوونەتە پەناگیر. ئەڵمانەکان بەیاخی بوونی وا دەڵێن: (گێژەلۆکە)، ناوێکی چەند تۆقێنەرە...! کانت پێ ی وایە کە گێژەلۆکە و فشارن وهەڕەشە لە مەعریفە و شارستانی بوونی ژیان دەکەن. کە پشت بە پێشکەوتن دەبەستێت. ئەوەی کانت لە سالی (١٧٨٦)دا وتوویەتی، ئێستاش هەر مایەی هەڕەشەیە. چونکە شتێکی وەک گێژەلۆکەی لەگەڵایە. ئەم وتانە بەرەو ڕووی خەڵکە گێژەلۆکەیی و توندەکان وتراوە، بەلام ڕەنگەلەگەل ئێمەشی بێت:

[برایانی ڕەگەزی مرۆڤ.. ئەوەی پیرۆز بێت لە عەقل دانارنرێت وئەوەشی لە بەرز و بلندی دەکاتەوە لە زەوی و لە ئیمتیازی بوون، ئەوە کۆتایی کارکردنە لەناو حەقیقەتدا، ئەگەر وات کرد شایانی سەربەستی دەبیت، بەدبەختی بۆ ئەو کەسانە دەهێنێ کە دەیانەوێ سەربەستی لە شێوازە شەرعی و یاساییەکاندا بەکار بهێنن بۆ دابین کردنی باشە لە مرۆڤایەتی دا..].

× × × ×

تێبینی: بەناوی وەرگێڕی ئەم باسەو دەستەی گۆڤاردوە؛ داوای لێبووردن دەکەین کەناوی سەرچاوەکەمان نەبردووە؛ ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە سەرچاوەکە لەبەردەستدا نەماوەو ئێمەش جەوهەری باسەکەمان لاگرنگتر بووە وەک دەستەی گۆڤار...

بازنەی گفتوگۆ:

**فێری-ڕینۆ- فینکلیکرۆ- پۆمیان**

**و: ئاوات ئەحمەد**

[ لەوەتەی (فیکری ٦٨)ی هەردوو نوسەر لوک فیری و ئالان ڕینۆ بڵاوبۆتەوە. کە باسێکە لەسەر دژوەستانەوەی هاوچەرخی هیومانیزم (گالیمار ١٩٨٥)، گەلێ گفتوگۆی توندی وروژاندووە. بەلامانەوە وابوو کە ئەو گرەوسازییەی کە چاوپێداگێڕانەوەکەی ئەوان بە بیست ساڵی فەلسەفەی فەرەنسیدا خولقاندوویەتی شایانی قووڵ بوونەوەیە و ڕوونکردنەوەی ناواخنی مشت و مڕەکەی پێدەوێت. ئالان فنکلیکرۆ و کرزیزستۆف پۆمیان، ئەو نارەزاییانە دووبارە دەکەنەوە کە هەوڵەکەی ئەو دوو نووسەرە وروژاندوویەتی. هەردوکیان لەگەڵ ئەواندا مەرجەکانی دابڕان و نوێکردنەوە دەپشکنن کەحاڵی حازر نوقڵانەیان بۆ لێدەدرێ].

پۆمیان: لە مەقالەیەکتاندا نامیلکەیەکی هێگلتان هێناوەتەوە دەربارەی (جەوهەری ڕەخنەی فەلسەفی)، لەوێدا هێگل جەخت لەوە دەکات کە (ناشێ ڕەخنە هیچ مانایەکی ببێت تەنیا بەنیسبەتی ئەوانەوە نەبێت کە بیرۆکەی تاقەیەک فەلسەفەی یەکخراویان لەلا هەیە)، لەم بارەیەوە وتتان: (بۆئەوەی ڕەخنەیەک ئەزۆک نەبێت، پێویستە دان بەبەرامبەردا بنرێت و ئەزموونەکەی ئەو بەجیدی وەربگرێت و، بەیەکێک لە هەوڵە شیاوەکان دابنرێت بۆ خستنە ڕووی ئەوەی هێگل ناوی دەنێت بیرۆکەی فەلسەفە بەمەرجێ ئەو کاتە درک بەوە بکەین کە ئەم هەوڵەخۆی لە ڕاستیدا ئاستەنگێکە و لە خولرووی ئەوەوە دەمێنێتەوە کە خۆی بانگەشەی دەکات). جارێکی تریش پەنا دەبەنە بەر هێگل و دەڵێن: (کاتێک دان پیانان نامێنێ ئیتر جگە لە گوزارشت کردن لە دوو خودکە ڕووبەڕووی یەک وەستانەتەوە هیچی تر نامێنێ)و هەڵوێستی ڕەخنە دەبێت بە (نکوڵی لێکردن). ئەمە پرسیاری یەکەمە کە دەمەوێ بیکەم: ڕەخنەی ئێوە لە (فیکری ٦٨) بەچی جیاوازە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوو خودی دژ یان بەواتایەکی تر و- هەمیشە بەبەکارهێنانی زاراوەکانی ئێوە- لەچیدا جیاوازە لە ڕەخنەیەکی تەواو دەرەکیی بۆ فیکری ٦٨؟

ڕینۆ: وای بۆ ناچم ڕاستی مەسەلەکە پەیوەندی بە ڕەخنەیەکی دەرەکیەوە هەبێت. چونکە ئێمە لەو بەشانەدا کە تەرخانمان کرد بوی فوکۆ و دریدا و بۆردیۆ و لاکان،

هەوڵمان دا هەموو جارێک ئەو نمونە فەلسەفییە چاوگییە ڕوون بکەینەوە کە بەڕاستیی هەڵوێستی ئەو نووسەرانەی ناویان هات بەرامبەری بابەتیی دیاری دەکات. کەواتە مەبەست ڕەخنەیەکە کە بەوە دەست پێدەکات لەلای نووسەرێکی دیاریکراو دەوری نمونەی تەسەور کردنی واقع بگرین کە ئێمە خەریکی هەین، بەو شەرتەی دوایی دەری بخەین کە هەڵبژاردن و ڕێکخستنی تەسەورێکی ئاوا بۆ واقیع ددگاتە چ ئاستەنگ یان گرنایییەک.

فیری: دەمەوێ ئەوە زیاد بکەم کە مەبەست لەو چوار میسالە دیراسەکراوە، واتە لاکانو بۆردیۆو دریداو فۆکۆ بریتییە لە ڕەخنەیەکی ناوەکی بەقەدەر ئەوەی کە ئامانجمان ئەوە بووە ناکۆکییەکان یان ئاستەنگەکانی ناو هەڵوێستێکی تیۆری دیاری بکەین. کاتێ ئەم کارە دەکەین، دەتوانین لە کاتی پێویستدا- تەنیا دوای ئەوە- پرسیار لە ڕەچەڵەک بکەین. واتە دەربارەی هۆی ئەو گوتارانە و شوێنی مێژوویییان لە شەستەکاندا و پەیوەندیان بە بزوتنەوەی ئایار/مایۆی( ٦٨ )ەوە، هتد. بەڵام ڕێخۆشکەری حەتمیی بریتییە لە ڕەخنەی ناوخۆیی. ئەو کارەش کە لەسەر پوخت کردنی ئەو گرانییانە ڕوەستابێت کە ڕەنگە بەکێک لە نووسەرەکانی بۆ بەڕێ بخرێت، دەکەوێتە ناو ئەو شتانەوە کە بڕوای پێهێناوە. هەندێک لە ڕەخنەکانی ئێمە بە زۆر ڕەقو تەنانەت بە هێرشکاریی دانران. بەڵام ئەوەندەی من بزانم نەسەبێکی شەخسیی لە کتێبەکەی ئێمەدا نییە- لە کاتێکدا لە تواناماندا هەبوو وابکەین دوای ئەوەی بانگەشەی ڕەخنەی ناوەکیمان کرد. بەس ئەوەی ئێمە دەرمانخست بۆ نمونە سەبارەت بە دریدا، ئەوەیە کە پرۆژەی گوزارشت کردن لە ( جیایی ) بە خێرایی بەرەو ئاستەنگەکانمان دەبات. یان پرۆژەی ڕەخنەگرتن لە نوێخوازی لەلای فۆکۆ، وەک ( مێژووی شێتی ) مشت وماڵی دەکات، نەزانییەکی تەواوای لە خۆگرتووە لە سروشتی ئەو نا لاساریییە- تعارض- ڕاستەقینەی نێوان کۆمەڵگا تەقلیدیەکان و کۆمەڵگا تازەکان، هتد.

ڕینۆ: هەروەها سەبارەت بە بۆردیۆش هەروەهایە. ئەرەی هەوڵماندا دەری بخەین ئەوەیە کە ئەوبابەتەی بۆ تەرزی ( نمط ) بەرهەمهێنانی ( کۆمەڵایەتی ) بەکاری دەهێنێ بۆ بیروڕایەکان بەرەو ئەوە دەیبات کە نەتوانێ بەهەمان ئەو زاراوەیە بەرهەمهێنانی هەڵوێستە تایبەتیەکانی خۆی پەرچ بکاتەوە. بەڕاست، ئەگەر هەموو گوتارێک پەرچ کردنەوە بێت و بخرێتە ناو ستراتیژیەکانی جیاکردنەوەی کۆمەڵایەتییەوە، ئەوا بۆمان هەیە بپرسین وەزعێ ئەو گوتارە چۆنە کە گوزارشت لەم میتۆدەی گوتارەکان دەکات: ئایا خۆی لەوە قوتار دەکات کە بچێتە ناو لۆژیکی هێنانە کایەوەی بیروڕایەکان بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی، یان، ئەگەر وانەبێت، ئەو، چۆن دەتوانێ تەماعی ئەوەی هەبێ کە خۆی بەزانست دابنێ؟ ئەم ڕەخنەیە وەک نمونە ڕەخنەیەکی ناوەکییەو باسی

سەربەستی. ئەگەر بمانەوێ جیگەی شەستەکان لە ئاسۆیەکی مێژوویی زیاتردا دیاری بکەین (بێگومان من دەربارەی مێژووی فیکری قسە دەکەم)، من بڕوام وایە کە گەڕانەوە بۆ لەناودانی ئیمپریالیزم بەس نیە وەهەروەها ئەگبەتی‌یە تۆتالیتاریەکانیش ڕەچاو بکەین لە سیاقی ئەم چاو پێکێڕانەوە مەزنەدا بەهاکانی نوێخوازیی ڕۆژئاوادا- کە ئەمەش دەری دەخات کە ئایاری ٦٨ ساتێکی چەند ئاڵۆزە. بێ شک لیڤی ستراوس شوێنێکی سەرەکی لەم ڕوانینەدا داگیر دەکات: ئەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان باوکی جیهانسێیەمە- ئەگەر چی خۆی دانی بەم باوکایەتیەدا نەناوە- هەتا ئەگەر چی جیهانسێیەمی لەسەر گوتاری مارکسی ژیاوە یان هی تر لە گوتارە تەواو ناکۆکەکان لە ڕووی سیاسیەوە. لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا کە دەشێ مەسەلەی لیڤی ستراوس بن. بۆیە دەشێ پرسیاربکەین بۆچی ئەو سەمەرەییە لیڤی ستراوس لە کتێبەکەماندا وونە. بەر لەوەی لە پێشەوە ئەم هۆیە یان ئەو هۆیەمان بە خەیاڵدا بێت یان لەوەی کە تەقریبەن ناتوانرێ دانی پێدا بنرێت، وا باشترە کەمێک بیر لەوە بکەینەوە کە سەرباری هەموو شتێ (سەرباری نەزعەی لیڤی ستراوسی دژە هیومانیزم ئەگە ربمانەوێ) هێشتا، بەتەواوی ئەنترۆپۆلۆژیای بونیادگەریی و هەڵوێستی ڕەچەڵەکی جیادەکاتەوە کە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر دۆخی فیکری شەستەکان هەبووە. ڕاستەوخۆ لەماوەی دوای جەنگدا،زۆربەی گفتوگۆ فەلسەفیە فراوانەکان دەربارەی مەسەلەی مێژووبوون. من لێرەدا قسە لەسەر گفتوگۆ زانکۆییەکان ناکەم.. ئارۆن و سارتەر وازیان لە ململانێ نەهێنا، چ لەنێوانێ خۆیان یان لەگەڵ مارکسیەکانا، مارکسیەکانیش هەروایان لەگەڵ ئەواندا کرد. سەبارەت بە سروشتی مێژوویەتی و ڕۆڵی پیاوان لە مێژوودا و شێمانەی بابەتایەتی و مێژوویی، هتد. بەنسبەت مارکسیەت و تا بونگەرایی، لیڤی ستراوس بونیادێکی تەواو تازە دەخاتە ناو سیاقەکەوە، کە بیرۆکەی بونیادە. ئاشکرایە کە ئەم بیرۆکەیە خۆی لە خۆیا ڕوخاندنی خودایەتی تێدایە، بەم مانایە بیری ئەو شوێنێک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە لە هەڵبژاردەی کەسایەتیەکانی بیری دژ بە هیومانیزم. بەڵام ئێمە، لەهەمان کاتدا، پێمان وایە کە ئەوەی سەرەکییە لە بونیادگەرییدا بریتیە لە جۆرێک لە نکوڵی کردن لە مێژوویەتی. بەهەرحاڵ پرنسیپی ڕەچەڵەک کە کرۆکی هەڵوێستە تیۆرییەکانی فۆکۆ و بۆردیۆیە بۆنمونە، پێویستی بە شتێک لە پەیوەندییە مێژوویەکە هەیە کە بەتەواوی لە فیکری لیڤی ستراوسدا ونەو، تەنانەت لێشی هەڵدەگەڕێتەوە. پێم وایە ئەوانەی ڕەخنەی ئەوەیان لێگرتین کە بۆ قسەمان لەسەر لیڤی ستراوس نەکردووە، وریای ئەم خاڵە نەبوون. ڕاستە دەتوانین لەوەوە دەست پێبکەین بە خوێندنەوەی دەقەکان یان کۆمەڵگاکان و بە تەواوی دژایەتی تەناهی و هیومانیزم بکەین، بەڵام ناتوانی بە ئاسانی- ئەمەش خاڵێکی بنەڕەتیە- خوێندنەوەیەکی مێژوویی بکەین

ناگەین. بەکورتی هەست دەکەم نکوڵی کردن بەسەرتانا زاڵ بووە: هەڵنووتنی نێوە لە دژایەتیکردنی هیومانیزمدایە ویستان بسەلمێنن کە ئەم جوڵانەوەیە پڕووپووچ و شازە. نکۆڵیتان کرد لە سیفەتی تازەیی ئەو بەستەوە بەفەلسەفەی ئەڵمانیەوە (وتتان مەسەلەکە پەیوەندی بە زیادەیەکی (فیطری) و نەژادیی ئاساییەوە هەیە زیاتر لەوەی پەیوەندی بە ماوەیەکی تازەی خولقێنەرەوە هەبێت لە مێژووی فیکری). لەلایەکی تریشەوە دەریدەخەن کە دژایەتی هیومانیزم توانی هەندێک لە ناودارترین نوێنەری خۆی بەرەو فەلسەفی ببات. بەتۆزێک زیاتر لە (تقمص-ی ویژدانیەوە) دەتان توانی لە تەنامی و بەپیتی ئەم هیومانیزمە تێبگەن. ئەمەش ڕەخنەکەی لاواز نەدەکرد، بەڵکو لەوانە بوو ڕازیبوونی زیاتری دەست بخات.

فێری: پێم وایە گرانە خۆت لەم مەسەلەیە لابدەیت. وەک ئێستا ئاماژەت بۆ کرد. ئامانجی ئێمە بەتایبەتی ڕەخنەیەکی ناوەکی بوو لەمەسایلە فەلسەفیە نمونەییەکانی شەستەکان- بەبڕوای من دەبێ لەم ئامانجەوە حوکم بەسەر کتێبەکەماندا بدری). هەروەها. سەرباری هەموو شتێک، لەم کتێبەدا ڕەگەزێکی ڕاڤەکاری هەیە (بۆ وێنەی فەلسەفی شەستەکان)- بەپێی گوزارشتی ئێوە- هەروەها ساتێکی ڕاڤەکاری تر کە لە خودی ناونیشانەکەدا ئامادەیە کە ئەویش گەڕانەوەیە بۆ ئایاری ٦٨ وەک جوڵانەوەیەکی تەنامی. وریابە! من ناڵێم ئەمە تاکە ڕاڤەی شیاوە بۆ ئایاری ٦٨، بەڵام پێم وایە ئەگەر مەسەلایەتی تەنامی لە پێش چاوبگرین وەک چۆن ئەمڕۆ سازکراوە لەناو دیدێکی (تۆکفیلی تازەدا) لەلایەن نوسەرانی لە وێنەی مارسیل گۆشەیان جیل لیبۆفتسکی بۆمان ڕوون دەبێتەوە چۆن تەقینەوەیەکی تەنامی وەک ئایاری ٦٨ لەیەک کاتدا ڕەخنەگرتن لە پێوانەکان و نرخاندنی ڕۆشنبیرییەکی چێژی/ نارسیسی بینی، لەناو خوری جوڵانەوەکەشدا، بروزکردنی فەلسەفەیەک کە داکۆکی لەو بیرۆکەیە دەکات کە دەڵێت (واقیعێک نیە بەڵکو چەند ڕاڤەکردنێک هەیە و هیچی تر). ئەم سێ بابەتە لێرەدا هاوشانن، بە ئاڵ و وێر ڕوون دەبێتەوە. ئەوەی لەم کورتیەی کتێبەماندا. لێرەدا پرسیارەکەتان بەتەواوی شتێکی دروست دەپێکێت، ئەویش پەیوەندی بە ڕەخنەکانی نەزعەی جەق بەستنی ڕەچەڵەکەوە بە تایبەتی بەلیفی ستراوسەوە. چونکە لیفی ستراوس لە فەڕەنسا لە هەمووان زیاتر بەشداری کردووە لە خستنە بەردەستی گۆشەنیگای (ڕۆژئاوادا)- ڕەچەڵەکین- بۆ لێکۆڵەرەوەی تازە. بەڵام ئەم ماوەی پێداچوونەوەیە تەنیا پەیوەندی بە لابردنی ئیمپریالیزمەوە نیە. بەڕای من لەوانەیە زیاتر پەیوەندی هەبێت بەدوای جەنگەوە بەوەی کە دیاردە تۆتالیتاریەکان و، بێگومان نازیەکانیش بە شێوەیەکی تایبەت تر، بیرۆکەی سەرەکی فەلسەفەی ڕۆشنەگەری بەتەواوی لەق دەکەن، واتە بیرۆکەی پێشکەوتنی بەردەوامی ڕۆژئاوا بەرەو عەقڵ و

ئێمە لەوە زیاتر داکۆکی لە ناسنامەی واقیعی عەقڵانی ناکەین! بۆیە دەبینین لێرەدا، چ لە گفتوگۆی لاکاندا یان لە دواندنی دریدا، ئەو ساتی ئیعتیرافەی کە بەڕاستی دەڵێن دەبێت ئامادە بێت بۆ ئەوەی بەڕاستی مشت و مڕ لە فەلسەفەدا هەبێت. وەک نارەزوویەک بۆ ئاسان کردنەوەی ڕەخنەکەمان و هیچی تر، بەڵکو بۆئەوەی سیفەتێکی کاریکارتێری بدەینێ، لەوانەشە لە پێناوی دابین کردنی هەلی مشت و مڕێک، هەندێ جار توانیومانە کتێبەکەمان بخەینە ڕوو و ئەو ساتی دان پیانانەش بشارینەوە و گوتوومانە گویە ئێمە. بۆ نمونە لەلای دریدا ڕەخنە لەشێوەی ئیستیغلالکردنی بابەتی جیایی ناگرین، بەڵکو ئەم بابەتە خۆی: لەم حاڵەتەدا. ئاسانە بڵێین کە ویستمان نکوڵی لە سەدەونیوێکی فەلسەفە و دۆزینەوەکانی نەست یان جیایی بکەین و، لاقی ئەوەی لێبدەین کە دەمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ سە رهیگل و تەنانەت دیکارتیش.

فنکلیلکرۆ: لەگەڵ ئەوەشدا حەز دەکەم دوای پرسیارکە بکەوم بە مانایەی پۆمیان مەبەستی بوو، وەک ئەو، منیش بە هیچ شێوەیەک بەوەلامەکە قایل نیم. لەواقیعدا، لە کتێبەکەتانا، خۆتان لە هەمو زنجیرەیەکی ڕەچەڵەک لاداوە. ئەمە شتێکە لەسەرتان ناکەوێ و ئێوە بەباشی ئەوە شی دەکەنەوە کە لەوانەیە لەو هەڵوێستە فیکریە کەم بکاتەوە یان بیتۆقێنێ کە گوتارەکە دیاریی دەکات نەک بەناوە ڕۆکەکەی بەڵکو بە مەرجە دەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی. بەلام بەڕای من شتێکیان کەمە: لەوەی ئێوە دەیکەن لەنێوانی بەدیهاتنێکی نیسبی دا کە بە دەستەواژەی (لە کوێوە قسە دەکەی؟) بەناوبانگ هێما دەکرێت و لێکۆڵینەوەیەکی وەک ئەوەی ئێوە لەسەر شیکردنەوەی ناواخنەکان دەبێت. لەنێوانی ئەم دواندا شێمانەیەکی تریش هەیە، ئێوە پرسیار لە بزوێنەرە ناوەکییەکانی فەیلەسوفەکانی فیکری ٦٨ ناکەن. ئەوەی کە ئێوە ڕەخنەی لێ دەگرن. هەروەها پرسیاریش لە چەشنی ئەو حەساسیەتە ناکەن کە بەتەعبیرێکی تر پەیوەندی بە ڕەخنەی ئەوانەوە هەیە، ئێوە ژمارەیەک نیشانە -عرض- شی ناکەنەوە دەست نیشان کردنێکی دڵڕەقانە دەکەن. بەلام بەدوای هۆیەکاندا ناگەڕێن، ئێوە تاوانەکە کەشف دەکەن - مەرگی مرۆڤ - بەلام لەوە ناچێت پاڵنەرەکانتان بەلاوە گرنگ بێت. لەم حاڵەتەشدا لام وابێت ئەم کەللەڕەقیەی دژ بە مرۆڤایەتی لە سیاقی وەلاتانی ئیمپریالیزمەوە نەبێت تێگەیشتنی بۆنییە، پێم وایە ئەوەی ئێمە ناوی دەنێین فیکری ٦٨ ئەو کۆشانە فەرەنسیەیە بۆ بەرهەمهێنانی فەلسەفەیەک بۆ لەناوبردنی ئیمپریالیزم. ڕەخنەگرتن لە ڕۆژئاوا کە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی مرۆڤ و ڕەچەڵەکێتیەکی ڕۆشنبیریو لەت و پەت کردنی خودی مرۆڤایەتی بەکۆمەڵێک هەمووی وەها کە لەنێوانی خۆیانا کورت ناکرێتەوە وەهەموشیان بەقەدەر یەکتریی قبوڵ بکرێن. بەناوی مرۆڤی جیاوازەوە. ویستراوە کۆتایی بە مرۆڤ بهێنرێت.لە دەردوەی ئەم سیاقە لەم فیکرەتی

تۆکمەیی گوتاری ڕەخنەلێگیراو دەکات و لیّی دەپرسێتەوە، بەپیّی پرنسیپە تایبەتیەکانی خۆی، ئاشکرایە ئێمە لەلای خۆمانەوە هەرگیز ئەمان پرسیوە بۆچی بۆردیۆ باوەشی بۆ ئەو پرنسیپانە گرتۆتەوەو، دەبێ ئەم هەڵبژاردنە بخرێتە ناو چوارچێوەی کام ستراتیژی جیاوە، هتد. ئەوەی بۆردیوی لەسەر گوتارەکانی خەڵکی تر دەیکات تا ڕادەیەکی زۆر بوی ئێمەش لوابوو، بەلام لەم حاڵەتەدا مەسەلەکە پەیوەندیی دەبوو بە ڕەخنەیەکی دەرەکییەوە کە بۆردیۆ لەلای خۆیەوە لەسەر هایدگەر مومارەسەی دەکرد، بەلام ئێمە هەردەم ئاماژەمان بۆ لاوازیی ئەمە کردووە.

پۆمیان: بۆ ئەوەی ساتێکی تریش لەسەر ئەم مەسەلەی ڕەخنەیە بمێنینەوە، پێم وایە لێرەدا دووشت هەیە: لەلایەکەوە ئێوە بەڕاستی خەریکی ڕەخنەی ناوەکیین (بەلام ئەمە پرسیارەکەی من نیە)، بەواتای ئێوە بەناو ئەو بونیادانەدا ڕۆدەچن کە ڕەخنەیان لیّ دەگرن و ناکۆکیە شاردراوەکانیان ڕوون دەکەنەوە. بەلام ئەگەر بپرسم تا چ مەودایەک ڕەخنەکەی ئێوە بە ناوەکی دادەنرێت، بەو مانا هێگلییەی کە ئەم دەستەواژە کە بەکارهێنانی ووشەی (ناسین) ڕوونی دەکاتەوە، ئەمەش چونکە من هەست دەکەم ئێوە ڕەخنە لە سیستەمی فیکری دەگرن، ئێوە لیّی دەکۆڵنەوە و توێکڵەکەی لیّدەکەنەوەو لە ناوەوە توێکاریی دەکەن، بە نزیکەیی، بەلام بەبیّ ئەوەی دان بە هیچ بەشداریەکی ئیجابی ئەودا بنێن. لە خوێندنەوەی ئێوەدا، هەندیّ جار دەپرسین خەڵکی چۆن توانیویانە تا ئەو ڕادەیە وڕێنە بکەن، وەک دەردەکەویّ، وەک من دەیبینم، ئەو فەلسەفەیەی ئێوە ڕەخنەی لیّدەگرن وەک فەلسەفەیەک دانی پیّدانەنراوە، بەهیچ جۆریّ. بەم مانایە پرسیارەکە دەکەم:

ئایا ڕەخنەی ئێوە ناوەکییە؟

ڕینۆ: بەڕای من، ناتوانرێت بوترێت کە ڕەخنەکەی ئێمە بەتەواوی سەلبییە. بەوەی کە بەئاشکرا و بە پیاوەتی خۆمان دان بەوە دادەنێین کە هەندیّ ساتی ڕاستەقینە لەو بیرانەدا هەیە کە ئێمە شیمان کردونەتەوە. ئاساییە، بۆ نموونە، کاتیّ ڕەخنە لە لاکان دەگرین، ڕەخنەکەی ئێمە بەناوی بیرۆکەی شەفافیەتی خود کە تەواوکەری خۆی بێت، تەواو نابێت و.لەمەشەوە ئێمە لە پەرتەکانی خود نارەزا بین. واتە لە کۆتایی دا لە بیرۆکەی نێرینی ئەست ڕازی نەبین (ئەم بیرۆکەیە کۆنە چونکە هەر هیچ نەبێت دەگەڕێتەوە بۆ لایبنیتز): ئێمە هاوڕای لاکانین لە نارەزاییدا، وەکو هەمووان. بەرامبەر بیرۆکەی کۆجیتۆی دیکارتی! هەروەها لە گفتوگۆدا لەگەڵ دریدا، ئاشکرایە کە ئێمە بە هیچ جۆرێک نکوڵی لەوە ناکەین کە مەسەلایەتی بەرزو نزمی ئەنتۆلۆژیایی، هەروەک دریدا ئیستیغلالی دەکات (خواش دەزانیّ ئەگەر ئیستیغلالی کرابێت!) لەلایەنی فەلسەفییەوە زۆر گرنگە و پێویستە بەڕاستی ساتی پرسیارکردنی فەلسەفی پێک بهێنیّ:

(ئەوەش تەوەرییە- شاردنەوە- یە)، بەهەر حاڵ زنجیرەی ڕەچەڵەک پێویستی بە پەیوەندیی بە مێژووەوە هەیە، چونکە زنجیرەی ڕەچەڵەک تەنانەت تێکەڵی مێژوویەتی چەمکەکانیش دەبێت، وەک لەلای فۆکۆ سەرنجی دەدین. بۆیە، دەبو، ئەگەر ووتنی شیاوبێت، مێژووی بونیادگەریی هەبووایە و، ئەو مێژووەی بخرایەتە سەر کەلێی وون بووە. ئا لەم حاڵە دیاریکراوەدا، فیکری هایدگەر توانی ڕۆڵێکی گەورە ببینێ لەلای فۆکۆ بە شێوەیەکی تایبەتی. مێژووی کەینونە، بەو مانایایەی هایدگەر دەیدات بەو دەستەواژەیە، ڕێک بریتیە لە مێژووی بونیادەکان (مادام چاخەکان وەک (ڕووداوەکانی کەینونە) تێگەیشتووین کە بەهیچ شتێک قەرزاری مێژوویەتی مارکسی نیە (مێژوویەتی عەقڵێکی ئابووری)و هەروا قەرزاری مێژوویەتیەکی خودیی سەربەست و کارا نیە وەک لای سارتەر- بونیادگەری لەگەڵ فیکری هایدگەری بۆ مێژوویەتی، ئەگەر حەزبکەین کە...

فنکلیکرۆ: ئایا لەگەڵ ئەوەدا لە ڕۆڵی بونیادگەری کەم نابێتەوە؟

ڕینۆ: بونیادگەری تەنیا یەکێک لە پێکهاتەکانی فیکری ٦٨ نەبوو، بەڵکو یەکێک بوو لەئامرازەکانیشی مەبەستم ئەوەیە کەسوودی هەبوو لە چوارچێوەی کاری تەسفیە کردنی خودایەتی کەئەو فیکرە دیاری دەکات، بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرێت. پێویست بوو لە سەرەتادا مێژووی بونیادگەری هەبێت، ئەمەش شتێکی تری پێویست بوو جگە لە خودی بونیادگەری. واتە بیرێک بۆ مێژوو کە بونیادگەری ناتوانێ پێشکەشی بکات ئەوەندە نەبێت کە داوای بەشداری تر دەکات لەدەرەوەی جوغزی خۆی.

فنکلیکرۆ: باوابێ، بەڵام ئەو نووسەرانەی ئێوە هەڵتان بژاردوون بەشێک لە شێواز و چەمکەکانی خۆیان لە ئەنتەرپۆلۆژیای بونیادگەریی دەخوازنەوە، بۆ نمونە ئێوە بۆردیو دەکەنە حاڵەتێکی نمونەیی لە مارکسیزمی فەڕەنسی، بۆ ئەمەش بەخت کردنی هاوبەشییەک لە فیکری شەستەکاندا. بەڵام مارکسیزم هەرگیز ئەم چەمکە سەرەکییەی لای بۆردیۆی قبووڵ نەکردووە، کە ناسراوە بەبێ سەرو بەری ڕۆشنبیری. ئەم چەمکە ڕاستەوخۆ لە ئەنتۆلۆژیاوە وەرگیراوە ویەکێکە لە بەڵگەکان لەسەر ئەو ڕۆڵە سەرەکییەی کە لە ئەنتۆلۆژیا لە کەشی فیکری فەڕەنسی باوی شەستەکاندا بینیویەتی. جارێکی تریش پێم وایە، کە پەرۆشیان بۆ کەمکردنەوە لە شانی فیکری ٦٨ نەهێشت شوێنی تایبەتی بدەنە لیفی ستراوس لە ئیلهام پێبەخشینی دژایەتی کردنی هیومانیزمدا. ئەگەر واقیعێکی مێژوویی هەبێت کەکاری کردبێتە سەر فیکری شەستەکان لە فەڕەنسادا، ئەوا بریتیە لە هۆشیاربوونەوەی وڵاتانی جیهانی سێیەم زیاتر لەوەی یاخی بوونەکەی ئایار بێت (کاریگەرییشی هەرچەندێک بێت، لەسەر کارەکانی دواتری فۆکۆ بۆ نمونە).

فیری: بێشک، بەڵام، ئەگەر بونیادگەری بریتی بێت لە یەکێک لە ئامێرەکانی کوشتنی خود، دەبێ دەرک بەوەش بکەین کە ئەم ئامێرە ناگاتە کاریگەریی تەواوی خۆی ئەگەر بەو زنجیرەی ڕەچەڵەکە نەپێتێنرێت، کە گریمانەی پەیوەندیەک بە مێژووەوە دەکات کە لەلای لیڤی ستراوس هیچ شوێنەوارێکی نیە. بەم شێوەیە دەبینین لە شەستەکانی فەرەنسادا مێژووانیەتێکی بونیادگەریی زۆر تایبەت دەرکەوت و، ئەمەش لە دیوی مارکسیزمەوە (لەلای ئالتۆ سێرو بۆردیۆ) هەروەها لە دیوی ئەوانەشەوە کە بە ئاشکرا دەچنەوە سەر هێڵی نیتشە یان هایدگەر، فۆکۆ.

ڕینۆ: بەتەعبیرێکی تر، بونیادگەری لیڤی ستراوس لەناو کەل و پەلەکانی فیکری ٦٨دا بریتیی بوو لە کۆمەڵێک لێ خواستنەوە، بەڵام ئەو خواستنەوانە ماناکانیان بەشێوەیەکی قووڵتر دیاری دەکرێت بەهۆی بونیادەکانی وەرگرتن- ئیستیقبال-ی فەلسەفی کە کەسایەتیە جیاجیاکانی مێژووانی کە ئاماژەمان بۆ کردن پێکیان هێنا. لە مارکسەوە هەتا هایدگەر. ئەگەر بتانەوێت، ئەوا خواستراوەکان لە بونیادگەریی لێرەدا تا ڕادەیەک وەک ئەوە ئیشیان کردووە کە چۆن ئۆتۆمبێلێک دەخوازینەوە وەک هۆکارێک بەکار دێت بۆ چوون بۆ شوێنێک. ئەوەندە هەیە کە هێشتا پڕۆژەکە لە دەرەوەی ئەو هۆکارانە وایە کە ئیمە دەیان خوازین. لێرەدا لە یەک کاتدا پڕۆژەکە دواخەری هەموو وتەکان بوو و ڕوخێنەری خودایەتیش بوو. بۆیە، خواستنەوەی ژمارەیەک لە دراوەکان لە ئەنتەلۆژیایان ژمارەیەک لە ڕەگەزە چەمکیەکانی لەسەر بونیادگەریی، بەڕاستی بەسوود دەبێت. بەڵام بە ڕێگەیەک کە زیاتر لەلایەنی خودی پڕۆژەکەوە دیاری کراوە.

فیری: ئەگەر بتوانم دوای ئەم وت و وێژە ڕەگەزێکی تریش زیاد بکەم بوی ئەمە. دەڵێم: من هەروا بە چاکی خۆم دەڵێم ئەگەر ئێستا جارێکی تر کتێبەکەمان دابڕێژینەوە ئەوا پشت بە پەیڕەوێکی زیاتر مێژوویی دەبەستین- ئەگەر چی ئەمەش تەنیا لە پێناوی ئەوە دابێت کە ئەو ڕەخنانەی لێمان گیراون لەبەر چاو بگرین. لە توێی ئەم ڕوانینەوە. هەقی خۆیەتی کە (ئیشی لیڤی ستراوس) شی بکەینەوە و دوای ئەوەش کاریگەریی بونیادگەریی لەسەر دژایەتی کردنی هیومانیزمی هاوچەرخ. لەسەر ڕەخنەگرتن لە بەها دیموکراسییە ئەوروپیەکان بەناوی جیهانسیتیەمەوە. هتد. کەواتە. دەربارەی ئەم خاڵە، من تۆ بەتەواوی وا دادەنێم کە پێکاوتە. بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە لیڤی ستراوس لەسەرەتای شەستەکانا، بەنسبەتی ئەوانەوە کە ویستیان تیوریستی مێژوویەتی بن. بریتی بوو لە دژی هەر دیار، کە تازەگەرەکان گلەیی ئەوەی لێدەکەن کە نکوڵی لە مێژو دەکات- هەرچەندە ئەوانیش هەر خۆیان نین-. کەواتە من هیچ ڕێگرێکم لەبەر دەمدا نیە کە بڵێم ئالتۆسێر و فۆکۆ و بۆردیۆ و هتد ئەودی بونیادگەریین، بەڵام لەهەمان کاتدا، نابێ لە قیمەتی ئەو شڵەقاندنە کەم بکەینەوە کە

تووشی مارکسیزم هات، بەتایبەتی بۆ ئەوەی هەرچۆنێک بێت بونیادگەری هەرس بکات (ڕاستر بە گرانی )و بەتاڵ و ویریش. لە شانی ئەو بڕلرکردنە فەلسەفیەی کە سەرپەرشتی هێنانە ناوەوەی ئەزعەی پێکهاتەیی- تەکوینی- و مێژوو بۆ ناو بونیادگەری.

فنکلیکرۆ: لەهەمان کاتدا، نوسەرانی ئەو بەڵگەنامەی ئێوە ڕێکیان دەخەن بەردەوام لە نێوانی خۆیانا لە مشت و مردان. ئەمەش بە قەدەر ئەوەی لێکیان نزیک دەکاتەوە، لێکیشیان جیا دەکاتەوە.

فێری: ئەگەر بمانەوێت مێژووی فیکری فەرەنسی دوای جەنگ بخەینە ڕوو، واتە، ئەگەر مەبەستمان پێشینەیی فیکریی فیکری ٦٨ بوو (کە بەهیچ شێوەیەک ئامانجی ئێمە لە کتێبەکەدا ئەوە نەبووە)، ئەوا دەبێ ئەم گفتوگۆیانە لەبەر چاو بگرین: یەکەم، ئەو جیابوونەوەی بونیادگەریی بەنیسبەتی مارکسیزمی تەقلیدیەوە خولقاندنی هەروەها بەنیسبەتی مشت و مرەکانی ئارۆن / سارتەر / مێرلۆ پۆنتی، پاشان دەرکەوتنی تیۆرەی تازە بۆ مێژوو (بونیادکراو) گەر بشێت وابڵێین، لە ئاسۆیەکی مارکسییەوە هات. هەروا لە ئەریتێکی نیتشەویی یان هایدگەریشەوە. بەم مانایە فۆکۆ بێگومان ئاڵتۆ سێریش لەگەڵیدا، دابڕانێکی دروست کرد لەگەڵ جیلە فیکرییەکانی پێشوودا.

فنیکلیکرۆ: بەڵام تەسەورکردنی دژایەتی هیوانیزم.لەلای ئەو شیاوە و تەنانەت بیریشی لێکراوەتەوە!

فێرری: دژایەتی هیومانیزم، بەڵێ، بێشک، لەگەڵ ئەوەدا کە سروشتی ئامێریانەی هەڵوێستی لیڤی ستراوس لەوەوە هاتووە کە هەمیشە بە ئاشکرا بە مادیی یان کانتی یان بێبایەخ دانراوە. ئەوەندەی من بزانم، ڕۆژێک لە ڕۆژان لیڤی ستراوس لافی لێپرسراوێتی هەڵوێستێکی فەلسەفی دیاریکراوی لێنەداوە بەتایبەتی بۆ ئەزعەی پێکهاتەیی (بۆ مێژووانی). کە ئێوە قسە لەسەر هەستیاریی دەکەن، با لەسەر ئەوەش ڕێک بکەوین کە هەستیاری لیڤی ستراوس، وەک بزانم زۆر بەکەمی شەست و هەشتیە [واتە سەر بەو بزوتنەوە فیکرییە نیە].

پۆمیان: ئایا هەڵوێستەکان بەو ڕادەیە ئاسان و ئاشکران کە تۆ دەیانخەیتە ڕوو؟ من بەتایبەتی بیر لە لیڤی ستراوس دەکەمەوە، ئەو پرۆژەی ڕووخاندنی بناغەکانی هەموو مێژوویەکی جیهانی دامەزراند لەتەرزی دوا هێگلی، بە مارکسیزمیشەوە بگرە ئەوەی لیڤی ستراوس کردی زۆر لە مارکسیزمیشی تێپەڕاند. ئەوە (ڕەچەڵەک و مێژوو) کە باشترین دەقی نووسراوە لەم ڕوانینەوە، ڕەخنەی مارکسی بەبێ هۆ ڕقی لێیان دەبێوە. هەڵوێستی لیڤی ستراوس بەرامبەری مێژوو، بەرامبەری ئەوەی ناوی دەنێت ڕەهەندەیی

پێکهاتـەیی، بەلای منـەوە کـەمتر تێکـەڵاوی مشـت و مڕەکـانی ئـەو سـەردەمە دەبێـت. لەوەوەی کە تۆ بەشتێکی جێگیری دادەنێیت.

فێری: من لە گۆشەی مێژووی فیکرییەوە چومە ناو ئەم گفتوگۆیەوە نەک لە گۆشـەی زمان ( میتۆلۆژیا ) وە، ئایا خوێندنەوەکەی لیفی ستراوس بۆ مارکسـیزم ڕاسـتە یـان نـا؟ ئەمە مەسەلەیەکە بەتەواوی جیاوازە. ئەوەی دەمێنـێ. چ ئەگـەر ئـەوە ڕاسـت بێـت یـان هەڵە. لیفی ستراوس بە زۆریی لەناو ڕەچەڵەکی حەفتاکاندا وەک بیریارێکی (نا مێژوویی) دەردەکەوێت و، کاتێک ناچار دەبوو بیر لە بابەتێکی وەکـوو مێژوویـەتی بونیادنـەرەکان بکاتـەوە، پێویسـتی بـە نمونەیەکی چـەمکی غـەیرە مارکسیی تـەقلیدی دەبـوو. وەک نمونـەی هایدگـەریی بۆ (مێـژووی کەینونـە ) واتـە ڕێـک بـۆ مێـژووی ئـەو بونیـادە بنەڕەتیانەی کە هەرسەردەمێک لە سـەردەمەکانی جیادەکاتـەوە. لـە ڕاسـتیدا ڕیشـەی ئـەم موفارەقەیـە بایـەخی ئێمـەی ڕاکێشاوە لـە کتێبەکـەماندا، واتـە بەیـەک گـەیشـتنی دەربـارەی هـەندێ خـاڵ لـەنێوانی دوو شـەپۆلی تـەواو دژدا لـە ئـەڵمانیا کـە: شـەپۆلی هایدگەریی و شەپۆلی مارکسییە.

پۆمیان: بەڵام. ئەگەر مەناعەتتان نیە با بگەڕێینەوە بۆ هایدگەر...

ڕینۆ: لە خوێندنەوەی کتێبەکـەتانا، وامـان بـە خـەیاڵدادێت کـە ئێـوە لـە تـوێی ئـەو نووسـەرە فەڕەنسـاییانەوە کـە قسـەیان لێدەکـەن مەبەسـتان لـە نووسـەرێکی ئـەڵمانی لغاوکراوە لەلایەنی ئەو خەڵکەوەی کە بەشێوەیەکی بێزارکەر زیاد دەکەن. ئەو فیکـرەی هێرش دەکەنە سەری فیکری هایدگـەرە. لێرەوە پرسیاری زۆر هەیـە بکرێـت، یەکـەم: بەڕای ئێوە بۆچی هایدگەر ئەو دەورەی بینی لە فیکـری فەڕەنسییدا؟ هایدگـەر. یـاخود دوانـەی هایدگـەر- نیتشـە بـە ڕێگایـەکی غـەریب بـەداب و نەریتـەکاندا لـە فەڕەنسـادا دەردەکەون. بەو ڕادەیەی کە لە سەرەتادا فیکری هایدگەریی- نیتشەیی لـە جێگەیـەکی ڕاست ڕەوی سیاسیدا بوو، بە قەدەر ئەوەی کە بڕیارە چەپڕەوەکان هەڵیانگرتەوە. بـەم شێوەیەش ئەو بیرە گەیشتە هەموو شوێنێک. دەبێ ئەوەش بڵێین کە لە بواری بازرگانی فیکریدا ئەمە سـەرکەوتنێکی قەشـەنگ بـوو، چونکـە ئـەم شمەکـەی بـە شـێوەیەکی زۆر قەشـەنگ ڕەوانەکرا. هـەرچۆنێک بێت ئـەم بەچـەپ کـردن و گۆڕانکاریـیـە لـە فیکـری هایدگەر- نیتشەدا، یان خزاندنی بـەرەو لای چـەپ، بـە هـەموو مانایـەکی شـیاوی ئـەم دوشەیە، لە کتێبەکەتانا باس نەکراوە، من کـە قسـە لەسـەر ئەمـە نەکـەم بـۆ ئـەوە نیـە پرسـیاری هۆیەکـەیتان لێ بکـەم، چونکـە مـافی خۆتانـە ئـەوە نەخەنـە ڕوو. بـەڵام مـن پرسـیاری ئـەوە تـان لێدەکـەم کـە چـۆن دەڕوانێنـە ئـەم دیاردەیـە بەشـێکڵێکی وا کـە شیکردنەوەکانتان لەم دوو ئاقارەدا تەواو بکات. بۆچـی هایدگـەر؟ بۆئـەم شـتە غەریبـە: هایدگەر بیریارێکی چەپڕەو؟

فێزی: پێش وەڵامدانەوەی پرسیارەکەتان، ئەگەر ڕێگەم بدەن، حەزدەکەم قسەیەک دەربارەی جیابوونەوەکانی نێوان جیلە فیکرییەکان بکەم. پێم وایە هەر لەو ساتەوە کە سەر لە نوێ ڕۆشنبیرییەکی دیموکراسی ڕۆژئاوایی دیاریکراو هەڵدەسەنگێنرێتەوە کە تیایا ئەو مەسەلانە پێکەوە دەبەسترێن، ئەوا ئایدۆلۆژیەکانی جیهانی سێیەم لەبەر گەلێ هۆ هەرەس دەهێنن و، دەبێ وێنەی ڕۆشنبیریش بگۆڕێت: واتە چیتر ڕۆشنبیر وەک نوای جەنگ. ئەو کەسە نابێ کە بە ئیمتیازەوە وەزیفەی ڕەخنەیی بەرامبەری دەسەڵات بەرجەستە دەکات. هەر دەسەڵاتێک بێت. ئەوەی ڕۆشنبیری ناولزە جیا دەکاتەوە ئەوەیە هەمیشە لە دوو لایەنەوە دەسەڵات لە چاوی ئەودا خراپە: خراپە لەبەر ئەوەی دەسەڵاتە. چونکە بەهیچ جۆرێک دەسەڵات باش نیە، بەڵکو سەرباری ئەوەش دەسەڵاتێکی ڕەگەز پەرستە، پشت بە چینێکی دیاریکراو دەبەستێت.. هتد. سارتەر و فۆکۆ لە هەموو کەس زیاتر ئەم مانا ڕەخنەییەیان بەرجەستە کرد، بەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت ڕۆشنبیر تا نەبێت بە ڕەخنەگر ڕاست ناکات، کە ئەمەش هەندێ جار ڕێگەی پێ دەدات هەموو شتێک بە ڕەقی بڵێت و شەرعیەتیشی زیانی لێنەکەوێت، کە ئەو بە نزیکەیی لە جەوهەرەوە ڕەت دەکاتەوە، وەک گاڵتەجاری یان (هاریکاری) کردنی نزمترین شکڵ لە شکڵەکانی ئەخلاقیەتی لیپرسراوەتی، ئەو دژی دەسەڵاتی پۆڵۆنیە، کەواتە لەگەڵ (هاوکاریی)[*] دایە. دژی شای ئێرانەو بەوەش لەگەڵ خومەینی دایە. دەستەواژە بەناوبانگەکە (باشتر وایە لەگەڵ سارتەردا هەڵەبیت) هتد.. بریتیە لە دەستەواژەیەکی یەکجار نمونەیی بۆ ئەم وێنەی ڕۆشنبیرە کە لە تویی دیدێکی هەڵسەنگێنەری دەسەڵات و بەهاکانی نوێخوازیی ئەورووپادا نەبێت، مانای نییە.

فنکیلکرۆ: لەچوارچێوەی ئەم بەبالایەک گرتنەوەی ڕەخنەی ئیمپریالیزم و ڕەخنەی تۆتالیتاری، پێویستیەک بەسەر لە نوێ خوێندنەوەی دەقە بەناوبانگەکانی فەلسەفەی نوێ هەیە، چ پەیوەندیی بە (بەبەریەتی خاوەن سیمای مرۆڤایەتی) یان (ئەوانەی جەستەی مرۆڤ دەکوڵێنن و دەیخۆن) یان بە (مامۆستا بیرکاریەکانەوە) هەبێت، ئەوا ئەو ئامرازانەی کە ڕەخنەی ڕەگەزییانەی ڕۆژئاوا بەکاری هێناوە دژی تۆتالیتاریزم بەکار هاتووە. بیری شەستەکان دژی رووسیایە. هەر ئەمەش وای لە گلۆکسمان کرد کە لە (لینان و خواردنی مرۆڤ)دا بەبەردەوامی دووبارەی بکاتەوە: ستەمکارییەکی ئاسایی لە گۆڕێ نیە. بەڵکو ئەو پەری ستەمکاریی ڕۆژئاوا لە ئەقڵی رووسیدا (کۆلاک) و تۆتالیتاری بەجەستە بووە. ئەمەش دەمان بات بۆلای برنار- هنری لیفی کە ئایدۆلۆژیای چاخی ڕۆناکبیری تاوانبار دەکات، ڕەخنە لە تۆتالیتاریزم دەگرێت، بەلام دەبێ بڵێین کە ڕۆژئاوا

---

[*] هاوکاری ناوی بەرەی ئۆپۆزیسیۆنی پۆڵەندای ئەو کات بوو. (و. کوردی)

لێپرسراوه بەرامبەری، مادام ئێمه له پێناوی ئەم ڕەخنەیەدا بێجگه لەو چەمکانەی که له دژایەتی کردنی ڕەگەز پەرستیەوه پەیدابوون، ئێمه لێرەدا لەبەردەمی بەریەک کەوتنێکی غەریب داین. پێم وایه فەلسەفەی نوێ شایانی ئەوەیه سەرلەنوێ بخوێنرێتەوه چونکه مادەیەکی جیاکەرەوەیه.

فێری: من به تەواوی لەگەڵتام.

رینۆ: شایانی خوێندنەوەیه چونکه بەدواهەمین پۆخڵ بوونی فیکری ٦٨ یان ماوەیەکی لێک هەڵوەشانی خۆیی دادەنرێت.

فێری: ئەوەی فەیلەسوفه تازەکان و فۆکۆ بەیەکەوه دەبەستێت بەبڕوای من (کلامیل)ه که بەهێمنی دەڵێت: (مرۆڤایەتی سێ‌یان چوار سەدەی ڕابوردوو تۆتالیتاریزمێکی شاراوەیه به شکڵێکی شاراوەیی ڕوو له کەمی)(کانونی یەکەمی ١٩٧٦) ئەمەش ڕایەکه که نەک تەنیا کورتکراوەیەکی تراوماتیکیانەی هیومانیزمە، بەڵکو بەرەو هەڵەی گەورەگەورەش دەڕوات دەربارەی سروشتی ڕاستەقینەی تۆتالیتاریزم. سەبارەت به وێڵ بوونی ئاوەها، هەڵوێستی کلۆد لیفۆرم زۆر پێ‌ڕاستره کاتێک دەگاته سەلماندنی ئەوەی که تۆتالیتاریزمیش بریتیه له نکوڵی کردنی تەواوی دیموکراسیزمی (ڕووکەشی) و هیومانیزمی پەتی.

هایدگەر له فەرەنسا

پۆمیان: ئێمه، بەڕاستی بایەخێکی سەرەکیی دەدەین به هایدگەر له فیکری ٦٨دا. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین که ئێمه بەردەوام لەبەر دەمی سەرچاوەیەکی نکوڵی لێکراودا بووین. هەموو هەوڵی (دریدا) بۆ ئەوەیه بیسەلمێنێ که هایدگەریی نیە، چونکه جیاوازی لای هایدگەر ئەنتۆلۆژیه، بەڵام لەلای خۆی فره شێوەیه، جیاوازی سێکس، جیاوازی ئەننیکی یان هەر شتێکی تریش. هەروەها ڕەخنەش له هایدگەر دەگرێت چونکه ئەسیری بیری (تایبەت)ه، بەتایبەتی له سەرچاوەی (تایبەتی مرۆڤ): بۆیه هایدگەر هیومانیستیه! بەم شێوەیه لای دریدا نکوڵی له سەرچاوەی هایدگەریی دەکرێت وەک چۆن ڕەنگه لەلای بۆردیۆ نکوڵی له سەرچاوەی مارکسی بکرێت که زۆر به کامەرانی دەڵێت من فیبەریم... پاشان ئەوەی جێگەی سەرنجه ئەوەیه بسەلمێنین که چۆن نکوڵی کردن له هایدگەرییەت دەمان بات بۆ ئەوەی کەسایەتی تر بۆ خۆمان بخوڵقێنین کەدەوری هایدگەر ببینن، واته ڕوخاندنی میتافیزیکان و ڕەخنەی زاتیەت ئامادە دەکات، بەڵام کەسایەتیەکان فەرەنسین، لەلایەکەوه و لەلایەکی تریشەوه له هایدگەر سەلارترن، که هایدگەر وەک دەزانین ڕابوردویەکی تۆزێ مۆزعیجی هەیە [ئاماژەیە بۆ پەیوەندی هایدگەر به نازایەتیەوه و.ع]

پۆمیان: سەبارەت بە فۆکۆ دەتوانم پرسیارەکەم بخەمە روو، بەڵام هایدگەر بگۆڕم بە نیتشە، بەڵام ئێمە دەگەڕێینەوە سەر حاڵەتی کەسێتیەکانی خۆیان.

پۆمیان: بێگومان نا، ئەو هیچ ئینتیمایەکی سیاسی نیە، بەڵام شوێنی سیاسی ئەو راستڕەوانەبوو لە ئەنجامی ئەوەی حەزی لە هەڵبژاردەی ئەریستوکراتی بوو. ڕقی لە چینە میللیەکان بوو. فۆکۆ حاڵەتێکی دەگمەنە لە نیتشەوییەتی چەپڕەو. بەم شێوەیە دەگەڕێینەوە بۆ فیکری ٦٨، لەگەڵ ئەم ڕاستکردنەوەیەشدا دووبارە دەچینە سەر مەسەلەی (چەپگەریی).

رینۆ: بۆ ئەوەی لەم بەکارهێنانەی هایدگەر تێبگەین، پێم وایە دەبێ بیبەستینەوە بەوەی کە ئێستا لەسەر رۆشنبیری شەستەکانی زیادە ڕۆ لە ڕەخنەگرتندا. وترا. چونکە بەڕاستی فیکری هایدگەر، بەبێ ماندوبوونێکی زۆر ڕێگە دەدات هەڵوێستێکی ستاتیکی بەرامبەر نوێخوازی وەربگرین. بەرامبەری هەموو بەهاکان، لە هەمان کاتیشا بەرامبەری هەموو ئەو دام و دەزگایانەی کە بەهاکانی نوێخوازییان تیا دەردەکەوێت- ئەگەر دیاری بکەین هەڵوێستێکی ڕەتکردنەوەی بنەڕەتیە. ئەمەش بەو چەندەی کە خوێندنەوەی هایدگەری بۆمێژووی ئەورووپایی لە دیکارتەوە، ڕێگە دەسازێنێ بۆ دەرخستنی ئەوەی کە چۆن زانستی تەکنیکی و دیاردەی تۆتاڵیتاریی و دەسەڵاتی هۆکانی راگەیاندنی (بیرلوسکۆنی!) هەروەک بۆمبای ئەتۆمی- بەکورتی چۆن هەموو شتێ بەو شێوازە ڕاڤەدەکرێت کە تیایا پرنسیپی عەقڵیی بووە بە یاسای واقیع! کەواتە دەتوانین، بەدەسپێکردن لە هەندێ لەو بیرانەی کە سووربوم لەسەر ئەوەی بڵێم زۆر ساکارن، نەک تەنیا مێژووی فەلسەفە برمێنین، بەڵکو تەنانەت هەموو مێژووی نوێگەریی لە توێی دیاردەکانیەوە کە بە ڕووکەشی زۆر لەیەک دوورن، ئەو کاتەش هەڵوێستی نامەسئولی، دەرەوەی هەموو دەرگایەک ئەوەی لە پەراوێزدایە، ئەوەی کە ئێستا باسمان کرد، جووت دەبێت. لەم گۆشەیەو بێشک هایدگەر توانی پەرە بدات بەبەهێزترین ڕەخنەی دژی نوێخوازیی. ئەو سەرکەوتنەی کە هایدگەر لە فەڕەنسا بەدەستی هێنا. لەپاڵ لایەنی ئیستیراددا لایەنی تریشی هەیە، لەوانەیە زیاتر ڕووکەشی بن، بەڵام زۆر فەڕەنسین. بەڕای من پەیوەندی بە دیاردەی (ئامادەیی پەیمانگای مامۆستایان) و بونیادی مەتالەکەوە هەیە. لە فەڕەنسادا گەیشتن بە مومارەسەی فەلسەفە بەناو بەهەمهێنانی لەو بەرهەمە سەمەرانەدا دەڕوات کە بریتین لە مەتالەکان. بەتایبەتیش لە پەیمانگای مامۆستایان فێری نوسینیان دەبن. کە ئەویش لە کۆمەڵێ زانیاری زۆر سەرەتاییەوە، لەسەر بەرهەمهێنانی چەشنە سیستەمێکی بچوککراوە دامەزراوە. کە مرۆڤ بەبیست لاپەڕە ئاگای لە تەواوی مەسەلەی پێویست دەبێت و بگرە چارەسەریشی دەکات- ئەمەش یەکێک لە ڕێساکانی ئەو ئەهجەیە! بەهەر حاڵ ئەوەی زانیاری بەتینی هایدگەر

ڕێگەی پێدەدات، لەم گۆشەیەوە، بەتەواوی موزەیەفە، بەوەندەی کە مرۆڤ تێیبگات چۆن ڕوخاندنی مێژووی فەلسەفە کاردەکات، لەکۆمارەوە هەتا زەردەشت. لەتوێی خوێندنەوەی بەشی دووەمی کتێبی (نیتشە)ی ئەوەوە، بۆنموونە، تابتوانێت، لەپێشدا یان بە نزیکەی ئەو بەرامبەرێنە ناوازە لێزانەی نێوان نوسەرەکان بکات، کە بەرامبەرێنە باشەکان پێک دەهێنێ. کەواتە بڕوام وایە کە بەلایەنی کەمەوە دوو فاکتەری غەیرە فەلسەفی هەن کە سەرکەوتنی هایدگەر لە فەڕەنسادا ڕاڤە دەکەن، کە چی لە ئەڵمانیادا دەورەکەی زۆر لەوە لاوازترە: لەلایەکەوە، دیاردەی نازیەت و چەپاندنی ئەو دەورەی سەرکوتکەرەی ئاشکرا بینی، لەلایەکی ترەوە فەڕەنسیەکان نەک ئەڵمانەکان، ئەوانەن کە مەقالە دەنووسن، هەر لەم گۆشەیەوە- بەجوانی ئەمە لەلای قوتابیەکانم دەبینم!- بونیادی گوتاری هایدگەری زۆر گونجاوە- دەشتوانین درێژە بەمەبدەین و بیسەلمێنین- لەگەڵ پێویستی مومارەسەکردنی هونەری مەقالە بەشێوەیەکی کارا، بەنزمترین ئاستی زانینەوە. دیارە من ناڵێم کە ڕۆشنبیری ئامادەیی پەیمانگای مامۆستایان بیری ٦٨ لێک دەداتەوە. بەڵکو لە کۆتاییدا مومارەسەکانی هەندێ لە بەناوبانگترین نوێنەرانی ئەم بیرە شتێکیان لەو تێدایە...

ڕۆمیان: بەوەی کە ئەم دوو فاکتەرە گرنگن، پێم خۆشە توێژێنک لەسەر فیکری فەڕەنسی بەتایبەتی لەنێوانی فیکری هایدگەر و هەڵوێستە سیاسیە چەپڕەوەکان. ئێوە دەڵێن، هایدگەر ڕەخنەگرە لە نوێخوازیی. بەڵام لە تێڕوانینی فەڕەنسادا بەس نیە، چونکە دەشێ بەشێوازی جۆراوجۆر ڕەخنە لە نوێخوازیی بگیرێت. لەم حاڵەتی فەڕەنسایەدا ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئەم ڕەخنە هایدگەرییە لە نوێخوازیی لە شوێنێکیدا پێوەندی بە ڕەخنەی دژ بە سەرمایەداری و باڵا دەستی بۆرژوا و ڕۆژئاواوە هەیە، ڕۆژئاوایەکی بۆرژوای سەرمایەدار، هتد....واتە پێوەندیی بە مارکسیزمەوە هەیە. ڕەنگە باشتر وابێت لەم دیاردەیەدا قووڵ ببینەوە تاببینین چۆن و بەچ شێوازێک ئەم بەیەکگەیشتنە ڕوودەدات لەنێوان هایدگەر کە بەناوی ئەڤینی لادینیەوە ڕەخنە لە نوێخوازی دەگرێت- کە بەڕاستی مەبەستەکە ئەمەیە- لەگەڵ خەڵکانێکدا کە بەناوی سبەینەیەکی پرشنگدارەوە ڕەخنە لە سەرمایەداری دەگرن، هەتا ئەگەر چیتر ئەم سبەینەیە هاوشێوەی سبەینێی ستالینی پارتی کۆمۆنیستی فەڕەنسی پەنجاکان نەبێت. پێم خۆشە لەم بارەیەوە زیاترم لە ئێوە گوێ لێبێت.

فێری: تا ڕادەیەک، لەبابەتی ڕەخنەگرتن لە عەقڵی ئامرازیی دا واتە ئەو عەقڵەی کە دەشێ وەک عەقڵێکی قازانجی/ سەرمایەداری وەسف بکرێت. دەشێ زمانی هایدگەری و زمانی مارکسیزم تێکەڵاو ببن. ئەوەی دەمێنێ، دوورتر لەم ساتە هاوبەشە بەحەتمی مارکس و هایدگەرییەکان لەیەکتری جیا دەبنەوە. بەو ئیعتیبارەی کە ئەمانەی دوایی

ناتوانن لە پرۆژەی کۆمەڵگایەکا بێ چیندا، جگە لە ئامانجێکی ڕوونیایی و دەسەڵاتخوازی سەمەرەی میتافیزیکی نەبێت.

پۆمیان: هەروەها دیکارتیش

لە مارکسەوە بۆ فۆکۆ

فێری: لە گۆشەیەکەوە، بەڵێ، بێشک. کەواتە لە کۆتاییدا جیابوونە وەیەک هەر ڕوو دەدات. دەمێنێتەوە ئەوەی کە ساتە هاوبەشەکەی، دژ بە هیومانیزم، زۆر دەبینرێ لە سیاقی ڕۆشنبیری شەستەکان/ هەفتاکانی فەرەنسا، کە ئەمەش ڕێگە بەکتێبێکی وەکوو (چاودێری و سزا)ی فۆکۆ دەدات کە ڕەخنەیەک لە کۆمەڵگە بگرێت کە ناوەرۆکەکەی لای ئەو مارکسیانە قبووڵ بێت کە هێشتا لەناو چەپرەوی ڕۆشنبیریدا گوزارشت لەخۆیان دەکەن. کە ئەمەش هەرگیز ڕێگە لە فۆکۆ ناگرێت، لەلایەکی ترەوە مارکس یەکسان بکات بە هیگڵ، وەکو یەکێک لە گرنگترین (لێپرسراوەکان) لەم (ڕۆشنبیریە جەدەلیە) کە گوزارشت لە ترۆپکی هیومانیزمی نوێ دەکات وەبەم شێوەیەش لە ترۆپکی میتافیزیکیەتی زاتی.

فنکلیلکرۆ: ئەگەر ڕاست بێت ئێمە لە کتێبی (چاودێری و سزا)دا شیکردنەوەی وا بدۆزینەوە کە بەلایەنی کەمەوە بەڕووکەشی کتێبەکە بدەنە پاڵ مارکسیزم ئەوا من پێم وایەکە ڕەگەزێکی تیایە کەو بەتەواوی دووری دەخاتەوە لێی، مەبەستمان ڕەشبینیەکەی فۆکۆیە. لەلای مارکس تێڕوانینێکی گەشبینانە هەیە بۆ ئەو لێکهەڵوەشانەی لە کۆمەڵگای بۆرژوازییدا دەست پێدەکات، بەڵام فۆکۆ لای وایە کە نوێخوازیی خەست بوونەوەیە (لەم لێکهەڵوەشانەدا).

فێری: کەمترین شت کە بوترێت ئەوەیە سەرباری هەموو شتێک، لەسەر ئاستی زمان، یاریەکی دووفاق هەیە کە بە لێزانی پارێزگاری کراوە: وەک دەزانین ڕەخنەی مارکسی لە هیومانیزمی نوێ شتێک لە ئیجابیەت دەخاتە سەر ئەو بۆرژوازییەتە، وادانراوە ئەوە قۆناغێکە بەرەو داهاتوویەکی باشتر، ئیتر خڵتەو خۆڵەکەی هەرچی بێت. لە کاتێکا کە ڕەشبینی هایدگەرییانە- ئەگەر بتوانین ئەم عیبارەتە زۆر سازە بەکار بهێنین- لەوەوە دێت کە بە هیچ شێوەیەک نوێخوازی ڕێخۆشکەری ئایندەیەکی باشتر نیە بەجۆرێکی وا کە نمونە مارکسیەکە بۆ کۆمەڵگایەکی بێچین بریتیە لە ترۆپکی میتافیزیکاو (زاتیەتی دەمامک کراو) بەپێی گوزارشتەکەی هایدگەر لە (مەسەلەکان)دا.

ڕینۆ: لە توێی ئەو جیاوازیانەوە لێرەدا دیسان ئەو هەڵەمان لێدەردەکەوێت کە هەڵوێستی هایدگەرییانە دەیرەخسێنێ بۆ داگیرکردنی شوێنێکی هێزی زۆر دەگمەن، بەودی کە ڕێگە دەدات بەسەلماندنی ئەوەی کە ڕەخنەی مارکسیانە لە نوێخوازیی، کە ئەو ویستی لە ڕەگەوە بێت، واقیعێکە بەپێی زانینی خۆی لە ناو نوێخوازییەکەدایە کە

کرۆکی ڕاستەقینەی خۆی ناناسێتەوە: بۆیە دەشێ ڕێ پێشانی پێشاندەران بدرێت و، ئەمەش هەمیشە شتێکی خۆشە!

پۆمیان: ئایا لەسەر ئەم قسەیە ڕازی دەبن کە ئەم ریشەکێش کردنە لە ڕەخنەدا بە نیسبەتی ڕەخنەی کۆمۆنیستی تەقلیدیەوە دەگاتە ئەوەی کە نوێخوازیی نەتوانێ لە ئایندەدا بەردەوام بێت، ئەگەر چی بژاریش بکرێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە لە پرۆژەی مارکسیزم دا هاتووە کە پرۆلیتاریای میراتگری بۆرژوا و هەموو ئیشە چاکەکانیەتی، لە کاتێکدا لە تێڕوانینی هایدگەریدا هیچ شتێک بۆ میرات نیە، بەڵکو دەبێ هەمو شتێک لەم کۆمەڵگایە ڕەت بکرێتەوە، کە ئەمەش دەگاتە ئەو قسە خۆشانەی کە بیرتان ناخەمەوە، بەهەرحاڵ ئێوە لەمن باشتریان دەزانن.

ڕینۆ: بەنیسبەتی ڕەخنەی بەمارکساوی کراوەوە، لە ڕاستیدا هەڵوێستی ڕۆشنبیری ڕەخنەگر دیاری دەکات، چونکە لە ڕاستیدا ئەو دام و دەزگایانەی گوزارشت لە بەهاکانی نوێخوازیی دەکەن هیچ سوودێکیان تێدانیە، هەروەها- بەپێچەوانەی مارکسیزمەوە- هیچی وەها نیە تا بکرێت: (نابێ هیچ بکەین، دەبێ تەنها چاوەڕوانی بکەین)، وەک هایدگەر دەڵێت چاوەڕوانی (مۆجیزەیەک بین لە کردگارەوە) یان هاتنی خواوەندێک (کە تەنیا خۆی دەتوانێت ڕزگارمان بکات، وەک لە دوارۆژەکانی ژیاندا دەیوت. کەواتە، بواری ئەوە نەما لە گۆشەی دەسەلاتێکی ئیحتیمالییەوە سەیری کارەکە بکەین. دەسەلاتێک کە دامەزراوەکان بەڕێوە دەبات و پرسیار دەکات چی بکەین) بەم شێوەیە بناغە فەلسەفیە نا لێپرسراویەکانی ڕۆشنبیر خڕ دەبێتەوە، کاتێک هێشتا لە تێڕوانینی مارکسیدا، بێگومان بەبێ گریمانەی تۆقێنەر، گۆشەنیگایەکی ( خەباتگێڕیی ) بەسەر خۆداشکاوەی دامەزراو لەسەر لێپرسراوێتی مێژوو هەبوو، ئەوەی لە پێشەوە باسمان کرد ڕوی نەدابوو.

## نیتشە دژی ئەفلاتون

فنکیلکرۆ: ئێوە لە کتێبەکەتان دەوەرێکی هاوشان بە هایدگەر دەدەنە نیتشە و دەری دەخەن کە فیکری٦٨ لە کوێدا کەوتۆتە بەر کاریگەری نیتشە، بەتایبەتی لە توێی نۆکۆوە. یەکێک لەو بەرنامانەی کە نیتشە بوی فەلسەفە دیاری کرد بریتیە لە ڕوخاندنی ئەفلاتونیەت. پاشان هەریەکە لە فۆکۆ و دۆلۆز و ژمارەیەک لە گەورەبیریارانی شەستەکان بە ڕاشکاوی ئەم بەرنامەیان هەڵگرتەوە. ئەفلاتوون چاکەی دەخستە ژووروی هەموو ئەوەی کە هەیە. دژایەتی هیومانیزمیش. بەپێچەوانەوە لەسەر ئەوە

رادەوەستێت کە هیچ شتێک نیە لە ژووروی ئەوەوەی کە هەیە، هیچ لەسەروی مێژووەوە نیە و هیچ لە سەرووی ڕۆشنبیریەیەوە نیە. لەم بارەیەوە مێژوویەتی هەندێک و ڕۆشنبیرایەتی هەندێکی تر دەگەنەوە هەمان ئەنجام، هەمان نیسبایەتی: مرۆڤ نیە بەڵکو چەندان مرۆڤایەتی جۆراوجۆر و جیاجیا هەیە. بەڵام ئێوە هەرگیز دەربارەی ئەم دژایەتی کردنەی هیومانیزم قسە ناکەن و پێشم وایە قسە لەسەر ئەفلاتوونیەتیش ناکەن و- ڕەخنەکەی من لێرەدایە- چونکە ئێوە خۆتان بەرەنگارییەکی زۆر بنەڕەتی دەکەن کە خۆی لە مەترسی مێژوویەتی دەدات کە ئێوە زۆر پێی ناحەزن، لەنێوانی کۆنینەکان و نوێخوازەکاندا، وادیارە لەلای ئێوە فیکری ئەفلاتونی تاوانبارکراوە چونکە بەشێکە لە جیهانێک کە زووتر لێی ڕزگارمان بووە. پاشان گەڕانەوەتان بۆ نوێخوازەکان، بە تایبەتی بۆ کانت کە ڕێی ئەوەتان لێدەگرێت لە تەحقیق کردندا بەردەوام بن هەتا کۆتایی، بەتایبەتی لە دەرک کردنی ئەم دژایەتی ئەفلاتونیزمەی کە لە فیکری٦٨دا بنەڕەتیە.

فێری: لەڕاستیدا، دەتوانرێ ئەم پرسیارە بە دەستەواژەی کانتی بکرێت و دەشتوانرێت بە دەسشتەواژەی تۆکفیلیش بخرێتە ڕوو. سەیرەکە لە لەمەدایە یەکێک لە هەرە مەسەلەکانی کۆمەڵگا تازەکان، ئەو کۆمەڵگایانەش زاتانی یا فەردانی تێدا باڵا دەستە، بریتیە لە دیسان بیرکردنەوە لە شێوازی سەربەخۆیی و شێمانەی باڵا بوونی هەندێ بەناوی مێژوویەتی و نیسبیەتەوە. کارەکە تەنیا پەیوەندی بەمەسەلەیەکی (ڕەوشتی)یەوە نیە، بەڵکو بەوپەڕی ساکاری مەبەست لە شێمانەی خودی پەیوەندیە (ئەگەر هەمو شتێک جیایەکی پەتی و زاتیەکی پەتی بێت ئەوا چۆن دەشێ تەسەوری کومەڵ بکەین؟) گەورەترین نارەحەتی لەوەدایە کە ناتوانین، لە نوێخوازیدا بیر لە باڵا بوون بکەینەوە یان بیچێژین لەناو بازنەی زاتیەتەوە نەبێت (لەگەڕدونێکی غەیرە مرۆییدانا، وەکو ئەوەی کۆنەکان دەیان کرد). لێرەدا دەشێ گەڕانەوە بۆ کانت یان هۆسرل بەسوودبێت. چونکە ئامانجیان بریتیە لە، بەپێی گوزارشتی هۆسرل. بینا کردنی (التعالي في المثولية)، واتە لەناو جیهانێکدا کە جیهانی هەست و زاتیەتە (ئەمەش نەزانینی ڕەهەندەیی نەستی بەدوا دانایەت. بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە). بەنیسبەتی ئەم مەسەلەیەوە، پێدەچێ گەڕانەوە بۆ ئەفلاتوون لە جێی خۆیدا بێت. ئەی ئەوە بڕیاری (هەموو مێژوو) نیە (واتە لە هەموو سەردەمەکاندا ئامادەیە)و بە ئیمتیازیشەوە؟. بەڵام کە لە نزیکەوە تاوتوێ دەکەین، پێم وایە فیکری ئەفلاتونی بۆ بایلایی فیکرەکان، لەدەردوەی کۆزۆمۆلۆزیادا مانای نیە، کە من بەلامەوە قورسە بزانم چ سودێکی هەیە کە بخەینەوە بەردەست. دەتوانین بونیادی بەدوای یەکدا هاتووی کۆمارەکە بخەینە سەرشانی خۆمان، بەپاشا فەیلەسوفەکانیەوە لە لەلوتکەدا و

جەنگاوەرەکانی لە ناوڕاست و پیشە کەرەکانی لە ژێرەوەدا- کە ئەمەش ڕیزبوونێکە، دەزانین چۆن دەشوبهێتە سەر گەردوونی بچوککراوەی تاکەکەس کە پێک هاتووە لە عەقل و ئازایەتی و ئارەزوو. ئێمە لێرەدا بە تەواوی خەریکی سیستەمێکی گەردوونین کە هەرەسی هێناوە (ئەمەش بەتەواوی مەسەلەیەکی واقیعیە و چیتر سەر بە ڕۆشنبیریەکەی ئێمە نیە وە ناشزانین کە ئیمڕۆ چۆن دەتوانین جارێکی تر و بەجیدی لێپرسراوێتی ئەو لە ئەستۆی خۆمان بگرین.

فنکلیلکرۆ: گومانی تیانیە کە گرانە ئەمڕۆ مرۆڤ بەتەواوی ئەفلاتوونی بێت، بەلام ئێوە ناتوانن نکوڵی لەوە بکەن کە ئەو بڕیارانەی ئێوە مەبەستانن ویستویانە بە ڕاشکاوی دژی ئەفلاتوونیەت بن، ویستوویانە سەر لە نوێ جەنگی سوفتستاییەکان دژی ئەفلاتوون هەڵ بگیرسێنن.

فێری: بەلام لەبەر هۆی جیاواز، چونکە ئەوان نمونەی عەقلانیەت لە ئەفلاتووندا دەبینین.

ڕۆمیان: زیاد لەوەش، لە بەشی یەکەم و دوومی کتێبەکانتدا، کاتێ سیفەتە دیارەکانی فیکری ٦٨ دژمێرن، تا لەوێدا بەتایبەتی نکوڵی کردنێک لە ڕاستی هەیە. ئەگەر فەیلەسوفێک هەبێت و وشەی ڕاستی لەلای ئەو مانایەکی هەبێت، ئەوا ئەفلاتوون خۆیەتی. پاشان زۆربەی ئەو سیفەتانەی باس دەکەن جۆرێکن لە دژایەتی کردنی ئەفلاتوونیەتی ڕەهاو دژایەتی کردنی عەقلانیەت.

ڕینۆ: هەندێ جار خۆمان نوێنەرانی فیکری ٦٨مان بە (فەلسەفە لێدەرەکان) ناو بردووە، بەلام ئەوەی پێویستە بزانرێت هۆی هەوڵدانیانە بۆ دووبارەکردنەوەی هەڵوێستی سۆفستایی دژی ئەفلاتوون. ئەوەی ئەوان کردوویانە بە نیشانە لە فیکری ئەفلاتوونیدا لە ڕاستیدا نمونەی عەقلانیەتە- دەرکەوتنی ئەم نمونەیە، کە تا ئێستاش تەژمە- غامض-، دڵگیری ئەفلاتوون و یۆنانیەکان چ بەنیسبەتی هایدگەرەوە بێت یان فۆکۆ لەوەدایە لەلایەکەوە مژدەی دیکتاتۆری عەقل دەدەن. بەلام لەلایەکی تریشەوە بەتەواوی بەهاکانی عەقل و خۆیان نەخستە سەر ئەستۆی خۆیان: بۆیە، هەردەم ئەفلاتونەیکی چاک و یەکێکی خراپ ئامادەدەبێت. ئەمەش لە هایدگەرەوە دێت. بەتایبەتی دەقەکەی دەربارەی پێڕەوی هەقیقەتی ئەفلاتوونی- هەروەها یۆنانیە چاکەکان و خراپەکانیش هەردەبن، وەک لەلای فۆکۆ دەیبینین لە هەردوو بەش دووەم و سێیەمی مێژووی (ژیانی سێکسی). ئەو دژایەتی کردنەی ئێوە قسەی لەسەر دەکەن لەگەڵ ئەم ئارەزووەدا دەگونجێت بۆ خوێندنەوەی ئەفلاتون بەو حیسابەی کە ڕێخۆشکەرێکی لاوەکی نەک تەنیا مەسیحیەت بەڵکو عەقلانیەتی نوێکاردکانیش بێت.

فنکیلکرۆ: ناکۆکیە کۆنەکان و نوێکارەکان، سەرباری هەموو شتێک زۆر لەبەردەوامیە کەم دەکاتەوە...

رینۆ: بێشک، بەلام من دووبارەی دەکەمەوە کە ئەم دژایەتی کردنەی ئەفلاتون لە فیکری ٦٨دا لەسەر بناغەی تەسەورێکی هایدگەری- نیتشەیی بۆ مێژووی میتافیزیکا بلاودەبێتەوە، دەبینی هەموو میتافیزیکایەک- وەک هایدگەر دەلێت- ئەفلاتوونیەتە، نەک تەنیا لە بەر ئەوەی گریمانەی بوونی جیهانێکی تر دەکات بۆ دیاردەکە، بەلکو بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە ئەفلاتوون مێژووی عەقلانیەتی بەرپاکرد. هەتا ئەو وەستانە زۆرەی لەگەل نوێخوازیدا دەردەکەوێتەوەکو ساتێک راڤە دەکرێت کە رێگا دەدات بەشێوەیەکی ریشەی تر وەک ئەو تەواو بکرێت کە لای ئەفلاتوون بانگەشەی بۆ کراوە، واتە نرخاندنی عەقل، بەنیسبەتی نیتشەوە، و فیکرێک بۆ ئامادەیی، بەمانەی شێنمانەی روانین، کە تێگەیشتنی تازەی واقیع وەک بابەتێک بۆ خود بەرجەستە دەکات. بەنیسبەتی هایدگەرەوە بەم مانایە بە ئاسانی تێ دەگەین کە بۆچی دەبێ رەخنەگرتن لە ئەفلاتوون ساتێکی گرنگ بێت لە ستراتیژی فەلسەفەیەک کە لە کرۆکدا دژی نوێخوازییە: رەخنە گرتن یان هەرچۆنێک بێت گفتوگۆ کردنی ئەفلاتوون [بۆ نمونە دەتوانین بیر لەو ئەدا لێهاتوەی دریدا بکەینەوە لە دەقی نوسراودا بە ناونیشانی (دەرمانخانەی ئەفلاتوون)] مانای هێرشکردنە سەرقولترین رەگی نوێخوازییە. لەگەل ئەمەشدا، ئەوە ناگەیەنێ کە گفت و گۆکردنی فیکری ٦٨ سەر لە نوێ بچێتەوە بۆ ئەفلاتوون تاکو داکۆکی لە هەقیقەت بکات دژی فەلسەفە لێدەرەکان: مەرجەکانی فیکری هەقیقەت، ئیمرۆ ئەوانەنین کە کاتی خۆی تێرامانی ئەفلاتوونی پەرەی پێدان، ئێمە لەسەردەمێکی فیکریدا دەژین کە لە دەستپێکی نوێخوازیەوە مەسەلەی هەقیقەت خراوەتە روو. هەر لە زاتیەتەوە (دیکارت) پاشان لە نازاتیەتدا (کانت). بەم مانایەش لێک هەلوەشاندنەوەی سۆفستای شەست و هەشتەکە ناگاتە هیچ ئەفلاتوونیەتێکی تازە: بۆ بروا کردن بەمە، پێویستە، وەکو هایدگەر دەرک بەوە بکەین کە مێژووی فیکر هێلێک بووە، وەجیابوونەوەی کۆن/ نوێخوازەکان تەنیا ساتێکە لە ناوەراستی‌یەک مێژوودا کە ماناکەی لەناو ئەم جیابوونەوەیە دا کامل بووە. ئەمگەر زیاتر وریای ئەم جیابوونەوەیەی کۆن و نوێگەرییەکان بین. ئەوا گفت و گۆی رماندنی میتافیزیا بەو حسێبەی کە لە هەمو لایەکەوە ئەفلاتونیە، بەهیچ شێوەیەک ناچێتەوە سەر دەسپێکردنە (ئەفلاتوونیەکە) بۆئەوەی کە ئەو رماندنە رەخنەی لێدەگرێت: لە ناوەراستی نوێخوازی بەم هەمو خوێندنەوانە گونجێندراوەدا ئەمرۆ پێویستە شیاوەکان هەل بسەنگێنرێنەوە.

پۆمیان: پێم وایە یەکێک لە سیفەتە مێژووییەکانی فۆکۆ لەوەدایە کە بابەتی وەکو تاراوگەو بەندیخانە و ژیانی سێکسی بەرزکردەوە بۆ ئاستی بابەتە فەلسەفییەکان. ئیتر

هەڵوێستی هەریەکێک لەم بابەتانەدا هەرچیەک بێت و بیروڕاکانی هەر چۆن بن، هەروەها بەهای مێژوویی کارەکەش هەرچەندێک بێت. کە دەزانین گەلێک گفت و گۆی وروژاندووە، بەتایبەتی دەربارەی بەندیخانە، ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە ئەو فەیلەسوفێک بووە هەوڵی داوە لە جیهانی داخراوی دەقە فەلسەفیەکان بێتە دەرەوەو، هەوڵی داوە فەلسەفە شتێک دروست بکات کە بەشێوەیەکی تەقلیدی سەر بەو بابەتە موناسیبەی بیرکردنەوەی فەلسەفی نیە، بەتایبەتی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی فەرەنسی. بەهەر حاڵ لە خوێندنەوەی ئێوەدا، لێرەدا تەنیا بیر لەو کتێبە ناکەمەوە کە دەربارەی فیکری (٦٨)ە بەڵکو لەو سێ‌بەرگەی لەسەر فەلسەفەی سیاسی نوسیتان و مەقالەکانیشتان کە لە (سیستەم و رەخنە)دا کۆکراوەتەوە، مرۆ واهەست دەکات کە ئێوە بەبەردەوامی بەشێوەیەکی توند و تۆڵ، دەگەڕێنەوە بۆسەر دەقە ئەدەبیەکان بەتەنیا. دونیای ئێوە دونیای کەلتوری فەلسەفیە. بۆتان هەیە پرسیارەکەی من وەک ئیعتیزارێک تێبگەن یان نا. بەڕاستیش ئیعتیزارە، بەلام من ئەم لایەنەم بەلاوە گرنگ نیە، ئێمە بۆ گفتو گۆکردن لە هەڵوێستە تایبەتیەکانمان نەهاتووین بۆ ئێرە. دەمەوێ سەبارەت بەم خاڵە هەڵوێستی خۆتان بخەنە ڕوو: ئایا بەڕاستی پێتان وایە- ئەگەر وەلامەکەتان (بەڵێ) بێت. بەڵگەتان چیە- کە ڕێنسانسی فەلسەفە (کە ئێمە زۆرمان پێویستە پێم وایە لەسەری ڕێکین) دەبێ گەڕانەوە بۆ کولتوری فەلسەفیدا بێت، بۆ فیکرێک کە دونیای تەقلیدی فەلسەفەوە دەقی فەلسەفی- ڕوونی بکەنەوە کە ئێوە چۆن تەسەوری پەیوەندیەکانی نێوان فەلسەفەو نافەلسەفە دەکەن.

سەرچاوە/ گۆڤاری

الفكر العربي المعاصر- ژمارە- ٤١-ی سالی١٩٨٦

(هل هناك فكر ٦٨؟ (فيرني-رينو- فنكلبكرو- بوميان)

وەرگێڕانی: جورج ابي صالح- مركز الانتماء القومي بيروت ل-٩٨-٥-١٠

تێبینی/ بەشێکی گفت و گۆیەکەیە..

# ئایا زمانێکی فەلسەفی هەیە؟

*دیدارێک لەگەڵ ((جاک دریدا))*

و: یوسف عزالدین

[ کاتێک فەلسەفە بیر لەو تێکستانە دەکاتەوە، کە لە فۆرمی ستاڤێکی کەلەپووریدا بنیاتی ناوە، جۆرێک لە تەبا بوون لەگەڵ شێوازێک لە شێوازەکانی نووسین دەدۆزێتەوە. سنوورەکانی گوتاری فەلسەفی چی‌یە؟ پانتایی و مەوداو پەرژینەکانی چی‌یە؟ لێرەدا جاک دریدا چوار وەڵام دەنووسێت].

١- گوتاری ئۆترمان: لە زۆر شوێندا ئاماژەت بۆ ئەوە کردووە. کە دەبێ تێڕوانینمان بۆ تێکستی فەلسەفی وەک خۆی بێت. پێش ئەوەی تێپەڕی بکەین و ڕۆبچینە نێو ئەو بیرۆکەیەی کە تێیدایەتی. هەرنەمەش بوو پاڵی پێوە نایت بۆ خوێندنەوەی تێکستە فەلسەفیەکان، هەر بەو چاوەی کە تێکستە ئەدەبیە شیاو و گرنگەکان، بە شێوەیەکی گشتی دەخوێنێتەوە. هەر بۆیە خۆت لە ناچارییەکدا بینییەوە، بۆ ئاوێتە کردنی ئەدەب لە نێو ئێشکالییەتی فەلسەفیدا. پرسیارم بۆ تۆ ئەمەیە: ئایا چەشنێ لە نووسینی فەلسەفی پەتی‌هەیە، ئەو شتە چی‌یە. کە لە شێوازەکانی تری نووسین جیای دەکاتەوە؟ ئایا خولیای ئەدەبی لە فرمانی سەلمێندراوانە و ڕوونکارییانەی گوتاری فەلسەفی لامان نادات؟ ئایا تێکەڵکردنیان نابێتە مایەی سڕینەوەی تایبەتمەندێتی جۆرەکانی نووسین و ناچارکردنی هەموو دەقەکان بۆ مل دان، بۆ هەمان پێودانگ و میتود؟

٢-جاک دریدا: هەموو تێکستەکانی جیاوازن ونابێت بیانخەینە ژێر کاریگەری هەمان پێودانگ. ناکرێت بە یەک چاو تێی بڕوانین و بیخوێنینەوە هەر تێکستێک، گەر گوزارشتەکەم لە جێی خۆیدا بێت، چاوێکی خۆی دەوێت. ڕاستە تێکست تا رادەیێک بەپێی پێداویستی جغرەیەکی تایبەت و دیاریکراو دەجووڵێتەوە و تەباو کۆکیش دەبێت لەگەڵ ئەو چاو و گوێچکەیەی کە بە ئاراستەکردن و شیکاری پێشی دەکەون. بەڵام ئەوەی کە تایبەتە بە هەندێ لە تێکستە دەگمەنەکان، ئەوە نووسین تێیدا بەلای فۆرمەلەکردنی بونیاد و فیزیۆلۆژیەتی چاودا لانەدا. کە هێشتاکە نیە و تێکستەکەش وەک ڕووداوێک. بەواتای ئەوەی کە تێکست وەرگر ( متلقی ) دروست دەکات، هێندەی ئەوەی کە لەلایەن ئەوانەوە ئافەریدە دەکرێت، یان هێندەی ئەوەی کە ناچارە لە خۆی بگۆڕێت، بۆ ئەوەی تەبا گونجاو بێت لەگەڵیاندا. ئەو پرسیارەی

لێرەدا خۆی تەرح دەکات، ئەوەیە: هەر تێکستێک بۆ کێ دەنووسرێت و ئاراستەی کێ دەکرێت، تا چەند لەلایەن نوسەرەوە کۆنترۆڵ دەکرێت وچەندیش لەلایەن خوێنەرەوە؟ یان بۆچی ئەو کۆنترۆڵکردنە جۆرێک لە (گەمە) دەگرێتە خۆی یان ئازادییەک کە ناتوانرێت لێی لابمرێت و ئابلووقە بدرێت، یان ئەوشتانەی کە پێویستن؟ ئەم پرسیارانە مێژوویی و کۆمەلایەتی و دەزگا کاریو رامیارین.

بۆ ئەوەی قسەکانم سنووردار بکەم، بەو شێوازەتێکستانەی کە تۆ لە پرسیارەکەتدا وروژاندت، پێم خۆشە پێت بڵێم کە من هیچ کاتێک لە یەک دیدگاوە نەمروانیوەتە تێکستی فەلسەفی و ئەدەبی، هەر دوو شێوازی تێکستەکان لای من لە رەگ و ریشەوە جیاواز و جودان. بە شێوەیێک کە پاشگەز بوونەوەی تێدا نیە. بەلام دەبێت ئەوە بزانین کە سنووری جیاکاری لە نێوانیاندا زۆر لەوەئاڵۆزترو تێکچڕژاوەترە کە ئێمە پەی پێ دەبەین. بۆنمونە من پێم وانیە، کە دوو جۆر بن (بەواتای جۆرەکانی ئەدەب) وەک ئەوەی کە لە پرسیارەکەت دا مەزەنە دەکرێت. هەروەها ئەو سنوورە جیاکارییە، کەمتر لەوەی کە لە بارەوەی دەگوترێت و زۆر جاریش باوەڕی پێ دەهێنرێت، خۆیی و سروشتی و نامێژووییە. هەردوو شێوازەکەش لە تێکست، لە توانایدا هەیە کەلەیەک کتێب یان تێکستدا ئاوێتە ببێت، بەپێی یاسا و شێوازی تایبەتی و لێکۆڵینەوەش دەرەحق بەویاسا و شێوازانە، نەک هەر خۆشی ئامێز و نوێیە، بەڵکو پێویست و گرنگە بۆ دیاریکردنی شوناسنامەی (گوتاری فەلەسەفی). گەر تا ئێستاش مەبەستمانە بزانین کە چی دەڵێین. بە پێویستی دەزانین کە گرنگی بدەین بە لێکۆڵینەوەی ئەو داب و نەریت و دەزگاو راڤەکردنانەی کە دەزگای پێودانگ و هەڵسەنگاندن پێک دەهێنێت و پارێزگاری مانەوەی دەکات، سەرباری هەموو جۆرە پێودانگ و یاسایێک و جۆرەکانی دوورخستنەوەو دژایەتی کە لە نێویدایە؟ ناتوانین لە زنجیرەی هەموو ئەو پرسیارانە نزیک ببینەوە، لە ئێستا دابێت یان لە داهاتوو دا، گەر ئەم پرسیارە لە خۆمان نەکەین: فەلسەفە چی یە؟ ئەدەب چی یە؟ ئەم دوو پرسیارەش لە هەموو کاتێک قورستر و لە هەموو کاتێکیش زیاتر کراوەترن. ئەم دوو پرسیارەش، نەبە شێوەیەکی پەتی فەلسەفین و نەبە شێوەیەکی پەتی ئەدەبین. مەگەر مەبەستمان بێت لە نزیکەوە لێتوێژینەوەی دەرحەق بکەین و بە چڕی تێی بڕوانین. دەرحەق بەو تێکستانەی کە خۆشم دەینووسم. هەمان شت دەڵێم، لە دوو توێی پێودانگێکدا، کە لەبەر دەم شالاوی ئەو پرسیارانەدا تێپەڕ کراوە. ئەمەش ئەوە ئاگەیەنێت کە تێکستەکانم دەستبەرداری سەلماندن و ئیقناع کردن بوون و لەگەڵ ئەوەشدا شێوازەکانی بەڵگە هێنانەو سەلماندن، تەواو ئەوە نیە کە لە (گوتاری فەلسەفی)دا، وەک ئەوەی تۆ ناوی دەبەیت، بەرچاو دەکەوێت. تەنانەت لە ناوەخنی ئەو گوتارەشدا، سیستماتیکی سەلماندن، جۆراو جۆر و بزۆز و پڕ لە ئیشکالە و

خۆی لە خۆیدا بابەتی بەردەوامیە بۆ هەموو مێـژووی فەلسـەفە و ئـەو گفتـو گۆیـەی کـە لەبارەشیەوە بڵاو بۆوە، تەنانەت تێکەڵ بە خودی فەلسەفەش دەبێت. ئایا باوەڕت وایـە کە یاساکانی سەلماندن، دەبێت هەر یەك شت بێت، لای ئەفلاتون و ئەرستۆ و دیکـارت و هێگڵ و مارکس و نیتشە و بیرگسۆن و هایدگەر و مۆریس میرلۆ بۆنتی؟

ئایا هەمان زمان و لۆژیك و ڕەوانبێژییان هەیە؟

من دەڵێم، شیکردنەوەی تێکستی فەلسەفی لە میانەی فۆرمی دەرەکی و شێوازییەوە ئەوە ناگەیەنێت کە لە چوارچێوەی تێکسـتی ئـەدەبیدا قەتیسی بکـەین. شـیکردنەوەی شێوازی پێکهاتنی و ڕەوانبێژی و مەجاز و زمان و چیرۆکـە فەنتازییـەکانی و هـەموو ئـەو شتانەی کە قابیل بەوەرگێڕان نیە. ئەوە تا ڕادەیەکی زۆر شـتێکی فەلسـەفییە. تەنانـەت گەر لە سەرەتاوە تا کۆتایش بە شێوەیەکی فەلسەفی نەمێنێتەوە. فەلسەفەیە گـەر لـەو شێوازانە بکۆڵینەوە کە لە شێوازێك زیاترن. فەلسـەفەیە گـەر لـەو شـێولزانە بکۆڵینـەوە. کـە ڕاڤـەی شـیعر و ئـەدەب دەکـەن و جێگـە و شـوێنی کۆمەڵایـەتی و ڕامیارییـان بـۆ دەدۆزنەوەو هەوڵ دەدن لە پانتاییە تایبەتییەکەی وەدەری نێن. دەزگای ئـەکادیمی بـۆ فەلسـەفە کاتێك شـیعر و ئـەدەب لـە گۆڕەپـانی خـۆی دوور دەخاتـەوە. هەوڵدانێکـە بۆ پاراسـتنی سـەربەخۆیی خـودی و پیـادەکردنی جۆرێـك لـە ئـەفی، بەپێوەر بـەو زمانـــە تایبەتیەی: کەتۆ پێ‌ی دەڵێیت ئەدەب و بە پێوەر بەنوسینیش بـە شـێوەیەکی گشـتی. کاتێك دەزگـای ئـەکادیمی فەلسـەفە ئیدامـە بـەو جـۆرە پیادەکردنـە دەدات، پێودانگی گوتارەکـانی لـێ هەڵـە دەبێـت و پـەیوەندی نێـوان قسـەکردن و نووسـین و تـەکنیك و پیرۆزکردنی تێکستە گەورەکان یان نمونەییەکان، هتد (تێکستەکانی ئەرستۆ بۆ نمونـە، یان ئەفلاتون یان کانت یـان دیکـارت... ) ئەوانـەی کـە بەرامبـەر هـەموو ئـەو پرسـیارانە ڕادەپەڕن دەیانەوێت پارێزگاری لە جۆرێك لە شان و شکۆی دەزگاکاری فەلسـەفی بکەن، بـەو ئاکـار و سـیمایەی کـە یـەکێك لەسـاتەکانی مێـژوودا بەرجەسـتە بـوو، پاشـان لـەو داڕژگەیەدا قاڵبیەندبوو. ئەوان کاتێك خۆیان لە مەترسی ئەو پرسیارانە دەپارێزن. بـەوە دەزگاکە لە فەلسـەفە دەپارێزن. لـەم دیدگایەشـەوە بـەگرنگ و چێژبەخشـی دەزانم، کـە لێکۆڵینەوە دەربارەی هەندێك لەو گوتارانە بکەم، کە فەلسـەفەی بە جۆرێـك لـە ئـەدەب داناوە (وەك گوتارەکانی نیتشە و ڤالیری). بەڵام من هیچ کاتێك لەگەڵ ئەو تێڕوانینەدا نەبووم وەپێشتریش هەڵوێستی خۆم ڕوونکردۆتەوە. بـەڵام ئەوانـەی کـە بـەوە تاوانبـارم دەکەن. کە فەلسەفەم کردۆتە ئەدەب و لۆژیکم کردۆتە ڕەوانبێژی، زۆر بە ساناییی ئەوانـە منیـان نەخوێندۆتـەوە. (سـەبارەت بەمـەش بڕوانـە دوا کتێبـی هابرمـاز و ڕاوبۆچوونـی لەسـەر: (گوتـاری فەلسـەفی نوێگـەری) وەرگێڕانـی فەرەنسـی، بڵاوکراوەکـانی گالیمـار ١٩٨٨).

بەرامبەر بەمەش، من پێم وانیە کە شێوازی سەلمێندراوانە و تەنانەت فەلسەفەش بەشێوەیێکی گشتی نامۆ بن لە ئەدەب. هەروەک چۆن مەودای ئەدەبی فانتازی لە هەموو گوتارێکی فەلسەفیدا هەیە و سیاسەتیش چ وەک زمان و چ وەک واتای ووشەکە بوونی هەیە. لە هەمان کاتیشدا سیفاتو خەسلەتی فەلسەفی لە هەموو تێکستێکدا کە بە ئەدەبی ناسراوە، یان بە شێوەیەکی روونتر لە چەمکی ئەدەبدا، کە چەمکێکی نوێیە، دیار و ئاشکرایە.

هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی فەلسەفەو ئەدەب، تەنها کێشەیەکی قورس نیە، کە دەمەوێت بیخەمە ملێنم و لە خۆشیدا چارەسەری بۆ بدۆزمەوە. بەڵکو لە تێکستەکانمدا شێوازێکی نا فەلسەفی و نا ئەدەبی پەتی دەگرێتە خۆی. من نامەوێت قوربانی بدەم بە هیچ یەکێک لەو مەودایانە: مەبەستم مەودای سەلماندن و بەڵگەهێنانەوەی لۆژیکییەکە پشتگیری لە تیزێکی دیاری کراو دەکات و پاشان مەودای بە ئەدەب بوونی زمان و بە شیعر بوونی.

دواجار. بۆ ئەوەی راستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە، من پێم وانیە کە نووسینێکی فەلسەفی پەتی هەبێت، واتە بوونی تەنها جۆرێک لە نووسینی فەلسەفی. ئەو نووسینە بێگەردە بەردەوامە هەمیشەییەی کە وەک خۆیەتی و دوورە لە هەموو گۆڕان و پەتایێک. هۆکارێکی گەورەش هەیە بۆ باوەڕ نەهێنان بە بوونی ئەو جۆرە نووسینە: ئەویش ئەوەیە کە فەلسەفە نووسین و قسە پێکردنی بە زمانێکی سروشتی مرۆڤانەیە. نەک بە زمانێکی بیرکارییانە یان گەردوونی. بەڵام لە نێو خودی ئەو زمانە سروشتییە و شێوازەکانیدا جۆرێک لە شێوازی گوزارشت ئامێز. بە توندی خۆی سەپاندووە. بە سیفەتی شێوازێکی فەلسەفی (مەسەلەکە لێرەدا، مەسەلەی هێز و باڵانسەکانی هێزە بە کردارەکانن). بەڵام ئەم شێوازە گوزارشتگەرەییانە جۆراوجۆر و تێکچڕژاون بە شێوازێک کە ناتوانرێت لە ناوەڕۆک یان لە تیزە فەلسەفیەکانی کە گوزارشتی لێدەکات، داببڕێت. گفتوگۆی فەلسەفی تەنها مێزگردێکی ئەبستراکت نیە، بەڵکو بریتی‌یە لە جەنگێک کە هەر لایێک دەیەوێت شێوازی گوزارشتی ئیستدلالی خۆی بسەپێنێت. لەتەک رێگا و رێچکەی سەلماندنو بەڵگە هێنانەوە و تەکنیکی رەوانبێژی و پەروەردەیی (بیدا گۆگیزم)، هەر کاتێکیش فەلسەفێک رووبەڕووی بەرامبەرکێ و دژایەتی بوو بێتەوە، ئەوە لە ژێر ناوی بەرپەرچدانەوەی نا فەلسەفی و نارەسەن بەئەنجام گەیەندراوە.

٢- گۆڤاری نۆترمان: لە دوا ئیشەکانتا سەرنجمان دا کە گرنگییەکی زیاد دەدەیتە مەسەلەی ئیمزاکردن و ناوی کەسیتی (ناوی عەلەم). گرنگی ئەم مەسەلەیە چییە، سەبارەت بە کایەی فەلسەفە. کە دەمێکە ئەو مەسەلانەی بەشتێکی ماملاونجی داناوە.

فەلسەفە هەموو ئیشکالیات و مەسەلەکانی بەدەر لە کەسایەتی داناوە وناوی فەیلەسوفەکانیشی وەک سیمبۆلێک داناوە، بەسەر کارە فەلسەفیەکان و ئیشکالاتە فەلسەفیە گەورەکاندا. بە واتایێک کە مەسەلە فەلسەفیە مەزنەکان گرنگترن و هەموو ئەوانیش کە ناوی فەیلەسوف و کەسایەتییەکانیان تێپەڕ دەکەن.

جاک دریدا: هەر لەگەڵ یەکەم دەسپێکی فەلسەفەییدا، ئیشکالاتێکی نوێم لەنێوان نووسین و کاریگەریدا دۆزیەو. دەشبوو وەک پێداویستیەک بە شێوەیەکی توندو تۆڵ لەگەڵ ئیشکالییەتی ناوی (عەلەم) دا بکەوێتە گەڕ (ئەم مەسەلەیەش بۆتە بابەتێکی سەرەکی لە یەکەم کتێبمدا سەبارەت بە گراماتۆلۆجیا=زانستی نووسین). ئیشکالیەتی ئیمزاکردنیش هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی (پەراوێزەکانی فەلسەفە) گرنگی خۆی بەدەست هێنا. ئەم مەسەلەیەش گرنگ و پێویستە، چونکە ئیشکالیەتی نوێی کاریگەری (Trace) لە میانەی هەڵوەشاندنەوەی هەندێک لە گوتارە میتافیزیکییەکان، کە چەقبەستوون بە دەوری خودی دامەزراودا و هەموو ئەو خەسڵەتانەی کەبەشێوەیێکی تەقلیدی جیایان دەکاتەوە: بەواتای هاوجووت بوون و هاوشێوە بوون لە گەڵ خوددا. پاشان چەمکی هۆشمەندی و مەبەست و ئامادەباشی و نزیک بوونەوەی خود لە خودی خۆی و سەربەخۆیی خودی و پەیوەندی لەگەڵ شتە دەرەکیەکان. ئەو دەمە مەتبەستم بوو. بابەتی کار فرمان (ئەو خودەی وەک کار فرمانێک وەردەگیرێت) بگەڕێنمەوەو سەر لەنوێ بیرێکی نوێ دەرحەق بە خود بخەملێنم و بەدەر لە دوگماتیزم و ئەزموونگەری و رەخنەگەریانەی (کانت) و فینۆمینۆلۆژیای (دیکارتی- هوسیرلی) بخەمە روو لە هەمان کاتیشدا گرنگیم دا بە تێزەکانی هایدگەر سەبارەت بە میتافیزیکای خود وەک کۆڵکەیەکی تێڕوانین، هتد.. پێم وابوو، کەکارەکەی هایدگەر بەس نیە و پێویستی بە پرسیاری ترە. گەرچی من ئەو پرسیارکردنانەی هایدگەرم، لەبەر چاو گرت. بەڵام سەرنجم دا کە هایدگەر هەردەم دووبارەکردنەوەییکی هەیە (بۆ نمونە لە کتێبەکەیدا، لەسەر نیتشە) لەنێوان ئەو جووڵە کلاسیکیە ئەکادیمییەی کە لە خوێندنەوەی (ناوەکیدا) لە بەشەکانی تێکستدا خۆی دەنوێنێت، یان بیرۆکەکەی، یان تەنانەتیش خوێندنەوەی چەسپبوونی حەرفی بۆ سیستەمی فیکری بەگشتی و لە نێوان ئەو (ژیانە خودییەی) نیتشە، کە لەهەمان کاتدا بە شێوەیەکی لاوەکی ودەرەکی دەمێنێتەود. هەر بۆنمونە. دەبینین کەلەزانکۆدا. گێڕانەوەیەکی سەردی کلاسیکی تێکەڵ بە (شێوازێکی رۆمان و چیرۆک ئامێز) لە پاڵ خستنە رووی (ژیانی گەورد فەیلەسوفەکاندا) دەخرێتە روو. سەرباری خوێندنەوەی فەلسەفی سیستماتیک و بونیادگەرییانەی ناوەکی. بەو واتایەی کە ل زانکۆی سۆربۆن و بەشەکانی فەلسەفەدا جێکەوتەبوونێک هەیە لە نێوان میتودی تەقلیدی لە فێربوونی مێژووی فەلسەفەو میتودی نوێی بونیادگەری. ئەم

ڕێچکەیەش چەقبەستوو دەکەن لە نێوان زەینڕوونییەکی ناوازە یان بلیمەتانە (ئەمەش بابەتێکی هاوبەشە لای بێرگسۆن و هایدگەر)، سەبارەت بە مەسەلەی پەرەسەندینش. بە واتای پەرەسەندن و بەرەو پێش چوونی فەیلەسوف، بۆ دو قۆناغ، یان چەند قۆناغێک دابەش دەکرێت. (هەر بۆ نمونە نیتشە بە شێوەیەکی باو، ژیانی بۆ سێ قۆناغ دابەش دەکرێت). هەوڵمدا کە ئەو بەڵگە نەویستە ناوەکییانە شیکار بکەم، کە دەبنە باگراوندی ئەو شێواز و میتودانە. هەروەها هەوڵمدا بچمە نێو ئەو لێتوێژینەوەو شیکاریکارییانەی، کە دەرحەق بە پانتایی و سنوور و چوارچێوە و هەموو پرۆسێسەکانی دوور خستنەوەو بە پەراوێز کردن کە لەو بەشانەی کەپێشتر باسمان کرد ڕەنگ دەداتەوە. هەر بۆیە پێم وابوو، کە مەسەلەی ئیمزاکاریو ناوی عەلەم، زۆر گونجاون بۆ بەرپەرچ دانەوەی میتودی تەقلیدی و خەملاندنی کارەکان و ڕوونکردنەوەیان. ئیمزاکاری بە شێوەیەکی گشتی ناوەکی نیە، یان بە سادەیی لەسەر ماتەریالی تێکستەکە وەدەردەکەوێت. ئەوەی تایبەتە بە ئێمەش هەموو کارە فەلسەفیەکانە، بەسانایش بەدەر لەوو بەجیا لەویش نا.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئیمزا وەک ئیمزا دەسڕێتەوە. لە کاتێکدا ئیمزای تایبەتیت بەشێوەیەک لە شێوەکان ناچێتە ناو ئەو پانتاییەی کە ئیمزای لەسەر دەکەیت. ئەو پانتاییە دیاریکراوەی کە لەسیستەمێکی سیمبۆلیستی بڕیار دراودا، وە دەردەکەوێت (وەک نامە. چەکی بانکی و هەر جۆرە بەڵگەییکی تر) ئەوەهەموو بە هاییکی ناچارییانەی بە جێ دەهێڵێت. بەڵام بەرامبەر بەوەش گەر ئیمزاکەت بە دەقەکەتەوە بوو. ئەوە ئەو هێز و توانستە گریمانەیەی ئیمزای نیە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا (دەرەکی وناوەکی) تۆ تەنها ناوی خۆت دەنووسیت. ئەمە بێجگە لە ئیمزا کردن. ئیمزا کاری نە لەناوەوەیەو نە لە دەرەوە، بەڵکو لەسەر چمکێک نۆقرە دەگرێت کە لەلایەن سیستەمێک و مێژوویێکی تەواو لەداب و نەریت بنیادنراوە، بەڵام ناکرێت باوەڕی پێ بهێنرێت و قبووڵ بکرێ بەبێ پرسیار کردن لە دوو تووێی ڕوانگەی ئەۆیشکالیەتەی کە لەبارەوەیە دەدوێم.

هەر بۆیە دەبوو کە گرنگی بدەم بەو مەسەلانە: مەسەلەی (داب و نەریتە دانراوەکان) مەسەلەی (مێژوو) تۆپۆلۆژیا [واتە دابەش کردنی جێگە و شوێن لە پانتاییەکدا]. پاشان مەسەلەی لێپرسراوێتی و هێزی گریمان. هەر بۆیە دەبوو کە ئەم مەسەلانە لە دژە دوالیزمەکان و بە دیلە دژەکان کە پێشتر باسم کرد، ڕزگار بکەم. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: چۆن ئیمزا کردنێک ڕوو دەدات؟ لێرەدا هەست دەکەین کە مەسەلەکە ئاڵۆز و هەمیشە گۆڕاوە لە ئیمزا و زمانێکەوە بۆ ئیمزا و زمانێک. بەڵام ئەمە مەرجی سەرەکی بوو، کەپێویست بوو بۆ ڕێگە خۆش کردن بە شێوەییکی وورد. بۆ پەیوەندییە هەبووەکانی نێوان دەق و نووسەر، لە نێوان دەق و هەڵومەرجە

دەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی، ئەگەر ئەم هەڵومەرجانە سایکۆلۆژی بیۆگرافی خودی بێت. یا کۆمەلایەتی مێژوویی سایسی. ئەم قسەیە بە شێوەیەکی گشتی بەسەر هەموو دەق و نوسەرێکدا پراکتیزە دەبێت ، بەلام بەپێی شێوازەکانی دەقەکە و تایبەتمەندێتی. ئەو جیاکارییەی کە لێرەدا مەبەستە تەنها تایبەت نیە، بە جیاکردنەوەی تێکستی فەلسەفی و تێکستی ئەدەبی، بەڵکو جێکەوتە دەبێت لەناو خودی هەریەکە لەو شێوازانەداو تەنانەت لە نێوان هەموو دەقەکاندا لەسەر ئاستی زمان. ئەم تێکستانە دەتوانن یاسایی یان سیاسی یان زانستی بن. بە شێوەیەکی جۆراو جۆر و بەپێی جیاوازی ناوچەکان، هتد.. منیش کاتێک دەستم کرد بەو لێکۆلینەوە شیکارییە لە میانەی پراکتیکەوە، لەسەر تێکستەکانی (هێگل و نیتشە و جینیە و بلانشو و ئارتۆ و یۆنگ) هەندێک لە تەوەرەو سەدای گشتیم پێشکەش کرد. کە هەمووی دەگرێتەوە. لە کاتێکدا کە وورپای تایبەتمەندێتی و شێوازە زمانەوانییەکانی بووم. منیش لێرەدا هەندێ نمونە دەهێنمەوە. لەبەر ئەوەی کە کاری تایبەتی ئیمزاکاری، بە واتا سادە و باوۆاساییەکەی لە میانەی ناوی عەلەمەوە گوزەرە دەکات (واتە، لە میانەی ناوی ئەوفەیلەسوفانەی کە ناوم هێنان) بەلام لەبەر ئەوەی کە مەودای درێژ کردنەوە و تێروتەسەلی نیە، دەرحەق بە کارەکانم. هەر بۆیەبە خستنە رووی هەندێک لە خالی گشتی و بیرخستنەوەی هەندێک بە ئاگا هێنانەوە. قایل دەبم.

١- هەرچەندە ناوی ناوی عەلەمی رەسمی باو، دەکەوێتە ژێر تیشکی ئەو هەموو شیکارییانەوە، بەلام مەسەلەی ئیمزاکردن بەو واتایەی کە من مەبەستمە تەنها لە ئیمزا کردنی ناوی عەلەمی بەنگ نابێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەش لە تێکستەکانمدا ئاماژە لە دالەوە بۆ ناوی عەلەم سەرەتاییە، ئەگەر واش دیار بێت، کە لە پێشەوەدایە. گرنگییەکەی لە واقیعدا سنووردارە و منیش زۆر کات و بە پێی توانا بێوازی خۆم دەربارەی ئەو جۆرە گەمە سادانەو ئەو موجامەلانەی کە لێی ددکەونەو دەردەبڕم.

٢- (ناوی عەلەم) نابێت تەنها بە ناوی سەر پێناس بناسرێت. بەڵکو ئێمە مەبەستمان بە ناوی عەلەم، هەموو ئەو نیشانەو سیماو ناو لێنانەیە کە کەسێک دەتوانێت بە هۆیەوە پێناسی خۆی دیاری بکات وە خۆیو خەڵکی بەو ناوە بیناسن و بانگی بکەن. ئەمەش بەبێ ئەوەی کە تەواو هەلی بژاردبێت یان دیاری کردبێت. هەر بۆیە قەوارەی قورساییەکە دەبینین، گەر بەو شێوەیە بڕوانینە کارەکان. مەرج نیە هەموو ئەو شتانە پێکەوە کۆ ببنەوە، لە کاتێکدا تەنیا یەکێکیان دیارە و ئەوانەی دیکە بە پەنهانی دەمێننەوە. چ سەبارەت بە خەڵکی یان هەڵگری ناوەکە خۆشی، هتد.. هەر ئەمەشە دەرگای گەورە و مەزن بۆ شیکار کاری ددکاتەوە. ٣- بەلام لێرەدا گریمانەیێکی کراوە دەمێنێتەوە: ئەویش ئەوەیە کە ناوی عەلەم لە بینگەردییەکی کاملدا نامێنێتەوە و لە

كۆتاییشدا ئیمزا كردن دەبێتە ئەستەم. ئەمە لە كاتێكدا دەڵێم. گەر تا ئێستاش پێمان وابێت كە ناوی عەلەم دەبێت تەواو ناوی عەلەم بێت وە ئیمزا كردنیش تەواو سەربەخۆ بێت: واتا ئازاد و زاراوەیی بێت بە شێوەنیكی پەتی. بەلام ئەگەر هیچی زمانێكی بێگەرد لە راستیدا بوونی نەبوو، لەبەر چەند هۆكارێك كە هەوڵ دەدەم كە شیكار و راڤەی بۆ بكەم. ئەوا بە پێویست گەڕاندنەوەی خەملاندنی ناوی عەلەم و ئیمزا كاری و وازلێ نەهێنانیان بە تەواوی، بەبەرهەمدێت. دەتوانرێت لەو گەڕاندنەوەیەی خەملاندنە، یاسای نوێ پێك بێت و شێوازی خوێندنەوەی نوێ گەلالە بێت، بەتایبەت ئەوەی كە پەیوەستە بە پەیوەندییە هەبووەكانی نێوان فەیلەسوف و تێكستەكەیی و كۆمەڵگاكەی و دەزگاكانی فێركاری و بلاو كردنەوە باوەكان و تەقالید. بەلام من پێم وانیە كە ئەمە تیوریكی نوێی گشتی لەسەر ئیمزاكاری و ناوی عەلەم لەسەر شێوازی كلاسیكی تیوریيان فەلسەفی پێك بهێنێت: واتە لە دایك بوونی زمانێكی وەسفی و بابەتی كە هەموو زمانە زانراوەكان تێپەر بكات. هۆكەش ئەوەیە، كە بەپێی ئەو هۆكارانەی كە ژماردم، دەبێت گوتاری نوێ دەربارەی ئیمزا كاری و ناوی عەلەم. دەبێ تسەرلە نوێ ئیمزا بكرێتەوەو لە نێو خودی خۆیدا نیشانەیێك كە دەلالەت لە پرۆسێسی گریمانەیی دەكات، كە ناكرێت بە سانایی دەربازی بكەین لە هەموو شتە لەبەر چاو گیراوەكان. ئەمەش نابێتە هۆی رێژەیی و رێژەیی بوون، بەڵكو دەبێتە شكڵەبەندێیكی تر بۆ گوتاری تیوری.

٣- گۆڤاری ئۆترمان: بابەتەكانت لە ژێر ناونیشانی ( هەڵوەشاندنەوە ) بلاو كردەوە و بە شێوەیێكی ئاشكراش زاراوە بابەتیەكەی خۆت لە زاراوەی هایدگەر سەبارەت بە تێكشكان جیا كردەوە. هەر لە نووسراوەكانتا سەبارەت بە ( كشانەوە ) ( هەنگاو ) یان ( كارتی پۆستە ) لە ( پەراوێزەكانی فەلسەفە ) تا ( سكالا ). دەبینین كە هەڵوەشاندنەوە داوەكانی خۆی بە شێوەی تۆرێكی توند و تۆڵ دەچنێت، كە چەمك و مەجاز نیە، بەڵكو خاڵی زانراو و رووناكی ئامێزن، ئایا ئەمە ئەوە ددگەیەنێت كە چالاكی هەڵوەشاندنەوە هاوشێوەیە لەگەڵ كاری ئەندازیار و مەساح؟ بەواتاییكی تر: ئایا ئەو پەیوەندییە فەزا ئامێزە و بۆشایی ئاسایە، لەگەڵ كەلەپوور نابێتە بە هێز كردنی بیرۆكەی ( داخران ) ئەو كەلەپوورە یان كۆتاییەكەی، ئەمەش لژ بەبەرژەوەندی فرە جۆرێتی بنچەكان و هێڵە یەك بەدوای یەكەكاندایە؟

جاك دریدا: بەڵێ، پەیوەندی ( هەڵوەشاندنەو ) بە ( تێكشكان )ی هایدگەری. هەردەم لەلایەن پرسیارە لابەرەكانەوە. تەرح كراوە وزۆر جاریش لەلایەن رەخنەو رەخنە گرانەوە. وەك زۆر جار وا دەڵێن، رەخنەی لێگیراوە. باسم لەو پەیوەندییە كردووە لە دوا كتێبمدا سەبارەت بە (روح: هایدگەر و پرسیار ) ( بلاوكردنەوەكانی گالیلیە ١٩٨٦ ). بەلام ئەمە هەر لەگەڵ بلاوكردنەوەی یەكەم كتێبم دەربارەی ( گراماتۆلۆجیا )دوە سالی

۱۹٦۷ هەبووە و لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی هایدگەر لای من یەکێك لەو بیرۆکە وردو توند و تۆڵ و وورووژێنەر و پێویستەی ئیستامانە. ئەمەش لەو سۆنگەیەوە دەڵێم بۆ ئەوەی بێ‌مانای و لاوازی هەموو ئەو پۆلینکردنە ئاسانانەو هێرشە خێراو بریندارکەرانەی سەر بیرۆکەی هایدگەر وەدەربخەم، بەتایبەت کە لەم چەند مانگە کەمەی دواییدا لە فەرنسا دا دەستی‌پێکردووە. ئەمە دەڵێم، بەبێ‌ئەوەی تەنها لەبارەی رۆژنامەو رۆژنامەنووسانەوە بدوێم. ئەو ناحەقی و هێرشە بریندارکەرانە هێز و بیر تەواو دەخەنە ژێر هەرەشەی خۆیان هەروەك رێبازە تاریکستان خوازەکان، ئەم هەرەشەیەش رەوشتیە یندەی ئەودی کە سیاسیە. ئەمەش بەبێ‌ئەوەی شتێك لەبارەی فەلسەفەوە بڵێیین...

هەر بۆ ئەوەی ووشەکانی نێو پرسیارەکەت وەبیر بێنمەوە. دەڵێم: ئەگەر ئەو تۆڕەی کە تۆ لەبارەیەوە دەدوێیت نابێتە تەنها تۆڕێك لە چەمکەکان و یان تەنها تۆڕێك لە مەجازو خوازراوەکان. ئیتر من نازانم چۆن لە خاڵە زانراوەکانو رووناکی ئامێزەکاندا قەتیس دەبن. حەز دەکەم کە بزانم مەبەستت لەو دوو زاراوەیە چی‌یەو رستەی دووەمی پرسیارەکەشت ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە تۆ مەبەستت پەیوەندییە لەگەڵ لەگەڵ پانتایی یان فەزا و دەسپێك و هەڵاواردەیش لە فەزادا، دەبەیتەوە بۆ ئەزموونی (ئەندازیار) یان (مەساح). بەڵام تۆ چاك ئەوە دەزانیت کەئەندازیار مەبەستم جیهانی ئەندازیارییە مەبەستم مەساح نیە (سەبارەت بەمە بڕوانە کتێبی هوسیرل: (بنچەی زانستی ئەندازیاری) کە تۆەورگێڕاوە و پێشەکیەکی درێژت بۆ نوسیوەو ساڵی (۱۹٦۲) بەناوی چاپکراوەکانی زانکۆی فەرەنسی بە چاپ گەیاندراوە.

بەڵام من پێش ئەوە، دەمەوێت بگەرێمەوە بۆ ئەو فەلسەفەیەی کە تایبەتە بە چەمك و خواستن کە پێش ئەوە ئاماژەم بۆ کرد. دەمەوێت دوو روونکردنەوەی خێرا بدەم: یەکەم، من ئەو چەمکەم نەکردۆتە تەنها مەجاز و خواستنی رەوانبێژی، هەروەك چۆن هابرماز لەم دواییانەدا تاوانبارم دەکات. دووەمیش، زانستی لۆژیکم نەکردۆتە تەنها رەوانبێژییەك، هەر وەك چۆن پێی تاوانبار کرام. سەرباری ئەمەش فەلسەفەم نە کردۆتە ئەدەب، هەر وەك پێشتر باسمان کرد. ئەمە ئاشکرا و دیارە لە بابەتە جیاجیاکانی کتێب و نووسراودکانمدا بەتایبەتی لەلێتوێژینەوە ناسراوەکەمدا بە ناو نیشانی (ئەفسانەی سپی) کە لە کتێبی (پەراوێزەکانی فەلسەفەدا) بڵاو بۆتەوە (بلاوەکراوەکانی مینوی ۱۹۷۲). ئەم لێتوێژینەوەیە لۆژیکێکی جیاواز لە پەیوەندی نێوان چەمك و خواستن دەخاتە روو. لێرەدا لەبەر کەمی بوار هەرئەوەندە دەڵێم و خوێنەران بۆ خوێندنەوەی لێتوێژینەوەکە بانگهێشت دەکەم. هەرچەند گرنگی زۆر بدەم بە فەزاو پانتایی، بەڵام پێم وانیە (الافساح) تەنها فەزاو پانتایی بێت. (ئەم گوتەیەشم بەسەر توێژینەوەی هوسیرل پراکتیزە دەکرێت و هەروەها بەسەر لێتوژینەوەکانم

دەریای هونەری تەشکیلی و وێنە کە لەکتێبی: ڕاستی لە هونەری وێنەدا (بڵاوکراوەکانی فلاماریون، ١٩٧٨) جێبەجێ دەکرێت. ڕاستە ئەو گرنگیدانە ناوبراوە، ڕێگەبە گەڕاندنەوەی شکۆمەندی کایە و فەزای شوێن دەدات، کە لەلایەن هەندێک لە جۆرەکانی کەلتووری فەلسەفی پێشینیەوە پشت گوێ خرابوو، بەڵکو خرابووە پەراوێز و لە گرنگی پێدانی فەیلەسوفەکاندا سڕابووە. بەڵام سەرباری ئەوەش، نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە (الافساح والفسحه) بە واتای بە شت بوونی فەزای زەمەن دێت. (الفسحه) لەگەڵ جوداییدا تێکهەڵکێش دەبێت، لە دوو تویێ بزاڤی دواخستندا. بە واتاییکی تر (الفسحه) هەر زەمەنە. ئەمە لە لایەک و لەلایەکی تریشەوە (الفسحه) بە سیفەتی ئەوەی کە کونوچکەیەکە یان مەودائیکی جودایە، لێی لانابرێت، ئامادەیی تێک دەشکێنێت یان هەموو هاوشێوەییکی خودی ئامادەیی بۆ ئامادەیی، بە هەموو دەرئەنجام و ڕەنگدانەوەکانی کە دەیگرێتە خۆی. وەدەشتوانین لە هەموو کایەو مەیدانە زۆر جیاوازەکاندا بە دوایدا بچین.

ئێستا دان بەوە دادەنێم، کە چۆن ئەو بزاڤەیان ئەو کارەی کە من پێی هەڵسام، تەنها وەک کایەییک یان پانتاییکی فەزا ئاسا سەیر بکرێت وتێش ناگەم چۆن دەلالەت لە (داخران) و (کەلەپوور) و کۆتاییەکەی دەکات. بەپێچەوانەوە دەلالەت لە ئەستەمی هەموو جۆرە داخرانو کۆتاییەک دەکات. ئەوەی تایبەتیشە بە (فرە جۆری بنچەکان و هێڵە یەک لە دوای یەکەکان) کە لە پرسیارەکەتدا ئاماژەت بۆ کرد، پاشان پێویستی تێڕوانینێکی زیاتر جیاواز و جودا، بۆ مێژووی فەلسەفەو تێکستە فەلسەفیەکان. ئەمە هەردەم بابەتی گرنگم بووە و هیچ کاتێک پشت گوێم نەخستووە. بە زاراوەی (الانبثاث) گوزارشتم لێکردووەو زاراوەی (فرە جۆری بنچەکان و هێڵە فەلسەفییەیەک لەدوای یەکەکان) تەواو بەرامبەر لەگەڵ بابەتی (الانبثاث) کە لە (فاراماسی ئەفلاتون) و (لێدانی زەنگەکان) و (کارتی پۆست)دا، ئاماژەم بۆ کردووە.

ئەگەر لەسەرەوە و لە دوورترین خاڵەوە ڕوانیمانە شتەکان (من لێرەدا باگراوندی قووڵی پرسیارەکەت بە گرنگ وەردەگرم) دەبینین من هەردەم چەمکی (داخران) یان (بەرژین) (Laclôture) وە چەمکی کۆتایی (Fin)م، جیاکردۆتەوە. لەم باردیەشەوە ئاماژە بۆ کتێبی (گراماتۆلۆژیا) دەکەم. هەروەک چۆن هەردەم گوتوومە، کە کەلەپووری فەلسەفی هاوشێوەو هاجۆر نیە. لێرەوە گرنگیدانم بە تێکستە ناپیرۆزەکان دەستی پێکرد. ئەو تێکستانەی کە لە کەلەپووری فەلسەفی باڵا دەست وکتێبەکانی قوتابخانەو زانکۆ و ئەو وێنانەی کەلێی پێک هاتبوێن دوچاری جێگەلەقی بوو بوون. هەر دەم گوتومە، کە بیرۆکەی میتافیزیکا و تێڕوانینی هایدگەری بۆ بەزەمەن بوونی بوون، یان بۆ ئەو یەکێتیەی کۆکراوەی مێژووی بوون، پڕ ئیشکال و ناتەواوە. ئەمە لە

کاتێکدا دەڵێم، گەر لەسەرمان پێویستیش بێت، ئەو تەفسیرە (خودییە) بە گرنگ وەربگرین، لە هەموو ئاوات و خولیاو سنووردلری و تێکشکانەکانیدا. بۆیە (خودییە)م خستۆتە نێو دوو کەوانە، چونکە ئەو پێناسە و بە تایبەتیش پێناسی هاوشێوەیەتی خود لەگەڵ خودا و بیرکردنەوەی شەفاف و ئاشکرای گشتگیری، ئەوەیە کە دەبێت بیخەینە سەر مەحەکی پرسیار کردن و گومانەوە.

نەتەوەیی فەلسەفی

٤- گۆڤاری ئۆترمان: دوا لێکۆڵینەوەکانت گرنگ دەدەن بە (نەتەوەیی فەلسەفی) یان (پێناسنامەی نەتەوەیی فەلسەفی) بە چیدا پێت وایە زمان ڕەگەزێکی پێکهێنەری پێناسنامەیێکی تایبەتە؟ بەواتایێکی دی: ئایا فەلسەفەی فەڕەنسی هەیە؟

جاک دریدا: وەڵامدانەوەی پرسیارەکەت پەیوەستە بەوەی، کە مەبەستت لە زمان. هەروەها ووشەی (پێناسەنامە) و (پێکهاتن) چییە. ئەگەر مەبەستت لە پێناسنامە، هەروەک ئەوەی لە پرسیارەکەتدا لێت تێگەیشتم پێناسنامەی کەلەپوورێکی فەلسەفی بێت. ئەوە دەڵێم کە زمان ڕۆڵێکی گرنگی تێدا دەگێڕێت. فەلسەفە ماتەریاڵ و ڕەگەزەکانی لە زمانی سروشتی (زمانی ئاسراوی مرۆڤایەتی) دەبینێتەوە. فەلسەفە نەیتوانی لە دوو توێی زمانێکی بیرکارییانەوزانستیانەدا، خۆی دابڕێژێت. گەرچی لە مێژووی خۆشیدا، هەندێ هەوڵی کاریگەر دراوە. گەرچی تا ڕادەیێک ئەو زمانە بیرکارییە، زانستیە بۆ زمانی فەلسەفی تا ئێستا کاری پێدەکرێت، بەپێی جفرەی دەستکردی دروستکراو بە درێژایی مێژوویێک. هەر ئەمەش زمانی فەلسەفی دەکاتە زمانێکی ناوەندی تایبەتمەند، لە نێو زمانی دایکدا: وە دەتوانین وەرگێڕانی بەرامبەر لە نێو ئەم زمانە فەلسەفییەدا ببینینەوە. کاتێک کە لەزمانی سروشتیەوە دەچینە سەر زمانێکی دی. ئەمەش بەو واتایە دێت کە فەیلەسوفە ئەڵمانی و فەڕەنسیەکان دەتوانن لەنێو خۆیاندا گفتوگۆ بکەن و یەکتر بانگهێشت بکەن بۆ یاسا و ڕێسا و زاراوەو زمانە فەلسەفیە کۆن و سەقامگیرەکان. ئەمەش بۆ گوزارشت لە بەکارهێنانی هەندێک ووشەی بارگاوی فەلسەفی توندوتۆڵ. بەڵام دەزانیت قەبارەی ئەو گفتوگۆ و وتووێژانە چەندە کە ئەم مەسەلانە دەیجوڵێنن و ناشتوانرێت لە گفتوگۆی فەلسەفی جیا بکرێتەوە.

بەڵام لەلایێکی تریشەوە دەبینین، کە لەکاتێکا نەتوانین لە دەرەوەی هەموو زمانێکی تایبەتمەند یان سروشتی بیربکەینەوە، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین کە پێناسنامە و بە تایبەتیش پێناسنامەی نەتەوەیی لە فەلسەفەدا لە دەرەوەی ڕەگەزی زمان دروست نابێت. ئەمە دەڵێم، لە کاتێکدا کەئەوە دەزانم (ئەستەمی بیرکردنەوە لە دەرەوەی زمان) دەبێت زیاتر وەک مەسەلەو ئیشکالیەتێک ڕوون بکرێتەوە، بەڵام کاتی پێویستم نیە بۆ ئەو ڕوونکردنەوەیە. بەڵام سەربارى ئەوەش، پێم وانیە کە بتوانین لە نێوان

کەلەپووری فەلسەفی نەتەوەیی و زمانێک، بەواتای باو، تەبایی و چەسپ بوون بەئەنجام بگەیەنین. کەلەپووری فەلسەفی (قاریە) یان ئەنگلۆ ساکسۆنی، یان فەلسەفەی شیکارکاری گەر بتەوێت ناو لێنانی باو بەکار بهێنیت، دەڵێم ئەم کەلەپوورانە، دەچنە نێو خودی هەموو نەتەوە ئەوروپییەکانەوە وەک: ئینگلیزی، ئەڵمانی، ئاتالی، ئیسپانی و هتد.. تەنها تایبەتیش نیە بە جیهانی ئەنگلۆ ساکسۆنی. زمانی فەلسەفەی شیکارکاری، یان هەر زمانێکی فەلسەفی دی، وەک زمانی ئوستین ( Austin ) (ئینگلیزی-ئەمەریکی)، یان زمانی فتگنشتاین، (نەمساویی-ئەمەریکی-ئینگلیزی) تێکەڵ بە زمانە نەتەوەییەکەیە. ئەو زمانە نەتەوەییە (ئینگلیزی) لەلایەن زۆر هاولاتی جێگەو شوێنە جیاجیاکان. قسەی پێدەکرێت، وەک (بە ئینگلیزی قسەکردنی ئەمەریکییەکان و فەرەنسی نا فەرەنسییەکان) ئەمە تەفسیری ئەوەمان بۆ دەکات. کە چۆن لە دەرەوەی زمانی بنچینەییەوە (زمانی دەقی بنچینەیی) کەلەپوورێک لە خوێندنەوە دروست دەبێت. لەلایەن ئەوانەی کە بەزمانی بنچینەیی دەدوێن، قورس و گران دەبێت. ئەم گوتەیە، بە شێوەیێکی زۆر جیاواز بەسەر (فتگنشتاین) و (هایدگەر) دەسەپێت. ئەو پێشوازیەو خوێندنەوانەی کە فەرەنسیەکان هەیانە بۆ (هایدگەر) لە ئەڵمانیادا تووشی بەرپەرچ دانەوەیێکی زۆر دەبێت (هۆکانیشی هەموو کاتێک سیاسی نین). پسپۆرە فەرنسیە تایبەتەکان بە (فتگنشتاین) لێتوێژینەوەی زۆری دەرحەق دەکەن، بەلام نە ئەوانەی بە ئەڵمانی دەدوێن و نە ئەوانەی بە فەرنسی دەدوێن، گرنگیەکی زۆری پێ نادەن. ئەمەو بەبێ ئەوەی کە بتوانین بڵێین بەرپەرچی دەدەنەوە...

ئێستا لێم دەپرسی: ئایا فەلسەفەیێکی فەرەنسی هەیە؟ وەلامت دەدەمەوە و دەڵێم، نەخێر ئەمڕۆ و جیاواز لە هەموو کاتێکی تر. فەلسەفەیێکی فەرەنسی نیە، بەتایبەت گەر جیاوازی ڕێبازەکانو کێشمەکێشەکانیان لەبەرچاو بگرین. لە بلاو کراوەو وانە فێرکاری و شێوازە ئیستدلالیە لۆژیکییەکان و پەیوەندییە هەبووەکانیان بە دەزگا و پانتاییە کۆمەلایەتی-سیاسییەکاندا ولەگەڵ دەسەلاتی ڕاگەیاندن، تەبایی و لێکچوونێک بەدی ددکەین، تا ئەو ڕادەییەی کە سەختەبەلامانەوە تۆپۆلۆژیای تەواوی گوتارە فەلسەفیە فەرەنسیەکان (بە واتای دیاریکرنی جۆر و شێوازەکانی) دیاری بکەین. هەر هەولدانێکیش بۆ فۆرمۆلەکردنی تۆپۆلۆژیا و نەخشەی فەلسەفی فەرەنسی، بەواتای هەڵوێست وەرگرتن دێت لە نێوەندی ئەو کێشمەکێشەی کە لە ئێستادا بەشێوەیێکی حەتمی هەیەو یەکسەر ڕووبەرووی هێرشێکی ڕاگەیاندنانە لە هەموو لاکانەوە بۆتەوە. گەرچی لە زەینمدا پلانێک سەبارەت بەو بابەتە هەیە، بەلام سەرکێشی لە ئاشکراکردنی لێرەدا ناکەم و سەرباری هەموو ئەو گفتوگۆو کێشمەکێشانەی سەبارەت بە (شوێن و جێگا) و (مومارەسەکردن و ڕێبازە) فەلسەفییەکان. کێ دەتوانێت ئینکاری بوونی

ستاقێکی دیاریکراوی فەلسەفەی فەرەنسی بکات؟ کێ دەتوانێت ئەو ستافە، بە ستاقێکی کەلەپووری تەواو وکامڵ دانەنێت، بەواتای هێڵێکی تایبەتی لە گواستنەوەو کەلەپوور و یاددەوەری. سەرباری دەسەڵاتداریتی یەک لەدوای یەکی ڕێباز و ڕێچکە دەسەڵاتدار و گۆڕاوەکان بە بەردەوامی؟ بۆ ئەوەی بە شێوەیێکی پوخت و دروستیش شیکاری بکەین. ئەوە پێویستمان بە لێکۆڵینەوەی ژمارێیکی زۆر لەدەسکەوتە کاریگەر و توندو تۆڵ و حەتمییەکان هەیە: وەک دەسکەوتە مێژوویی و زمانەوانی و کۆمەڵایەتییەکان. لە میانەی دەزگا زۆر تایبەتەکان. مەبەستم لە دەزگاکان تەنها پەیمانگەی فێرکاری ناوەندی و زانکۆ و پەیمانگای لێکۆڵینەوەی زانستی نیە، بەڵکو هەموو دەزگاکانی دیکەش. ئەم مەسەلانە زۆر گران و وورووژێنەرن، ناتوانم خۆم بخەمە مەترسییەوە و لە ئێستادا بیهێنمە ناوەوە. شیکارکردنی ئەوەی کە پێی دەگوترێت فەلسەفە، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی هەموو ئەو دەستکەوتە کاریگەر و چالاکانە هەیە، کە پێشتر باسمان کرد.

دەمەوێت لەکۆتایشدا، ئەوەت پێ بڵێم: پێناسنامەی فەلسەفەی فەرەنسی تا ئێستا تووشی تەنگژەی ئاوا سەخت و دژوار نەبووە. نیشانەکانی دەمارگیری بە ئاکاری دەسەلاتی دەزگا ڕەسمیەکان و زانکۆکانەوە دیارە و تەبایە لەگەڵ شێولزی دوژمنانەی دەزگای ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنەکان. بۆ ئەوەی نمونەیەکیشت لەخەرواری نمونە بۆ بهێنمەوە، باسی ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی نەتەوەیی زانکۆکانت بۆ دەکەم، کە دژ بە هەردوو فەیلەسوف (فیلیپ لاکو) و (جان لۆک نانسی) دەریکرد. ئاشکرایە کەئیش و کاری ئەو فەیلەسوفانە دەمێک ساڵە جێگەو شوێنی پڕ ڕێزی خۆی هەبوود لە نێو فەرەنسا و دەرەوەیدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجومەنی ناوبراو، ڕێگەی پێ نەدان کە ببنە ئەندامی ستافی وانە ووتنەوە لەزانکۆ. ئەمە سیمای ئەو جەنگەیە کەئاکارێکی بێ ماناو نارەسەنی هەیە. ئەمەش تەنها ئەوە ئیفلیج دەکات و دەیکوژێت کە پێشتر ئیفلیج و مردوو بووە. لە میانەی ئەو جەنگەی کە هەندێک ناوەندەکان هەڵگیرساندووە دەبینین، ئەگبەتی وکلۆلییەکە گەوردیە. هەر ئەمەی کە باسیشم کرد، تایبەتمەندێتی دەبەخشێتە فەلسەفەی فەرەنسی. ئەم فەلسەفەیە سەر بە زمانێکی گوزارشت ئامێزانەیە کە بە ئاسانی لە دەرەوەی فەرەنسادا و باشتر لەناوەوە دەیبینێت. ئەم زمانە. گەر هەشبێت سافو بێگەرد نیە، بەمەبەست هەڵبژێردراو دەرکەوتە نیە. زامانی گوزارشت ئامێزانە، هەمیشە و تەنها لەلایەن بەرامبەرەوە، شتێکە دەبێت پێش وەخت وەدەربنرێت. بەواتای جارێکی تر دەستی بەسەردا بگیرێتەوە.

سەرچاوە:

العرب و الفكر العالمي، العدد السادس، ربيع (١٩٨٩)، مركز الانماء القومي، ص ١٤٧-١٥٥.

(مقابلة مع جاك دريدا) ترجمت الى العربية من قبل: د. هاشم صالح.

# حیکمەکانی زەرادەشت

*فریدریک نیتشە*

*و: شوان*

ڕێگایەک بۆ هەمووان نیە، هەر کەسەو بە ڕێگای خۆی

× × × ×

خوا مرد، هیچ شتێکیش خوای نەکوشت میهرو سۆز و بەزەیی خۆی نەبێت.

× × × ×

لەوەوبەر ئێوە لە دەولالەی مەیمون بوون، کەچی مرۆڤایەتی تا هەنووکەش بستێک لە مەیمونی تێنەپەڕاندووە.

× × × ×

لە خۆشەویستی دا شتێک لە شێتی هەیە، بەڵام لە شێتی دا شتێک لە دانایی هەیە.

× × ×

ئەی تەنهایی، تۆ نیشتمانی منی...
بۆتەنهایت بچۆرەودبراکەم.. هەنگا هەڵنێ تۆ بێ هاوڕێیت، جگە لە خۆشەویستی و داهێنانی خۆت نەبێت، هاوڕێت نی یە.

× × ×

زەرادەشت خەڵکی فێری ئەوە دەکات لە ئان و ساتی خۆیاندا بمرن ـ بەڵام ئەوەی نەیزانیبێ چۆن بژی، ناشزانێت کەی و چۆن بمرێت.

× ×

با مرۆڤ خودی خۆی خۆش بوێت ـ من ئەمەتان فێردەکەم.

× × ×

لە کۆڕەپانە گشتی یەکان دا، هیچ کەس بڕوا بەکەڵە ـ مرۆڤ ناهێنێت.

× × ×

من نامەوێت ڕووناکی بم بۆ نەوەکانی ئەم ڕۆژگارە، چونکە من دەخـوازم تووشی نابینایان کەم، با هەر بروسکەی حیکمەتم دابەزێتە سەر چاوانیان.

× × ×

هەنگاوی مەڕی گێژ توانای شوێن پێهەلگرتنی ڕاستیەکانی نیە.

× × ×

ئەوەی درۆ نەزانێت لە ماهیەتی ڕاستی ناکات.

× × ×

من ژیی نیوەشەوم، من ئەو زەنگەم کەس لێم ناگات، بۆیە پێویستە لەبەردەم کەڕەکان دا بدوێم.

× × ×

گەر ویستتان بگەنە لوتکە بەرزەکان ئەوا بەپێی هەنگاوی خۆتان بچن، نەک لەسەر شان و پشتی کەسانی دی.

× × ×

ئێمە بۆچی دەژین لەکاتێکدا هەموو شتەکان درۆن؟

× × ×

دوژمنایەتی ژیانی نەکرزشتوم بەلکو ڕق و بێزاری.

× × ×

هەرچی پاک و بێگەردە خۆشم دەوێ.

× × ×

من بە ڕۆناکی خۆم دەژیم و لە کلپەی داگیرساوی ناخی خۆم دەخۆمەوە.

× × ×

خۆشبەختی پیاو پابەندی ئیرادەو ویستی خۆیەتی، بەلام کامەرانی ئافرەت لەسەر ئیرادەی پیاو ڕاوەستاوە.

× × ×

ڕەنگە ئافرەت هەست بە هێز و توانای پیاو بکات، بەلام هەرگیز تێی ناگات.

× × ×

پێویستە مرۆڤ دوژمنکاری لە ناخی هاوڕێکەیدا خۆش بوێت.

× × ×

واز لە هاوڕێیەتی بێنە گەر کۆیلە بوویت.

× × ×

من پێتان دەلێم.. لە خۆشویستنی کەسانی نزیک هەلبێن تا بتوانن ئەوانەتان خۆش بوێت کە دوورن.. ئێوە ترس بالی بەسەردا کێشاون، بۆیە نزیکەکانتان خۆش دەوێت.

× × ×

چاکێ بوون بۆ هیچ ئومەتێک نیە، کەسەر چاوەی منداڵەکانی خۆی لێڵ کردبێت.

× × ×

ئەو خواوەندەی دەشێت بڕوای پێ بێنم، ئەو خواوەندەیە کە دەتوانێت سەمابکا.

× × ×

گەر ویستت بنووسیت، بە خوێنت بنووسە.

1990-7-18

سلێمانی

## سوپاس و پێزانینمان بۆ ئەم بەڕێزانە...

- بەڕێز (مەلا بەختیار) کە بڕی (٣٠٠٠) دینار هاوکاری کردوویین.
- بەڕێز (وەزارەتی رۆشنبیری) کە بۆ هەردوو ژمارەکە (٢٥٠٠) دینار هاوکاریان کردوویین.
- بۆ ئەو بەڕێزانەی کە کەم و زۆر هاوکاریان کردوویین و لەسەر داوای خۆیان ناویان نابەین.
- بۆ بەڕێز ( فەرەیدون حەسەن ) کە (٥٠٠) دینار هاوکاری کردین.
- بۆ مەڵبەندی لاوانی میدیاو رێکخراوی TDC فەرنسی کە بە بڕی (٢٩٧٥) دینار بۆ بەرگ و وەرەقە هاوکاریان کردین.
- TDC - Media Community Resources Center Provided This Review With All Paper And Covers For Some Sum Of (2975)I.D. We Ow Them Grate Thanks.
- بۆ چاپخانەو ئۆفسێتی سەفوەت.
- بۆ کارمەندانی مەڵبەندی کۆمپیوتەری تیشک.
- پیتچنین مەڵبەندی کۆمپیوتەری تیشک(جبار).